نهاد جلال حبیب الله

# وەڵامێک

# بۆ گومانی سەرهاوەلان





# وەڵامێك بۆ گومانی سەر هاوەڵان

## نووسینی: نهاد جلال حبیب الله



چاپی یەکەم ١٤٣٩ك - ٢٠١٨ز



**نوسینگەی تەفسیر**

بۆچاپ و بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێرست - نوسینگەی تەفسیر

وەڵامێك بۆ گومانی سەر هاوەڵان، نهاد جلال حبیب الله (نووسەر)

٣٣٢ لاپەڕە،

١٧* ٢٤ سم

بابەت، مێژوویی

ISBN: 978-9933-593-11-7

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٤٢) ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین: زەردەشت کاوانی

خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

# وەڵامێك

# بۆ گومانی سەر هاوەڵان

نووسینی

نهاد جلال حبيب الله

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، صەلات و سەلامی خوا، لە پێغەمبەری خوا و ئالوبەیت و هاوەڵانی، هەتا ڕۆژی دوایی.

مەسەلەی گومان وروژاندن سەبارەت بە هاوەڵان، شتێکی نوێ نییە، وەڵامدانەوەی گومانەکانیش، بابەتێك نییە ئەمڕۆ دەستی پێکرابێت، بەڵام کاتێك دەبینین تاو نا تاوێ، تۆمەتگەلێ گەرم دەکرێنەوەو دەهێنرێنەوە مەیدان، پێویست دەکات ئێمەش، وەڵامەکانی دوێنێ و زێدەکاریەکانی ئەمڕۆ بخەینە بەردەست.

مەرجیش نییە هەرچیەك بە دیمەنێکی سلبی هاتە بەرچاو، خێرا ناوی تۆمەتی لێ بنێین، دەکرێت لە بنەڕەتدا وابێت و حاشای لێ نەکرێت، چونکە وەك دواتر باسی دەکەین، هاوەڵان مرۆڤ بوون و قابیلی هەڵە و کەموکورتین، وەك چۆن مەرج نییە، هەرچیەك ئەمڕۆ بە سلبیات و کەموکورتی تەماشا دەکرێت، لە بنەڕەتدا وا بێت، دەکرێت ڕۆژگارێك بێت، ئەوەی ئەمڕۆ بە نەقص تەماشا دەکرێت، ئەوکات نیشانەی بەهێزیی و دروستی بێت.

ئەوەی لێرەدا خستومانەتەڕوو، هەوڵێکی سەرەتایی و سنووردارە، بۆ شرۆڤەی چەند بابەتێکی هەستیار سەبارەت بە ژیانی هاوەڵان، هاوکات ناکرێت ئەم نووسینە سەرەتاییە، وەك پڕۆژەی وەڵامی گومانەکان لەسەر هاوەڵان تەماشا بکرێت، بەڵکو ئەمە تەنها وەرگرتنی چەند نموونەیەکە، لە گومانی سەر هاوەڵان و دەیان و سەدان گومانی تر هەن، پێویستیان بە شرۆڤەیە و لێرەدا باسمان نەکردون.

خاڵێکی تریش پێویستە ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە، کە هەر گومانێك بەپێی گومانسازان قسەی لەسەر دەکرێت و، ناکرێت وەڵامێکی گشتگیر بخرێتەڕوو، بۆ نموونە: کەسێکی مولحید جیاواز لە شیعە، یان خەواریجیەك ڕەخنە دەگرێت، کەسانێ باوەڕیان بە فەرموودە نییە، بە جۆرێکی دی ڕەخنە لە ژیانی هاوەڵان دەگرن، کەسانێ، کە بڕوایان بە فەرموودە هەیە بە چەشنێکی دی، هەریەك لەمانەش دەبێت بە زمانی خۆیان وەڵامیان بدرێتەوە.

ئەسڵەن بابەتێ، کە لای کەسێکی مولحید گومانە لەسەر هاوەڵێك، لای کەسێکی موسڵمان بە گومان قبووڵ ناکرێت، هەمان ئەو کەسە موسڵمانە، دەکرێت گومانێکی هەبێت سەبارەت بە هاوەڵێك، کە لای کەسە مولحیدەکە، هیچ بەهایەکی نەبێت، بۆیە ناکرێت هەموو ئەمانە بە یەك زمان وەڵام بدرێنەوە، ئەمەش لێرەدا باسمان کردووە،کە وەڵامێك نییە بۆ کەسانێك بڕوایان بە ئیسلام نییە، بەڵکو بۆ کەسانێکە، کە خۆیان بەموسڵمان دەزانن و ڕەخنە و گومانیان هەیە لەسەر ژیانی هاوەڵان، یان لەسەر خودی هاوەڵان.

بەو هیوایەی خوای گەورە، ئەم هەوڵە سەرەتاییەی لێ وەرگرتبین و ئەوەی ڕاستە بیهێڵێتەوەو، هەرچیەکیشی هەڵەیە، ئاسەواریشی لەم نووسینەدا بسڕێتەوە، هەتا نەبێتە کۆڵ و بارێ بەسەر شانی نووسەریەوە.

إن أريد إلا الإصلاح ما استطعت وما توفيقي إلا بالله عليه توكلت و إليه أنيب

نهاد جلال حبيب الله

سلێمـــانی

## چەمکی هاوەڵ (صەحابة)

سەبارەت بە پێناسەی چەمکی هاوەڵ (صەحابە)، ئەوا لە ڕووی زمانەوانیی و لەڕووی ئیصطلاحیشەوە، واتاکەی دەخەینەڕوو:

**لە ڕووی زمانەوانییەوە:** واتای هاودەمیی و پارێزگاریکردنە.

**لە (لسان العرب)دا هاتووە:** (صحب صحبه يصحبه صحبة بالضم و صحابة بالفتح و صاحبه عاشره و الصحب جمع الصاحب... و الأصحاب جماعة الصحب)[1].

**صەحابە، بە واتای:** هاودەمیی و لەگەڵبوون دێ، هەروەها بە واتای: پاراستن دێ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (ولا هم منا يصحبون)، یان لە فەرموودەدا هاتووە: ( اللهم اصحبنا بصحبة)[2].

**لە (المعجم الوسيط)دا** وشەی (صحب) بۆ دوو واتای هاودەمیی و پاراستنیش دێت: ((صحبه صحابة و صحبة رافقه و يقال في الدعاء صحبك الله حفظك و رافقتك عنايته))[3].

سەبارەت بەواتا شەرعیەکەی چەمکی هاوەڵ، چەند پێناسە و ڕایەکی جیاجیا هەن، لەسەر مەرجەکانی هاوەڵبوون، بەڵام ئەوەی لە کۆی پێناسەکانەوە وەریدەگرین ئەوەیە:

---

(١) ابن منظور: لسان العرب، ط١، دار صادر، بيروت، ج١، ص٥١٩-٥٢٠.

(٢) لسان العرب، ج١، ص٥٢٠.

(٣) إبراهيم مصطفى: المعجم الوسيط و أحمد الزيات و آخرون، دار الدعوة، ج١، ص ٥٠٧.

**هاوەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بریتییە لە: ( هەر کەسێکی موسڵمان، که بەموسڵمانیی لەواقیعدا بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیشتبێت و لەسەر باوەڕداریی مردبێت ).**

**بەم پێیە ئەم مەرجانە لەخۆدەگرێت:**

**١- موسڵمانیی:** واتە: مەرجە ئەو کەسە، لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم ) موسڵمان بووبێت و بە موسڵمانیش چووبێتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). بۆیە ئەگەر کەسێك بە بێباوەڕیی، سەد جاریش چووبێتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام تا دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسڵمان نەبووبێت و دواتر باوەڕی هێنابێت، ئەوە بە هاوەڵ دانانرێ.

**٢- گەیشتن بە خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):** مەرجە ئەو کەسە بەموسڵمانی چووبێتە خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەرنا نەجاشی، کە باوەڕداریش بوو و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) نوێژی غیابی لەسەر کرد،بەڵام لەبەرئەوەی نەچوەتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بۆیە بە هاوەڵ دانانرێ.

هەندێ مەرجەکەیان وا هێناوە، کە بینینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێت، بەڵام وا جوانترە بڵێین: گەیشتن بە خزمەتی، چونکە هەبووە نابینا بووەو نەیتوانیوە پغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ببینێت و چووەتە خزمەتیشی.

واتە: بینینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، یان چوونەخزمەتی، بەبێ بینین بۆ ئەوانەی بەربەستی بینینیان هەبووە، وەك نابیناکان، نموونەی ئەوانەش: (ئیبن ئوم مەکتوم)ە، هەروەها ئەو چوونە خزمەتە، ماوەی زۆر بێت، یان کەم بێت، نابێتە بەربەستی بەردەم هاوەڵبوون، ئیتر ئەبوبەکری صدیق، کە تا مردن ڕۆژانە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) دیوەو، نزیکترین هاودەمی بووە لەگەڵ کەسێکدا، کە بە وەفد هاتووەو لەوانەیە ساتێکی زۆر کەم چووبێتە

خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەردووکیان مەرجی هاوەڵبوونیان هەیە، با لە پلەو پایەدا جیاواز بن.

٣- مەبەست لە بە حەقیقی بوون ئەوەیە، کە ئەو کەسە بە حەقیقی و بێ خەیاڵ و خەو چوویێتە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، جا ئەگەر کەسێك لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، یان لە دواتردا، تا ئەمڕۆ و، تا ڕۆژی دواییش خەوی دی،کە چووە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەوە نابێت بە هاوەڵی.

**٤- مردن بە موسڵمانیی:** ئەمەش مەرجێکی تری گرنگە، چونکە ئەگەر کەسێك بە باوەڕداریش چوویێتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام دواتر مورتەد بوویێتەوە ئەوە بە هاوەڵ دانانرێت، وەك: (عبیداللەی کوڕی جەحش)ی مێردی ئوم حەبیبە، کە موسڵمان بووو، پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بینیو،لەگەڵ ئوم حەبیبەی ژنیدا کۆچی کرد بۆ حەبەشە، کەچی لەوێ بوو بە مەسیحیو، لەسەر ئەو ئایینەش مرد.

ئیتر ئەمە مەرجی هاوەڵبوونی ناهێڵێ، ئەگەر دوای مورتەدبوونەوەکەشی، هەمدی باوەڕی هێنابێتەوەو،ئەو دووەم جار باوەڕهێنانەوەی، لەسەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و، لە خزمەتی ئەودا بوویێت، ئەوە سیفەتی هاوەڵبوونی دەمێنێتەوە.

هەندێ پێیان وایە: ئەگەر دوای مورتەدبوونەوەکەشی، دوای سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەمدی باوەڕی هێنابێتەوە، ئەوە سیفەتی هاوەڵبوونی دەمێنێتەوە، بەڵام هەندێکی تر پێیان وایە: بەو یەکجار مورتەدبوونەوەی، مەرجی هاوەڵێتی نامێنێ، بەڵام هەموان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە هەر کەسێ بە موسڵمانیی گەیشتبێت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و، دواتر بە بێباوەڕی مردبێت، ئەوە هاوەڵ نییە.

بوخاری لە صەحیحەکەیدا دەڵێت: (هەر موسڵمانێ هاودەمی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) کردبێت، یان بینیبێتی، ئەوە هاوەڵیەتی)[1].

( ئیبن حەجەر ) دەڵێت: (ڕاسترین پێناسێ بۆ هاوەڵان بیزانم ئەوەیە: هاوەڵ هەر کەسێکە بەباوەڕداریی بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیشتبێت و، لەسەر ئیسلام (بە موسڵمانێتی ) مردبێت، ئیتر هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، کە زۆر لەگەڵیدا دانیشتبێت، یان کەم لەگەڵی بووبێت، یان ئەوەی فەرموودەی لێوە گێڕابێتەوە، یان فەرموودەی لێوە نەگێڕابێتەوە، یان غەزای لەگەڵ کردبێت، یان غەزای لەگەڵ نەکردبێت، یان هەر بینیبێتی، با لەگەڵیشی دانەنیشتبێت، یان لەبەر بەربەستێ نەیدیبێ، وەك : نابینایی.[2]

ئیبنوصەلاح، چەند پێناسەیەکی هێناوە، لەوانە:

مروزی دەڵێت: فەرموودەناسان دەڵێن: هەرکەس فەرموودەیەکی، یان وتەیەکی لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) لێوەگێردرابێتەوە، ئەوە هاوەڵە.

هێندە مەجالەکە فراوان دەکەن، تا ئەوەی دەڵێن : هەرکەس پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دیبێ، ئەوە لە هاوەڵانە، ئەوەش لەبەر گەورەیی پلەوپایەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، واتای هاوەڵێتییان داوە بەهەر کەس، کە پێغەمبەری دیبێت.

وشەی (صەحابی) لەڕووی زمانەوانی و ڕواڵەتییەوە، بۆ کەسێکە، کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووبێتو، زۆر لە کۆڕیدا بووبێت و شوێنکەوتەی بووبێت و فەرموودەی لێ وەرگرتبێت، ئەمەش بڕوا و قەناعەتی ئوصوڵییەکانە.

---

(١) صحیح البخاري، ط ٣، دار ابن كثير(اليمامة – بيروت، ١٩٨٧)، ج٣، ص١٣٣٥.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ط١، دارالجيل(بيروت – ١٩٩٢)، ج١، ص٦.

سەعیدی کوڕی موسەیب، تەنها کەسێکی بە هاوەڵ داناوە، کە ساڵێ، یان دوو ساڵ لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مابێتەوەو، غەزایەك، یان دوو غەزای لەگەڵدا کردبێت.[١]

**سەبارەت بەوەی، ئایا جنۆکە و فریشتەکانیش دەبن بە هاوەڵ، یان نا؟**

**(ئیبن حەجەر ) دەڵێت:** (کە دەڵێین: باوەڕی پێ هێنابێ - بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)- هەموو ڕاسپێراوێك لە جنۆکەو مرۆڤیش دەگرێتەوە، ئەوکات ئەو جنۆکانەش دەگرێتەوە، کە ناو و باسیان تۆمارکراوە، بەڵام ئەو مەرجانەی هاوەڵبوونیان تێدابێ، کە باسمان کردون)[٢].

واتە: ((ئیبن حەجەر)) پێی وایە: هەر جنۆکەیەکیش ئەو مەرجانەی هاوەڵبوونی تێدا بێت، ئەوە دەبێتە هاوەڵ، بۆیە دەبینین: لە ناو هاوەڵاندا ناوی جنۆکەشی هێناوە: (ئەبیەچی جننی)[٣].

**( ئیبن حەزم )یش ئەو ڕایەی هەیە و دەڵێت:** (وقد نَصَّ اللَّهُ تَعَالَى على أَنَّ نَفَرًا من الْجِنِّ آمَنُوا وَسَمِعُوا الْقُرْآنَ من رسول اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَهُمْ صَحَابَةٌ وَفُضَلَاءُ)[٤].

واتە: (خوای گەورە - لە قورئاندا - بە دەق هێناویەتی، دەستەیەك لە جنۆکەکان بڕوایان هێناوەو لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) گوێیان لە قورئان گرتووە، ئیتر ئەوانە - ئەو جنۆکانە- هاوەڵن و پایەبەرزن ).

---

(١) مقدمة ابن الصلاح، دار الفكر المعاصر ( بيروت – ١٩٧٧)، ج١، ص٢٩١.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٤.

(٤) المحلى، دار الآفاق الجديدة، بيروت، ج٩، ص٣٦٥.

بەڵام (ئیبن ئەثیر) وەك ئەوان، بە ڕاشکاوانە دان نانێت بەوەداو، لە چەند شوێنێکدا، کە ناوی چەند جنۆکەیەکی هاوەڵ دێنێ وادەیهێنێت، کە لەبەرئەوەی ئەبوموسا هێناویەتی ئەمیش باسی کردووە.[١]

سەبارەت بە هاوەڵبوونی فریشتەکانیش قسە لەسەر ئەوەیە: ئایا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نێردراوە بۆ ئەوانیش، یان نا؟

واتە: ئایا پێغەمبەری خوایە بۆ فریشتەکانیش، یان نا؟[٢]

ڕای ڕاستتر ئەوەیە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نێردراوە بۆ مرۆڤ و جنۆکەکانیش، بەڵام نەنێردراوە بۆ فریشتەکان.

---

(١) أسدالغابة، ط١، دار إحياء التراث العربي(بيروت - ١٩٩٦)، ج٢، ص٣١٧ و ٥٢٧ و ج٤، ص٢١٨.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦-٧.

## مــاوەی هاوەڵان

زانایان لەسەر ئەوە کۆکن، کە هەرکەس دوای سەدساڵ لە وەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بانگەشەی هاوەڵبوونی کردبێت بڕوای پێ نەکەن[١].

ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە مانگێ بەر لە مردنی فەرمووی: (أرأيتكم ليلتكم هذه فإن على رأس مائة سنة منها لا يبقى على وجه الأرض ممن هو اليوم عليها أحد)[٢].

واتە: ( ئەمشەوتان ئەبینن، لەمشەوەوە، تا سەد ساڵی تر لەم سەر زەویەدا، یەك کەس نامێنێ، کە ئەمڕۆ لەسەریەتی ).

(ئیمامی ذەهەبی) دەڵێت: (کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە کۆچی دوایی کرد، ئەنەسی کوڕی مالیك بوو[٣].

سەبارەت بە کاتی وەفاتی ئەنەسی کوڕی مالیك، چەند ڕایەك هەیە: ڕایەك دەڵێت: لە ساڵی نەوەدی کۆچیدا وەفاتی کردووە، ڕایەکی تر دەڵێت: لە ساڵی نەوەدو یەکی کۆچی بووە، ڕایەکی تر دەڵێت: لە ساڵی نەوەدو سێی کۆچی بووە[٤].

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨-٩.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ١١٥ و ٥٤٩ و ٥٨٥، صحيح مسلم ٤٧٠٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٠٤١، سنن أبو داود، الرقم ٣٨٠٥، سنن الترمذي، الجامع الصحيح، الرقم ٢٢٢٩، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٦٩٨، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٩٧٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٤٤١ و ٥٨٣٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢٨٨٣.

(٣) تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٨٩.

(٤) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٠، البداية و النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

کاتێ کۆچی دوایی کرد، تەمەنی نەوەدو نۆ ساڵ بوو، ڕایەکی تر دەڵێت: بەڵکو تەمەنی سەدو یەك ساڵ بوو، ڕایەکی تر دەڵێت: بەڵکو سەدو حەوت ساڵ بوو،[١] یان دەوترێت : نەوەدو شەش ساڵ بوو،[٢] یان دەوترێ: سەدو بیست ساڵ بوو.

بەڵام ( ئیبن ئەثیر) وەڵامی ئەو قسانە دەداتەوەو دەڵێت: ئەو تەمەنە زۆر وتانە ڕاست نین، چونکە کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەنەس تەمەنی دە ساڵان بووە، زیاترین بۆچوونیش لەسەر ساڵی وەفاتی هاتووە، ساڵی نەوەدو سێی کۆچی بووە، کە بەو پێیە زۆرترین ئەگەر بۆ تەمەنی سەدو سێ ساڵە).[٣]

ئیمامی ذەهەبی ڕای ڕاستتر دێنێت، کە تەمەنی سەدو سێ ساڵ بووەو، لە ساڵی نەوەدو سێی کۆچی وەفاتی کردووە.[٤]

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٧- ١٢٨.

(٢) البدايقو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

(٣) أسد الغابة، ج١، ص١٩٤.

(٤) سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٦.

## ژمارەی هاوەڵان

سەبارەت بە ژمارەی هاوەڵان ڕاجیایی هەیە، ڕاستیش ئەوەیە، کە بە وردیی ژمارەی هاوەڵان نازانرێت، چونکە ژمارەیەکی زۆر بووەو لەو سەردەمەشدا سەرژمێری ورد نەبووە، ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان لە دووری مەککە و مەدینەوە هاتونو، وەك وەفد هاتون و دواتر چوونەتەوە بۆ ناوچەی خۆیان، لێرەدا تەنها چەند گێڕانەوەیەك لەسەر ژمارەی هاوەڵان، لە چەند قۆناغێکدا بە نموونە دێنینەوە:

هاوەڵانی بەشداربوو لە غەزای بەدردا (٣١٣) کەس بوون،[١] ژمارەیەکی زۆریش لە مەدینە بوون لە پیاو و ژن و منداڵ، کە نەچووبوون بۆ ئەو غەزایە.

هاوەڵان لە ڕۆژی ( بیعة الرضوان )دا ژمارەیان نزیکەی ١٤٠٠ یان ١٥٠٠ هاوەڵ دەبوو،[٢] خوای گەورەش ئایەتی (لقد رضي الله عن المؤمنين إذ يبايعونك تحت الشجرة).[٣]

هاوەڵانی بەشداربوو لە ساڵی دەی کۆچیدا، کە لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشدار بوون بۆ چوون بۆ مەککە، لە سەروو دە هەزار کەسەوە

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٥٠، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٠٣٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١١٨٤٨.

(٢) ابن عبدالبر: الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ط١، دار الجيل(بيروت – ١٤١٢هجري)، ج١، ص ٣ و ٥.

(٣) الإسراء: ١٨.

دەبوون، وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە: (عن ابن عباس رضي الله عنهما أن النبي صلى الله عليه وسلم خرج في رمضان من المدينة ومعه عشرة آلاف).[١]

واتە: ( لە ئیبن عەبباسەوە، کە دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕەمەزاندا، لە مەدینە دەرچووو، دە هەزار کەسی لەگەڵدا بوو).

لە غەزای (حونەین) دا ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون، دەهەزار کەس بوون لەگەڵ (الطلقاء)دا،[٢] واتە: ئەوانەی لە دوای فەتحی مەککە، بوونە شوێنکەوتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

(ئیبن حەجەر) دەقێکی ئەبو زەرعەی ڕازی هێناوە، کە دەڵێت: ( پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە وەفاتی کرد، ئەوانەی دیبوویان و فەرموودەیان لێوەگێڕابویەوە، لەسەروو سەد هەزار کەسەوە دەبوون لە ژن و پیاو، کە هەموویان فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە، ئایا فەرموودەی بیستراو بێت، یان بینراو).[٣]

بەڵام ئەمە جێی پرسیارەو پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە، چونکە ئەگەر سەیری ئەو کتێبانە بکەین، کە تایبەت بە هاوەڵان نووسراون و، سەیری سەنەدەکانی کتێبەکانی فەرموودەش بکەین، لەگەڵ ئەم گێڕانەوەدا یەك ناگرنەوە.

بۆ نموونە: ژمارەی باسکراوی هاوەڵان، لە هەندێ لەو کتێبانەی تایبەت بەو بوارە نووسراون دەخەینە ڕوو:

کتێبی (معرفة الصحابة)ی ئیبن مەندە ناوی ( ٦٧٢ ) کەسایەتی باسکردووە، کە هەندێکیان هاوەڵ نین.

کتێبی (معجم الصحابة)ی ئیبن قانع ناوی( ١٢٢٦ ) کەسایەتی باسکردووە، کە هەندێکیان هاوەڵ نین.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٣٩.

(٢) صحيح ابن جبان، الرقم ٤٨٤٢.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢.

کتێبەکەی ئیبن عەبدولبەر (الإستيعاب في معرفة الأصحاب) ناوی (٤٢٢٥) کەسایەتی باسکردووە، کە هەندێکیان هاوەڵ نین.

کتێبەکەی ئیبن ئەثیر (أسد الغابة) ناوی (٧٥٥٤ ) کەسایەتی باسکردووە، کە هەندێکیان هاوەڵ نین و ژمارەیەکیشیان دووبارە بوونەتەوە، لەبەر ڕاجیایی لەسەر ناویان.

کتێبەکەی (ئیبن حەجەر) (الإصابة في تمييز الصحابة) ناوی (١٢٣٠٤) کەسایەتی باسکردووە، کە هەندێکیان هاوەڵ نین و، ژمارەیەکیشیان دووبارە بوونەتەوە لەبەر ڕاجیایی لەسەر ناویان.

بۆیە دەکرێت بوترێت: ئەوە ژمارەی هاوەڵان بووبێ، یان ژمارەیەکی نزیك بەو ژمارەیە، فەرموودەشیان لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بیستبێت و گێڕابێتەوە بۆ خەڵکی دەوروبەریان، بەڵام ئەو گێڕانەوانە هەموویان تۆمار نەکرابن و نەگەیشتبنە نەوەکانی داهاتوو، وەك ئەوەی چەندین کەس بە جیاجیا، یان وەك وەفد هاتبن و، لەو ماوە کەمەی بینینی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، بڕێك فەرمودەیان وەرگرتبێت و دواتر چووبنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و، لەوێ ئەو فەرموودانەیان گێڕابنەوە، بەڵام دواتر ئەو فەرموودانە تۆمار نەکرابن.

هەروەها (ئیبن حەجەر) گێڕانەوەیەکی (ثەوری) هێناوە، کە دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد، دوانزە هەزار هاوەڵ هەبوون، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لێیان ڕازی بووە.[1]

لە (المستدرك على الصحيحين) دا هاتووە: (ثارت الفتنة وأصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم عشرة آلاف)،[2] واتە: (فیتنەی نێوان هاوەڵان هەڵگیرسا، ئەوکات دەهەزار هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مابوون).

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣.

(٢) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٨٤٢٣، مصنف عبدالرزاق، الرقم ٢٠٧٣٥.

بەمجۆرە چەند ژمارەیەکی جیاجیامان لەڕووی کات و شوێنەوە وەرگرت، چونکە هەم بەپێی ماوەکان بە مردنی هاوەڵان ژمارەی هاوەڵان کەم بوەتەوە، هەم بەپێی شوێنەکان جیاواز دەبێت، چونکە ئەو ژمارانە کە باسکراون زیاتر لەسەر ژمارەی هاوەڵانی ناو نیمچەدوورگە هاتون، ئەگەرنا ئەو هەمووە هاوەڵەی بە وەفد هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ژمارەیان باس نەکراوە.

## چینەکانی کۆمەڵگە
## لە سەردەمی پێغەمبەردا
## (صلى الله عليه وسلم)

لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، چوار کۆمەڵی سەرەکی لە کۆمەڵگەدا هەبوون، کە ئەوانیش بریتی بوون لە: (کۆمەڵی بێباوەڕان، کۆمەڵی هاوەڵان، کۆمەڵی دوو ڕوان، کۆمەڵی جولەکەکان).

### یەکەم: کۆمەڵی بێباوەڕان:

ئەمانە بڕوایان بە حەقیقەتی ئیسلام و پەیامەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەبووو، لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە، دژایەتی توندی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) دەکرد، ئازاری موسڵمانانیان دەدا، هێرشی ماددی و مەعنەوییان دەکردە سەر ئیسلام.

هێرشی ماددیی بریتی بوولە ئازاردانی جەستەیی موسڵمانان، هێرشی مەعنەوی بە لێدانی مەعنەوی بۆ موسڵمانان وەك: گومان خستنە سەر کەسایەتیی و بانگەوازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، سووکایەتی کردن بە موسڵمانان و چەندین شێوازی تری دژایەتی.

ئەمانە ئازاردانەکەیان هێندە توندبوو، هەتا موسڵمانانیان ناچارکرد، مەککە جێبهێڵن و بەرەو حەبەشە و مەدینە کۆچ بکەن، بەڵام هەر وازیان نەهێنا و ڕوویانکردە حەبەشە بۆ جێ لەقکردن بەموسڵمانان و گەڕاندنەوەیان بۆ مەککە،

تا ئازاریان بدەن و بشتوانن ڕێبازەکەیان لەناو ببەن، ڕووشیانکردە مەدینە، تا بتوانن دەوڵەتەکەیان لەناو ببەن، ئەوەبوو چەند جەنگێکیان لەگەڵ موسڵماناندا ئەنجامداو، ئامادەش بوون لەگەڵ جوولەکە و دوو ڕوانیشدا یەکبگرنو، هاودەستی تەواوەتی بکەن دژ بە موسڵمانان، واتە: هەموو هەنگاوێکی بەرچاو و شاراوەی دژایەتیکردنی موسڵمانانیان گرتەبەر.

خوای گەورە، بۆ قۆناغی مەککە، جیهادی دژی ئەوانی فێری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرد، تا بە قورئان جیهادیان بکات، وەك خوا دەفەرموێت:

﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَجَـٰهِدْهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ﴾.[1]

واتە: گوێڕایەڵی بێباوەڕان مەبە و بە قورئان جیهادی گەورەیان بکە)[2].

## دووەم: کۆمەڵی هاوەڵان:

ئەمەش ئەو چینەی کۆمەڵگە دەگرێتەوە، کە باوەڕیان هێنا بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەمانەش چەند بەشێکیان لەخۆدەگرت: ئەو هاوەڵانەی، کە زوو موسڵمان ببوون و، بەشداری ئازار و ناڕەحەتیەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوون، ئەوانیش دوو دەستە بوون: (کۆچەران، پشتیوانان).

سەبارەت بە کۆچەران (المهاجرین)، هەندێکیان کۆچیانکرد بۆ حەبەشە و لەوێ لە غەریبیدا مانەوە، تا لە غەزای (خەیبەر)دا گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە مەدینە، زۆرینەشیان کۆچیان کرد بۆ مەدینەو، لەوێ بوونە دامەزرێنەرانی یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی.

هەندێکی کەمیش لە مەککە مانەوە، ئەمانەیان بەفەرمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مانەوە، تا ئەرکی پێ سپێردراویان بەجێبگەیەنن، وەك:

---

(١) الفرقان: ٥٢.

(٢) ئیبن عەبباس بۆ (جاهدهم به) دەڵێت واتە بە قورئان، لەبەرئەوەش سوورەتەکە مەککیە ئەم رایە راسترە.بروانە: القرطبي: الجامع لأحكام القرآن، دار عالم الكتب (الرياض-٢٠٠٣)، ج١٣، ص ٥٨.

عەبباسی مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هەندێکیان بە ناچاری دەمانەوە، چونکە کۆیلەبوون وەك: ئەسلەمی کۆیلەی عەبباس، هەندێکیان بێ توانا بوون و نەیاندەتوانی کۆچ بکەن، هەندێکیش دوای قۆناغی کۆچکردن موسڵمان دەبوون.

ئەمانە دواجار دەرووی خواییان لێکرایەوە، کاتێ ( ئەبو بەصیر) توانی بێ شکاندنی رێککەوتننامەی حودەیبیە، لە سەرەرێی بازرگانی شام و قورەیش، بنکەی دووەمی دەوڵەتی ئیسلامی دابمەزرێنێو، لەوێوە موسڵمانبوانی مەککە بچنە ئەوێ، تا دواتر بە فەرمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەوانیش چوون بۆ مەدینە، هەندێکی تر لە هاوەڵان ئەوانە بوون، کە لە سەرویەندی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوون، هەندێکیان بە ناچاری موسڵمان بوون و، دواتر موسڵمانێتیەکەیان لە رواڵەتەوە چووە ناو دڵەکانیانو، بوونە شەیدایانی ئیسلام، هەندێکیشیان هەر لەسەرەتاوە بەویستی خۆیان و لە دڵەوە موسڵمان بوون و، هەوڵیان دەدا قەرەبووی رابردووی لەدەست چوویان بکەنەوە.

پشتیوانان (الانصار)یش موسڵمانانی مەدینە بوون، کە بوونە پشت و پشتیوانی تەواوەتی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و برا کۆچەریەکانیان، هێندە رێزیان لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەورە بوو، کە دەیفەرموو: ( آية الإيمان حب الأنصار وآية النفاق بغض الأنصار)[1].

واتە: (نیشانەی ئیمانداریی، خۆشەویستی پشتیوانانەو، نیشانەی دوو روویش، رق لێبوونیانە)، هەروەها دەیفەرموو:( لولا الهجرة لكنت امرأ من الأنصار، ولو سلك الناس واديا وسلكت الأنصار واديا - أو شعبا - لسلكت وادي الأنصار،- أو شعب الأنصار)[2]، واتە: (ئەگەر کۆچ نەبوایە، بەدڵنیاییەوە من یەکێك دەبووم لە

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ١٧ و ٣٥٩٦، صحيح مسلم، الرقم ١٣٣، السنن الكبر للنسائي، الرقم ٨٠٥٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢١٢٧ و ١٢٠٧٣، مسند أبي يعلى الأنصاري، الرقم ٤١٩٣.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٦٨٣٧، صحيح مسلم، الرقم ١٨٢٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢١٠١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٧٠١ و ١٣٣١٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٥٠٨،

پشتیوانان، ئەگەریش خەڵکی دۆڵێ، یان شیوێ بگرنەبەر، پشتیوانانیش دۆڵێ، یان شیوێ بگرنەبەر، بەدڵنیاییەوە من دۆڵ، یان شیوی پشتیوانان دەگرمەبەر!).

پشتیوانان بوونە پاڵپشتی ماددی و مەعنەوی بۆ کۆچەرانو، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) برایەتیی و میراتگریی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، دواتر پاش چاکبوونی باری دارایی، کۆچەرانیش بە بڕیاری خوای گەورە، برایەتییە ئیمانییەکە مایەوەو، میراتگرییەکە هەڵوەشایەوە.

هاوەڵان بەردی بناغە و هێزی یەکەمی ئیسلام و، شەیدایانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون، ئیتر هێندەیان بەسە، کە خوا لێیان ڕازی بووە، ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون، بەڕاستی شیاویانە لەگەڵ ناوهێنانیاندا بوترێ: (رضي الله عنهم).

ئەمانە هاودەم و پارێزەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون، بشکێ دەستێ و لاڵ بێ زمانێ و کوێر بێت چاوێ و، کەڕ بێت گوێیەك و لەئیش بکەوێت دڵێ، کە بە نیازی خراپ لە ژیانیان دەنەوێت.

## سێیەم: چینی دوو ڕوان:

ئەمانە بە ڕواڵەت خۆیان بە موسڵمان نیشان دەدا،لە ناخیشدا بێباوەڕ بوون، ڕواڵەتی موسڵمانبوونیشیان، تەنها لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵان بوو، ئەگەرنا لای یاران و دۆستانیان ناخی خۆیان دەردەبڕی، وەك خوا دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَـٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٦﴾ ﴾[1]

---

(١) البقرة: ١٤-١٦.

واتە: هەر وەختایەك دەگەنە ئیمانداران دەڵێن: ئێمەش وەك ئێوە ئیمانمان هێناوە، هەروەختایەکیش دەگەڵ (گەورەو سالارە) شەیتانییەکانیان خەڵوەت دەکەن و کۆدەبنەوە، دەڵێن: ئێمە دەگەڵ ئێوەین، ئێمە(بە ئەوانە کە ئیمانیان هێناوە) گەپ و گاڵتە و گەمە دەکەین.خودا گاڵتە بە ئەوان دەکا و (بەریان بۆ هەڵدا دەکا و) یاریان دەدا، تا بە سەرکێشی خۆیان کوێرانە و سەر لێشێواوانە درێژە بدەن (و بەینی کفر و ئیمان سەرگەردان و حەیران بمێنن). ئەوان کەسانێکن، کە سەرلێشێواوی و سەرگەردانییان کڕیوە بەڕێنوێنی،جا سەوداکەیان قازانجی نەکردووەو ڕێبازانی ڕێگای ڕاست و دروست نەبوونە (و حەق و حەقیقەتیان بەدی نەکردووە).

بەڵام، کەدەچوونە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیانوت: شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری خوایت، بەڵام خوا بەدرۆی خستنەوە، وەك دەفەرموێت:

﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ۝١ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ۝٢﴾[١].

واتە: کاتێ بێباوەڕان هاتن بۆ لات، دەیانوت: ئێمە شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری خوایت، خوادەزانێت تۆ بەدڵنیاییەوە پێغەمبەری خوایتو، خواش شایەتی دەدات بەدڵنیاییەوە لێدەکەن درۆزنن، سوێندەکانیان دەکردە قەڵغان و ڕێیان لە ڕێ و بانگەوازی خوا دەگرت، بەڕاستی ئەوانە زۆر خراپ کار دەکەن و خراپەکارن).

ئەمانە دەیانزانی پەیامەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕاستەو، لای خواوە سروشی بۆ دێ، بۆیە هەمیشە دەترسان خوا ئایەتیان لەسەر دابەزێنێ و پیسی و پیلانیان ئاشکرا بکات، وەك خوا دەفەرموێت:

---

(١) المنافقون: ١-٢.

﴿ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ٦٤ ﴾[١]

واتە: لێدەكەن دەترسن سوورەتێكیان لەسەر دابەزێ، هەواڵی ئەوەیان لێ بدات، كە لە دڵیاندا هەیە، بڵێ: گاڵتە بكەن بەدڵنیاییەوە خوا ئەوە دەردەكات، كە ئێوە حەزەری لێدەكەن).

(عبداللەی كوڕی ئوبەی)، گەورەی دووڕووەكان بوو، كە لە مەدینە نیشتەجێ بوو، بەڵام پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) هیچ كات هێزی لەدژیان بەكارنەدەهێنا، چونكە پێی باش و جوانیش نەبوو، خەڵكی بڵێن: موحەممەد یارانی خۆی دەكوژێت، ناوی دووڕووەكانیش لای حوژەیفەی كوڕی یەمان بوو، كە پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) پێی فەرمووبوو، كامانە دووڕوون، بەڵام ڕێی بەویش نەدا، ناویان ئاشكرا بكات![٢]

## چوارەم: جوولەكەكان:

ئەمانە لە ماوەیەكی مێژوویدا، چووبوونە مەدینە و لەوێ مابوونەوە، جوولەكەكان زۆر بەدەگمەن كەسیان تێدا موسڵمان دەبوو، ئەمانە بە هەموو شێوەیەك دژایەتی پێغەمبەریان(صلی اللە علیه وسلم) دەكرد، بەڵام زۆر كات بەنهێنی دژایەتییان ئەنجام دەدا.

پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم)، كە هاتە مەدینە، لە نوسراوی تایبەتیدا بۆ مەدینە، ماف و ئەركی جوولەكەكانی دیاری كرد، ئەوانیش پێی ڕازیبوون، كەچی دواتر ناپاكییان نواند، بۆیە پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) یەك لەدوای یەك لە مەدینە دەریكردن، دواجاریش پێغەمبەر (صلی اللە علیه

---

(١) التوبة: ٦٤.

(٢) أسد الغابة، ج١، ص٥٧٣.

وسلم) هێرشی بردە سەر قەڵاکەیان: (قەڵای خەیبەر)و، دواجار خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بەموسڵمانان، کاتێ ئیمامی عەلی بوو بە ئاڵاهەڵگری موجاهیدان.

لای جوولەکەکان، تاکی ناو خۆیان، تا ئەوکات عاقڵ و ژیر بوو، کە دژایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)وموسڵمانان بکات، ئیتر، کە موسڵمان ببا،ئەوا بەبڕوای ئەوان:ئەو کەسە دەبوویە نەفامێکی بێڕێزی نەشارەزا، نموونەی ئەوەش موسڵمانبوونەکەی (ئیبن سەلام) بوو.

جوولەکەکان لەڕووی سیاسییەوە، هاوپەیمان و هاریکاری کارای بێباوەڕان بوون، چاکترین نموونەش لەو بارەوە، لە جەنگی (خەندەق)دا بەدی دەکەین.

خوای گەورە کینە و ڕقی جوولەکەی بۆ موسڵمانان خستوەتەڕوو، وەك دەفەرموێت:

﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ ﴾[1].

---

(١) المائدة: ٨٢.

## چینەکانی هاوەڵان

ئەو کەسانەی لەسەر ژیانی هاوەڵان نوسیویانە، هەرکامەو بەجۆرێك بۆ چینەکانی هاوەڵان دابەشکاری دەکەن، هەیانە پێشینەی موسڵمان بوون بەمەرج دەگرێ، هەیانە خزمەتی باڵا بە مەرج دەگرێ.

ئێمەش بە کورتی چەند نموونەیەکیان لەسەر دێنین:

(ئیبن سەعد) بەمجۆرە دابەشیان دەکات:[1]

**یەکەم:** کۆچەرە بەدرییەکان (بەشداربوانی بەدر).

**دووەم:** پشتیوانە بەدرییەکان (بەشداربوانی بەدر).

**سێیەم:** ئەوانی زوو موسڵمان ببوون، بەڵام بەشداری( بەدر) نەبوون.

**چوارەم:** ئەوانەی پێش فەتحی مەککە موسڵمان بوون.

**پێنجەم:** ئەوانەی دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوون.[2]

(حاکم) بۆ دوانزە چین دابەشیان دەکات:

**یەکەم:** ئەوانەی زوو لە مەککە موسڵمان بوون، وەك:( ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی (رضي الله عنهم).

---

(١) ئەمەم لە نامەی ماجستێری خوێندکار محمود عیدان وەرگرتووە، کە لە(المکتبة الشاملة) بڵاوکراوەتەوە، دواتر بە سەیرکردنی دوو سەرچاوەکە پشتڕاستم کردەوە.

(٢) بڕوانە: الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣ و ٤.

**دووەم:** یارانی (دارالندوە).

**سێیەم:** ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە.

**چوارەم:** ئەوانەی لە (عەقەبە) بەیعەتیان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا.

**پێنجەم:** هاوەڵانی عەقەبەی دووەم.

**شەشەم:** یەکەمین ئەو کۆچەرانەی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتن، کاتێ لە (قوباء) بوو، پێش ئەوەی بێتە مەدینە.

**حەوتەم:** بەشداربوانی بەدر.

**هەشتەم:** ئەوانەی لە نێوان بەدر و حودەیبیەدا، کۆچیان کرد بۆ مەدینە، بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

**نۆیەم:** بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان.

**دەیەم:** ئەوانەی لە نێوان حودەیبیە و فەتحی مەککەدا، کۆچیان کرد بۆ مەدینە،بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

**یانزەهەم:** ئەوانەی ڕۆژی فەتحی مەککە موسڵمان بوون.

**دوانزەهەم:** ئەو منداڵانەی ڕۆژی فەتحی مەککە و لە وتاری ماڵئاوایدا پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) بینیوە.[١]

---

(١) الحاكم النيسابوري: معرفة علوم الحديث، ط٢، دار الكتب العلمية(بيروت – ١٩٧٧)، ج١، ص٢٣.

## پلەو پایەی هــاوەڵان (رضي الله عنهم)

## هــاوەڵان (رضي الله عنهم) له قورئانی پیرۆزدا

هاوەڵان چاکترین دەستەن: هاوەڵان سەردەستەی ئەو ئوممەتەن، کەخوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت:

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾،[1] هاوەڵانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) یەکەم دەستەی ئوممەتی ئیسلامن، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیانگرێتەوە.

**خوای گەورە لە هاوەڵان ڕازیە:**

﴿ وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾[2].

واتە: (خوای میهرەبان لەوانەی، کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا، لە کاروانی کۆچەران و پشتیوانان و ئەوانەی، کە بەرێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون، کە چەندەها ڕووبار بەبەردەم

---

(١) آل عمران: ١١٠.

(٢) التوبة: ١٠٠.

کۆشـکەکانی و بەژێر درەخـتەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا، بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، ئەوە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە).

**خوای تاك و تەنها، وەسفی هەر سێ دەستەی: کۆچەران و پشیوانان و ئەوانەی دوای ئەوانیش دەکات و دەفەرموێت:**

﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾[1].

واتە: (هەروەها لەو دەستکەوتانە، بەشی کۆچبەرانی هەژارن دەبێت بدرێت، ئەوانەی لە شوێنەوار و سامانیان دوورخراونەتەوە و دەرکراون، ئەوانەی بەتەمای بەخششی خوا و ڕەزامەندی ئەونو، بەبێ هیچ تەماعێك پشتیوانی لە خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و، هەوڵی سەرخستنی بەرنامەکەیان دەدەن، هەر ئائەوانە ڕاستگۆو ڕاستانن، ئەوانەی، کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد، بۆ پێشوازیی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت، کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەرونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلیەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوەو بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا، هەرچەندە هەژارو نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن،

---

(١) الحشر: ٨-١٠.

ئەوانەش، کە بە شوێن کۆچبەران و پشتیواناندا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دۆعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا! لە ئێمەو لە و برایانەشمان خۆش ببە، کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و، لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە،لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا! تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندەو میهرەبانیت.

**خوا، بەڵێنی چاکە بە هاوەڵان دەدات، وەك دەفەرموێت:**

﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ ﴾[1].

واتە: (یەکسان نین لە ئێە ئەوانەتان کە پێش فەتحی مەککە بەخشیتان و جەنگتان کرد، ئەوانەپاداشتیان زۆر گەورەترە لەوانەی دوای فەتحی مەککە بەخشییان و جەنگیان کرد، وە هەمووشیان - هەموو هاوەڵان - خوا بەڵێنی چاکەی پێداون، خواش زانا و ئاگادارە بەوەی دەیکەن).

**خوا شایەتی لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی دەدات:**

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ۖ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾[2].

---

(١) الحديد: ١٠.

(٢) محمد: ٢٩.

واته: (محمد (صلى الله عليه وسلم) ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کە لە خزمەتیدان و شوێنی کەوتوون، توند و تیژن بەرامبەر بێباوەڕانو، بە بەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنوش و سوجدە دەبەن، هەردەم ئاواتیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و پایە بەرزییە لەلای خوا، نیشانەی چاکی و پاکی لەناوچەوانیاندا دیارە و دەدرەوشێتەوە، لە ئەنجامی سوژدەبردن و خوا پەرستیاندا، جا ئەو بەڕێزانە ئەوە نمونە و پێناسەیانە لە تەوراتدا، نموونە و پێناسەشیان لە ئینجیلدا وەك ڕووەکێك وایە، کە لە سەرەتاوە چەکەرە بکات، جا چەکەرەکەی بەهێز کردبێت، پاشان ئەستوور ببێت و ڕابوەستێت لەسەر قەدەکەی، ئەوەندە زوو پێبگات کشتیارەکان سەرسام بکات و پێیان سەیر بێت: چۆن پێگەیی؟ چۆن ئاوا خۆی گرت؟ ئەم پێناسەیە بۆ ئەوەیە، خوا، کافران داخ لەدڵ بکات، جا خوای بەدەسەڵات بەڵێنی بەوانە داوە، کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لەوان، کە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە و بێ سنووریان پێ ببەخشێت).

**خوا، لێبوردەیی بە هاوەڵان دەبەخشێ:**

﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٧﴾ ﴾[1].

واته: (سوێند بە خوا، بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەر و کۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر کەوتن لە کاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبوکدا)، دوای ئەوەی، کە خەریك بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت و (بێزاری دەربڕێت)، لەوەودوا تەوبە و پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە بە سۆز و میهرەبانە لەگەڵیاندا).

---

(١) التوبة: ١١٧.

خوا، ڕەزامەندی خۆی بۆ هاوەڵانی بەیعەتی ریضوان دەردەبڕێ:

﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ ﴾[1].

واتە: (سوێند بە خوا، بەڕاستی خوا ڕازیی بووە لەو باوەڕدارانەی کاتێك پەیمانیان لەگەڵدا بەستیت لە ژێر درەختەکەدا، خوا خۆیشی ئاگادار بوو بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیاز پاکی و دڵسۆزی)، هەر بۆیە ئارامی و هێمنی و ئاسودەیی دابەزاندە سەریانو، پاداشتی بە مژدەی سەرکەوتنێکی نزیك دانەوە. هەروەها بەڵێنی چەندین دەستکەوتی زۆری پێداون، کە لە ئاییندەدا دەستیان دەکەوێت و وەریدەگرن، خوا، هەمیشە و بەردەوام باڵادەستە بەسەر خوا نەناسانداو، دانایە و دەزانێت، چ کاتێك ئیمانداران سەر دەخات).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ ﴾[2].

واتە: (ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد، بۆ پێشوازیی لە کۆچەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت، کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلییەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا، هەرچەندە هەژار و نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئائەوانە هەر سەرفرازن).

---

(١) الفتح: ١٨-١٩.

(٢) الحشر: ٩.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يُهَاجِرُوا۟ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ ۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴿٧٣﴾ ﴾[1].

واتە:( بەڕاستی ئەوانەی، کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردووەو، تێکۆشاون لە پێناوی ئایینی خوادا بە خۆیان و ماڵ و سامانیانەوە، ئەوانەش کە پێشوازیان لە کۆچبەران کردو لەماڵ و حاڵی خۆیاندا جێیان کردنەوەو پشتگیرییان کردن، ئا ئەوانە هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن، ئەوانەش، کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان نەکردووە، ئەوە بۆتان نییە پشتگیرییان بکەن لە هیچ شتێکدا، هەتا ئەوانیش کۆچ دەکەن (بۆ بەهێزکردنی دەوڵەتی ئیسلام)، خۆ ئەگەر ئەو ئیماندارانەی ( کە کۆچیان نەکردووە) داوای یارمەتی و پشتگیرییان لە ئێوە کرد بۆ سەرخستنی ئایینی ئیسلام، ئەوە پێویستە لەسەرتان بیکەن، جگە لەسەر ئەو عەشیرەت و لایەنەی، کە لە نێوان ئێوەو ئەواندا پەیمانێك هەبێت (ئەو پەیمانە مەشکێنن)، خوای گەورەش بینایە بەو کارو کردەوانەی، کە دەیکەن، ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان نەکردووە، ئەوە بۆتان نییە پشتگیرییان بکەن لەهیچ شتێکدا، هەتا ئەوانیش کۆچ دەکەن (بۆ بەهێزکردنی دەوڵەتی ئیسلام)، ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن و پشتیوانی لە یەکتر دەکەن، خۆ ئەگەر ئێوەی ئیماندار کۆمەك بەیەکتر نەکەن و پشتی یەکتر نەگرن، ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی و ناکۆکی و گوناه و تاوانی گەورە پێش دێت (ئازار و ناخۆشی بۆ ئێوەی ئیماندار پێش دێت).

---

(١) الانفال ٧٢-٧٣.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَاءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي عَمِلُوا وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾[1].

واتە: (ئەو کەسەش ڕاستی و حەقیقەتی هێناوەو باوەڕیشی پێیەتی، تەنها ئائەوانە خواناس و دیندارن، جا ئەو بەختەوەرانە هەرچییەکان بوێت، ئەوا لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان ئامادەیە و پێشکەشیان دەکرێت، ئائەوەیە پاداشتی چاکەکاران و چاکەخوازان، بۆ ئەوەی خوا چاوپۆشی بکات لە خراپترینی ئەو گوناهانەی کە ئەنجامیانداوە، بۆ ئەوەش پاداشتیان بداتەوە بە چاکتر لەوەی کە دەیانکرد).

ئیبن تەیمییە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: (ئەو دەستەیە ڕاستی دەڵێن و بەڕاستیشی دەزانن، پێچەوانەی ئەو دەستەی درۆ هەڵدەبەستن، یان ڕاستیش بەدرۆ دەزان... هاوەڵانیش دوای پێغەمبەران چاکترین کەسانن، کە ڕاستییان هێنا و ڕاستییان بەڕاست زانی).[2]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُولَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ ﴿٧﴾ ﴾[3].

واتە: (ئێوە دڵنیابن و بزانن، کە پێغەمبەری خوا لەناوتاندایە (پرس و ڕای پێ بکەن) زۆر شت هەیە، ئەگەر ئەو بە ڕای ئێوەی بکردایە، تووشی گیروگرفت و ناخۆشی دەبوون، بەڵام خوا ئیمان و باوەڕی لە لا خۆشەویست کردوونو، لە دڵ و

---

(١) الزمر: ٣٣ - ٣٥.

(٢) منهاج السنة النبوية، ط١،مؤسسة قرطبة، سنة ١٤٠٦ ه، ج٢، ص٣٣.

(٣) الحجرات: ٧.

دەروونتاندا ڕازاندویەتییەوە، لەولایشەوە کوفر و بێباوەڕیی و گوناهو یاخیبوون لەفەرمانی خوای،لەلا تاڵ و ناشیرین کردوون، ئائەوانە هەر خۆیان ڕێگەی ژیریی و سەرفرازییان گرتوەتەبەر).

﴿يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝٨﴾[1].

واتە: (ڕۆژێك دێت، کە خوا پێغەمبەر و ئەوانەش، کە لە خزمەتیدا و لەگەڵیدا بون، خەجالەت و شەرمەزار ناکات، بەڵکو نوور و ڕووناکییان دەدرەوشێتەوەو، دێت و دەچێت لەبەردەم و لای ڕاستیانەوە و دەڵێن: پەروەردگارا! ئەم نوور و ڕووناکییەمان بۆ زیاد بکە و لێمان خۆش بە، چونکە بەڕاستی تۆ دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

خوا دەفەرموێت: ﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ۝٨٨﴾[2].

واتە: (بەڵام پێغەمبەر و ئەوانەی لەگەڵیدا باوەڕیان هێنا، بەسامان و گیانیان جیهادیان کرد و تێکۆشان، ئەوانە خێرو چاکەکانیان بۆ هەیە و ئەوانەش سەرکەوتوون).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ۝٢٦﴾[3].

واتە: ( کاتێ بێباوەڕان لە دڵەکانیاندا تینی نەفامییان لەخۆ گرتبوو، خوای گەورە سوکنایی و دڵئارامی خۆ دابەزاند بۆ سەر پێغەمبەرەکەیو، بۆسەر

---

(١) التحريم: ٨.

(٢) التوبة: ٨٨.

(٣) الفتح: ٢٦.

باوەڕداران و پەیوەستی وشە و پەیامی لەخواترسی کردن و، ئەوانەش شیاوتر بوون و پێی و ئەهل و دارودەستەی بوون، خوای گەورەش بە هەموو شتێ زانابووەو زانایە).

﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾[1].

واتە:(ئەوانەی، کە بەدەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) چوون، دوای ئەوەی کە توشی ناخۆشی و زام و ئێش بوون، بۆ ئەوانەیان، کە چاکەیان کرد و پارێزکار بوون پاداشتی زۆر گەورە و بێسنوور ئامادەیە، ئەوانەی کە خەڵکی - باوەڕلاواز - پێیان دەوتن: بەڕاستی خەڵکی بێباوەڕ و خوانەناس، خۆیان بۆ ئێوە کۆکردوەتەوە و خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە،لێیان بترسن، بەڵام ئەوان باوەڕیان دامەزرا و وتیان: خوامان بەسە، کە یاریدەر و یارمەتیدەرێکی زۆر چاکە).

---

(١) الفتح: ٢٦.

## هـــاوەڵان ( رضي الله عنهم )
## لە فەرموودەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە هاوەڵانی دەوری دەفەرموێت:

(خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم[1]. واتە: چاکترینی خەڵك سەدەی منن، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان).

هەروەها دەفەرموێت: ( يأتي على الناس زمان فيغزو فئام من الناس فيقال: هل فيكم من صاحب رسول الله (صلى الله عليه وسلم)؟ فيقولون نعم فيفتح لهم، ثم يأتي على الناس زمان فيغزوا فئام من الناس، فيقال: هل فيكم من صاحب أصحاب رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فيقولون نعم، فيفتح لهم ثم يأتي على الناس زمان فيغزو فئام من الناس فيقال هل فيكم من صاحب من صاحب أصحاب رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فيقولون نعم فيفتح لهم)[2].

واتە: (سەردەمێ دێت بەسەرخەڵکدا دەستەیەك لە خەڵك غەزا دەکەن، دەوترێ: ئایا لەنێوتاندا کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەیە؟

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٠ و ٣٤٧٢ و ٦٠٧٣، صحيح مسلم، الرقم ٤٧٠٥، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٨٣٥ و ٧٣٢٩، المتسدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٢٤، سنن الترمذي، الرقم ٢١٩٨ و ٢٢٧٩، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٨٤٣، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٨٩٥٤، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٣٤٦٧ و ٣٩٨٠ و ٤٠٥٩، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ١١٣٢.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٧٠ و ٣٤١٩، صحيح مسلم، الرقم ٤٧٠١، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٨٤١ و ٦٧٧٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٠٨٠٦، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٩٣٨.

دەڵێن: بەڵێ، ئیتر فەتحیان بۆ دەکرێ، دواتر سەردەمێ دێت بەسەر خەڵکدا دەستەیەك لە خەڵك غەزا دەکەن، دەوترێ: ئایا لەنێوتاندا کەس هەیە هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) کردبێت؟ دەڵێن: بەڵێ، ئیتر فەتحیان بۆ دەکرێ، دواتر سەردەمێ دێت بەسەر خەڵکدا دەستەیەك لە خەڵك غەزا دەکەن، دەوترێ: ئایا لەنێوتاندا کەس هەیە هاوەڵی هاوەڵانی دەوری هاوەڵانی پێغەمبەری(صلی الله علیه وسلم) کردبێت؟ دەڵێن: بەڵێ، ئیتر فەتحیان بۆ دەکرێ).

هەروەها وەك دانانی هێڵی سوور، بۆ ڕێزی هاوەڵان و بەرز ڕاگرتنی ناو و شکۆیان لە نێو موسڵمانانda، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هۆشیاری دەداتە موسڵمانان و دەفەرموێت: (لا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلا نَصِيفَهُ)[1].

واتە: (قسە مەڵێن بە هاوەڵانم، چونکە سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە، ئەگەر یەکێکتان هێندەی شاخی ئوحود زێڕ ببەخشێ، ناگاتەوە بە (موددێکی) (نزیکەی دوو کیلۆ و نیو) ئەوان، بەڵکو نیو مودی ئەوان خێری ناگات).

لە فەرموودەیەکی تردا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەڕەشە ئاڕاستەی ئەوانە دەکات، کە قسە بە هاوەڵان دەڵێن، وەك دەفەرموێت: (مَنْ سَبَّ أَصْحَابِي فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ، وَالْمَلائِكَةِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلا عَدْلا)[2].

(ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە دەڵێت: خەڵکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! قسەمان پێ دەوترێ،

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٩١، صحيح مسلم، الرقم ٤٧١٤ و الحديث له، سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٩، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٠٣٤، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٦٩٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٠٤ و ٧٣٦٠، سنن أبي داود، الرقم ٤٠٦٠، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٧٨، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٩٤٤١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١٢٨٤، مسند الطيالسي، الرقم ٢٢٨٣.

(٢) أحمد بن حنبل في فضائل الصحابة، الرقم ٦، الشريعة للآجري، الرقم ١٩٢٢، الدعاء للطبراني، الرقم ١٩٨٩، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٢٣٤٠.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:(هەرکەس قسەو جنێو بلێت بە هاوەڵانم، نەفرینی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێبێت، خوا هیچی لێ وەرنا گرێ ).

عن أبي بريدة عن أبيه قال: صلينا المغرب مع رسول الله ( ثم قلنا : لو جلسنا حتى نصلي معه العشاء قال: فجلسنا فخرج علينا فقال: "ما زلتم ههنا؟" قلنا: يا رسول الله صلينا معك المغرب ثم قلنا نجلس حتى نصلي معك العشاء قال : "أحسنتم أو أصبتم" قال: فرفع رأسه إلى السماء وكان كثيراً ما يرفع رأسه إلى السماء فقال النجوم أمنة للسماء، فإذا ذهبت النجوم أتى السماء ما توعد، وأنا امنة لأصحابي فإذا ذهبت أتى أصحابي ما يوعدون، وأصحابي أمنة لأمتي فإذا ذهب أصحابي أتى أمتي ما يوعدون)[1].

ئەبوبورەیدە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژی ئێوارەمان کرد، دواتر وتمان: بەڵکو دابنیشین، تا نوێژی خەوتنانیشی لەگەڵ بکەین، دانیشتین، تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لامان، فەرمووی: ئێوە هێشتا لێرەن؟

وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! نوێژی ئێوارەمان لەگەڵتدا کرد، دواتر وتمان: با دابنیشین، تا نوێژی خەوتنانیشت لەگەڵ بکەین.

فەرمووی:(باشتان کرد و ڕاستتان پێکا)، ئینجا سەری بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە، زۆر جاریش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەری بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە، ئینجا فەرمووی: ئەستێرەکان پارێزەری ئاسمانن، هەرکات ئەستێرەکان نەمان، ئاسمان تووشی ئەوە دەبێت، کە وادەی دراوە، منیش پارێزەری هاوەڵانمم هەرکات من نەمام ئەوە وادە دراوە بۆ هاوەڵانم تووشیان دەبێت، هاوەڵانیشم پارێزەری ئوممەتەکەمن، هەرکات هاوەڵانم نەمان، ئەوەی وادەیان پێدراوە، تووشی ئوممەتەکەم دەبێت).

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٤٧٠٠، ١٩٤٤١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٩١٣١، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٣٥٦، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٧١١١، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٣٦.

هاوەڵان نموونەی خوێی چێشتن، چێشتی بێ خوێ بێتامە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (مثل أصحابي في الناس كمثل الملح فـي الطعام[1]. واتە: نموونەی هاوەڵانم لەناو خەڵکدا وێنەی خوێیە لە خواردندا).

دووبارە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، موسڵمانان ئاگادار دەکاتەوە، دەست هەڵگرن لە بە خراپە باسکردنی هاوەڵانو، دەفەرموێت: (إذا ذكر القدر فأمسكوا، وإذا ذكر أصحابي فأمسكوا[2]. واتە: هەرکات باسی قەدەر کرا، دەستهەڵگرن، هەرکاتیش باسی هاوەڵانم کرا، دەستهەڵگرن).

سەبارەت بە بەرزی پاداشتی هاوەڵان، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لو أن لرجل أحدا ذهبا فأنفقه في سبيل الله، في الأرامل والمساكين واليتامى ليدرك فضل رجل من أصحابي ساعة من النهار ما أدركه أبدا[3]. واتە: ئەگەر کەسێ هێندەی ئوحود زێڕی هەبێت و لەڕێی خوادا بیبەخشێ، بەسەر بێوەژن و هەژار و هەتیواندا، تا بگاتەوە بە فەزڵی ساتەڕۆژێکی یەکێك لە هاوەڵانم، هەرگیز پێی ناگاتەوە).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەفرینی خوا دەنێرێت بۆ ئەوانەی قسە بە هاوەڵان دەڵێن، وەك دەفەرموێت: (إن الناس يكثرون وأصحابي يقلون، فلا تسبوهم لعن الله من سبهم[4]. واتە: خەڵکی زیاد دەکەن و هاوەڵانم کەم دەکەن، دەی قسەیان پێ مەڵێن، نەفرینی خوا لەوەی قسەیان پێ دەڵێت:).

---

(١) أحمد بن حنبل في فضائل الصحابة، الرقم ١٤، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٧٦٤، الشريعة للآجري، الرقم ١١٤٠.

(٢) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٠٢٤٩، المطالب العالية لابن حجر: ٣٠٠٨، مسند الحارث، الرقم ٧٢٨، صصحه الألباني في السلسلة الصحيحة بشواهد، الرقم ٣٤.

(٣) المطالب العالية لابن حجر: ٤٢٣٨، مسند الطيالسي، الرقم ٢٦١٦.

(٤) المطالب العالية لابن حجر: ٤٢٤٧، مسندأبي يعلى الموصلي، الرقم ٢١٢٨، الشريعة للآجري، الرقم ١٩٢١، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ١٢٣١، الدعاء للطبراني، الرقم ١٩٩٠، ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٣١٥٧.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەمدی هۆشیاری دەدات لە باس نەکردنی هاوەڵان بە خراپەو، هەڕەشەش لەوانە دەکات، کە بە خراپە ناویان دەبەن، وەك دەفەرموێت: (دعوا أصهاري وأصحابي، فإنه من حفظني فيهم كان معه من الله حافظ ومن لم يحفظني فيهم تخلى الله منه، ومن تخلى الله منه يوشك أن يأخذه)[1]. واته: وازبهێنن لە خزمان و هاوەڵانم، چونکە هەر کەس من بپارێزێت سەبارەت بەوان، ئەوا لەلایەن خواوە پارێزەرێکی بۆ دەبێت، هەر کەسیش نەمپارێزێ سەبارەت بەوان، خوا وازی لێ دێنێ، هەر کەسیش خوا وازی لێ بهێنێ، نزیکە خوا بیگرێت).

هەروەها دەفەرموێت: (الله الله في أصحابي، لا تتخذوا أصحابي غرضا، من أحبهم فبحبي أحبهم، ومن أبغضهم فببغضي أبغضهم، ومن آذاهم فقد آذاني، ومن آذاني فقد آذى الله، ومن آذى الله يوشك أن يأخذه)[2].

(الله الله بۆ هاوەڵانم، هاوەڵانم مەکەنە ئامانج، هەر کەس هاوەڵانی منی خۆش بوێت، ئەوە بە خۆشەویستی منەوە ئەوانی خۆشویستووە، هەر کەسیش ڕقی لەوان بێت، ئەوە بەڕقبوونی لە منە ڕقی لەوان بووە، هەر کەس ئازاریان بدات، ئەوە ئازاری منی داوە، هەر کەسیش ئازاری من بدات، خوای ئازار داوە، هەر کەسیش خوا ئازاربدات، نزیکە خوا بیگرێت).

---

(١) المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٤٢٥٣.

(٢) صحيح ابن حبان، الرقم ٧٣٦٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٧٩، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٠٠٣٥ و ٢٠٠٦٤، مسند الروياني، الرقم ٨٦٢، شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ١٤٧٩، ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٢٩٠١.

## پلەو پایەی کۆچـەرانی حەبەشە (رضي الله عنهم)

لە صەحیحی بوخاریدا، فەرموودەیەك سەبارەت بە پلەوپایەی کۆچەرانی حەبەشە هاتووە، کە کاتێ هاتنەوە بۆ مەدینە، خەڵکێ لە کۆچەران پێیان دەوتن: پێش ئێوە کۆچمان کردووە بۆ مەدینە.

ئەسمائی کچی عومەیسیش، کە لەو کۆچەرانەی حەبەشە بوو، بە سەردان چوو بۆ لای حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، عومەر چوویە ژوورەوە بۆ لای حەفصەو، ئەسمائی لەوێ بینی.

بە حەفصەی وت: ئەو ئافرەتە کێیە؟

وتی: ئەسمائی کچی عومەیسە.

عومەر وتی: ئەمە حەبەشیەکەیە؟

ئەمە لەوانەی کەشتیەکەیە؟ (واتە: ئەو کۆچەرانەی بە کەشتی لە حەبەشەوە هاتبوون بۆ مەدینە).

دایکی باوەڕداران وتی: بەڵێ.

عومەر وتی: بە کۆچکردن پێشتان کەوتین، جا ئێمە لە ئێوە لەپێشتر و شیاوترین بە پێغەمبەری خوا.

ئەسمائیش تووڕە بوو، وتی: نە بەخوا، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوون و، نانی برسیتانی دەدا و ئامۆژگاری نەزانتانی دەکرد، بەڵام

ئێمە لە خاکێکی - یان وڵاتێکی- دوور و ناخۆش بووین لە حەبەشە، ئەوەش لەبەر خوا و لەبەر پێغەمبەرەکەی، سوێند بەخوا، نان ناخۆم و ئاو ناخۆمەوە، تا ئەوە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باس دەکەم، کە تۆ وتت.

ئێمە ئازارمان بەردەکەوتو دەترساین، دەچم، ئەوە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باس دەکەم و پرسیاری لێدەکەم، درۆش ناکەم و فێڵ ناکەم و کەم و زیادی بۆ ناکەم، ئەسما و چوو بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و مەسەلەکەی بۆ باسکرد.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: ئەی تۆ چیت پێ وت؟

وتی: ئاواو ئاوام پێ وت.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لیس بأحق بي منكم ، وله ولأصحابه هجرة واحدة ، ولكم أنتم - أهل السفينة - هجرتان. واتە: ئەو لە ئێوە شیاوتر نییە بە من، ئەو و هاوەڵانی یەك کۆچیان بۆ هەیە، ئێوەش - یارانی کەشتی - دوو کۆچتان بۆ هەیە!)[1].

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٠٤، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٦٢، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨١١٣، مسند أحمد بن حنبل، ألرقم ١٩٠٨٩، مسند أبويعلى الموصلي، الرقم ٧١٥١،

## پلەوپایەی کۆچەرانی مەدینە (رضي الله عنهم)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾[1].

هاوەڵە کۆچەریەکان، یەکەم دەستەن، کە ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز دەیانگرێتەوە، چونکە ئەوان یەکەم پەیڕەوکاری بوون.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾[2].

واتە: (خوای میهرەبان لەوانەی، کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و، خزمەتکردنی ئیسلامدا لە کاروانی کۆچەران و پشتیوانان و ئەوانەی، کە بەرێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون، کە چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا، بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، ئەوە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە).

---

(١) آل عمران: ١١٠.

(٢) التوبة: ١٠٠.

خوای گەورە وەسفی هەر سێ دەستەی کۆچەران و پشیوانان و ئەوانەی دوای ئەوانیش دەکات و دەفەرموێت:

﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾[1].

واتە: (هەروەها لەو دەستکەوتانە، بەشی کۆچبەرانی هەژار دەبێت بدرێت، ئەوانەی لە شوێنەوار و سامانیان دوورخراونەتەوە و دەرکراون، ئەوانەی بەتەمای بەخششی خوا و ڕەزامەندی ئەونو، بەبێ هیچ تەماعێك پشتیوانی لە خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەنو، هەوڵی سەرخستنی بەرنامەکەیان دەدەن، هەر ئائەوانە ڕاستگۆو ڕاستانن، ئەوانەی، کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد، بۆ پێشوازیی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت، کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەرونیاندا، جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلیەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا، هەرچەندە هەژارو نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن، ئەوانەش کە بە شوێن کۆچبەران و پشتیواناندا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دۆعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا! لە ئێمەو لە و برایانەشمان خۆش ببە، کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و، لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو

---

(١) الحشر: ٨-١٠.

کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا! تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندەو میهرەبانیت.

هەروەها خوای گەورە مژدەی لێخۆشبوونی خۆی دەدات بە کۆچەران و پشتیوانانیش:

﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾[1].

واتە:(سوێند بە خوا، بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەر و کۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی شوێنی پێغەمبەر کەوتن لە کاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبوکدا)، دوای ئەوەی، کە خەریك بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت و (بێزاری دەربڕێت)، لەوەودوا تەوبە و پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە، بە سۆز و میهرەبانە لەگەڵیاندا).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾[2].

واتە: ( بەڕاستی ئەوانەی، کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردووەو تێکۆشاون لە پێناوی ئایینی خوادا، بە خۆیان و ماڵ و سامانیانەوە، ئەوانەش کە پێشوازیان لە کۆچبەران کردو، لەماڵ و حاڵی خۆیاندا جێیان کردنەوەو پشتگیرییان کردن، ئا ئەوانە هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن).

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بەپاداشتی کۆچەران لە ڕۆژی دواییدا دەفەرموێت: للمهاجرين منابر من ذهب يجلسون عليها يوم

---

(١) التوبة: ١١٧.

(٢) الأنفال: ٧٢.

القيامة قد أمنوا من الفزع[1]. واتە: کۆچەران لە ڕۆژی دواییدا مینبەری لە زێڕ دروستکراویان هەیە، کە لەسەری دادەنیشن و لە ترس و بیمی ئەو ڕۆژەدا،پارێزراو و دڵنیا کراون).

هەروەها دەیفەرموو: ( لولا الهجرة لكنت امرأ من الأنصار، ولو سلك الناس واديا وسلكت الأنصار واديا - أو شِعَبا - لسلكتُ وادي الأنصار - أو شِعَب الأنصار[2]. واتە: ئەگەر کۆچ نەبوایە، بەدڵنیاییەوە من یەکێك دەبووم لە پشتیوانان، ئەگەریش خەڵکی دۆڵێ، یان شیوێ بگرنەبەرو، پشتیوانانیش دۆڵێ، یان شیوێ بگرنەبەر، بەدڵنیاییەوە من دۆڵ، یان شیوی پشتیوانان دەگرمەبەر).

ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بە فەزڵی کۆچەران و پشتیوانانیش، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئاماژە بەوە دەدات، کە لەبەر ئەوەی لە کۆچەرانە، بۆیە یەکێك لە پشتیوانان نییە، ئەمەش فەزڵێکی گەورەیە بۆ کۆچەران، هاوکات نیازبوون و ئەوپەڕی حەزلێبوونی، بۆ ئەوەی یەکێك بێت لە پشتیوانانیش، نیشانەی گەورەیی پشتیوانانە).

---

(١) صحيح ابن حبان، الرقم ٧٣٦٩، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٧٠٢٨، وقد صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٣٥٨٤.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٦٨٣٧، صحيح مسلم، الرقم ١٨٢٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢١٠١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٧٠١ و ١٣٣١٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٥٠٨،

## پلەو پایەی پشتیوانان
## (رضي الله عنهم)

خوای گەورە سەبارەت بە پلەوپایەی پشتیوانان هاودەم بە کۆچەران، فەرموویەتی:

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾[1].

واتە: (خوای میهرەبان لەوانەی، کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا، لە کاروانی کۆچەران و پشتیوانان و ئەوانەی، کە بە ڕێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون، کە چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا، بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، ئەوە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە).

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ﴾[2].

واتە: ( بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردووەو تێکۆشاون لە پێناوی ئایینی خوادا بە خۆیان و ماڵ و سامانیانەوە، ئەوانەش کە پێشوازیان

---

(١) التوبة: ١٠٠.

(٢) الأنفال: ٧٢.

لە کۆچبەران کردو لەماڵ و حاڵی خۆیاندا جێیان کردنەوەو پشتگیرییان کردن، تا ئەوانە هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾[1].

واتە: (سوێند بە خوا، بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەر و کۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر کەوتن لە کاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبوکدا)، دوای ئەوەی کە خەریك بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت و (بێزاری دەربڕێت)، لەوەودوا تەوبە و پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە بە سۆز و میهرەبانە لەگەڵیاندا).

خوای گەورە وەسفی هەر سێ دەستەی کۆچەران و پشیوانان و ئەوانەی دوای ئەوانیش دەکات و دەفەرموێت:

﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾[2].

---

(١) التوبة: ١١٧.

(٢) الحشر: ٨-١٠.

واتە: (هەروەها لەو دەستکەوتانە بەشی کۆچبەرانی هەژار دەبێت بدرێت، ئەوانەی لە شوێنەوار و سامانیان دوورخراونەتەوە و دەرکراون، ئەوانەی بەتەمای بەخششی خوا و ڕەزامەندی ئەون و بەبێ هیچ تەماعێك پشتیوانی لە خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵی سەرخستنی بەرنامەکەیان دەدەن، هەر ئائەوانە ڕاستگۆو ڕاستانن، ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت، کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەرونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلیەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژارو نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن، ئەوانەش کە بە شوێن کۆچبەهەران و پشتیواناندا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دۆعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمەو لە و برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا! تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندەو میهرەبانیت).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، سەبارەت بەبرایەتی نێوان کۆچەران و پشتیوانان و پلەوپایەیان دەفەرموێت: (المهاجرون و الأنصار بعضهم أولياء بعض في الدنيا و الآخرة و الطلقاء من قريش والعتقاء من ثقيف بعضهم أولياء بعض في الدنيا والآخرة[1].

واتە: کۆچەران و پشتیوانان لە دنیا و دواڕۆژدا، دۆست و هاودەمی یەکترن، تولەقای قوڕەیش و ئازاد کراوانی پەقیفیش لە دنیا و دواڕۆژدا دۆست و هاودەمی یەکترن).

---

(١) صحيح ابن حبان، الرقم ٧٣٦٧، مسندأحمد بن حنبل، الرقم ١٨٧٩٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم٢٢٣٦، المستدرك على الصحيحين، الرقم، و صححه الذهبي، كما صححه شعيب الارناؤوط.

پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، باس و خواسی ڕێز و گەورە سەیرکردنی تایبەتی هەیە، سەبارەت بە پشتیوانان، کە موسڵمانبوانی مەدینە بوون، ئەمانە بوونە پشت و پشتیوانی تەواوەتی، بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و برا کۆچەریەکانیان، هێندە ڕێزیان لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەورەبوو، کە دەیفەرموو: (آية الإيمان حب الأنصار وآية النفاق بغض الأنصار[1].

واتە: نیشانەی ئیمانداری خۆشەویستی پشتیوانانە و نیشانەی دوو ڕوویی ڕقبوونە لە پشتیوانان).

هەروەها دەیفەرموو: ( لولا الهجرة لكنت امرأ من الأنصار، ولو سلك الناس واديا وسلكت الأنصار واديا - أو شعبا - لسلكت وادي الأنصار- أو شعب الأنصار)[2].

واتە: (ئەگەر کۆچ نەبوایە بەدڵنیاییەوە من یەکێك دەبووم لە پشتیوانان، ئەگەریش خەڵکی دۆڵێ، یان شیوێ بگرنەبەر و پشتیوانانیش دۆڵێ، یان شیوێ بگرنەبەر، بەدڵنیاییەوە من دۆڵ، یان شیوی پشتیوانان دەگرمەبەر).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزای دەکرد بۆ پشتیوانان و دەیفەرموو: (اللهم أغفر للأنصار و لأبناء الأنصار وأبناء أبناء الأنصار[3].

واتە: خوایە! لە پشتیوانان و منداڵانی پشتیوانان و منداڵانی منداڵەکانی پشتیوانانیش خۆش بە).

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی نەخۆشی سەرە مەرگیدا، چوویە سەر مینبەر و بە هاوەڵانی فەرموو: (أما بعد، فإن الناس يكثرون ويقل

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ١٧ و ٣٥٩٦، صحيح مسلم، الرقم ١٣٣، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٠٥٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢١٢٧ و ١٢٠٧٣، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٥٠٨،

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٦٨٣٧، صحيح مسلم، الرقم ١٨٢٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢١٠١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٧٠١ و ١٣٣١٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٥٠٨،

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٤٦٦٥، سنن الترمذي، الرقم ٣٩٢١، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٣٨٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٨٧٠.

الأنصار، حتى يكونوا في الناس بمنزلة الملح في الطعام ، فمن ولي منكم شيئا يضر فيه قوما وينفع فيه آخرين ، فليقبل من محسنهم ويتجاوز عن مسيئهم[1].

واته: پاشان، خەڵكی زیاد دەكەن و پشتیوانان كەم دەكەن، تا ئەوەی لەناو خەڵكدا وەك خوێی ناو چێشتیان لێ دێت، دەی هەركامتان شتێكی گرتەدەست، كە تیایدا زیانی هەبێ بۆ خەڵكێ و سوودی هەبێ بۆ هەندێكی تر، با كاری چاكەكاری پشتیوانان قبووڵ بكات و چاوپۆشیش لەوەیان بكات، كە خراپەیەك دەكات).

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٩، ٣٦١٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٣٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١١٤٧١.

## پلەوپایەی بەشداربوانی
## بەدر (رضي الله عنهم)

هاوەڵانی بەشداربووی (بەدر)، یەکەم دەستەی پارێزەری ئایینی خواو موجاهیدی ناو ئیسلام بوون، ئەوان یەکلا کەرەوەی پێشڕەوی ئیسلام بون وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لە نزاکانی ڕۆژی بەدریدا دەیفەرموو: (اللهم إنك ان تهلك هذه العصابة لا تُعبد بعدها في الارض.

واتە: خوایە! ئەگەر تۆ ئەم دەستەیە لەناوبەریت، ئەوا ئیدی دوای ئەوە لەسەرزەویدا ناپەرسترێیت!).

بەڕاستی هێندە بەسە بۆ هاوەڵانی بەدر، کە پێغەمبەری خوا، وا لێیان ڕازی بێت و نزایان بۆ بکاتو، لەبەردەم خوادا ئەو شاهیدیەیان بۆ بدات، کە ئەمانە پایەی پارێزگاری ئایینی خوان، خوای گەورەش لە وەڵامی نزاکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، ئەم ئایەتانەی دابەزاند:

﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ الانفال: ٩-١٠.

واتە: کاتێ لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە، خواش وەڵامی نزاکەی دانەوەو بۆی گیراکردن، خوا فەرمووی: من یارمەتیتان دەدەم بە هەزار فریشتەی یەك بەدوای یەکدا هاتوو، خوا ئەمەی تەنها بۆ دڵخۆشی و مزگێنی ئێوە کردو،

هەروەها تا بەوە دڵەکانتان ئارام بگرن، سەرکەوتن تەنها لای خوایە، بەڕاستی خوا بەتوانا و دانایە).

دەستەیەك، کە خوای گەورە فریشتەی نارد بۆ پاڵپشتییان و ڕاشیگەیاند بۆ دڵخۆشی و دڵنیاکردنی دڵەکانی ئەوان، ئەو فریشتانەی ناردووە، ئیتر دەبێت، چ فەزڵێ گەورەتر لەومیان دەست بکەوێ؟!

لە فەرموودەیەکدا، کە (موعاذ) لە ریفاعەی باوکیەوە ( کە بەشداربووی (بەدر) بووە) دەیگێڕێتەوە، دەڵێت: جبریل (علیه السلام) هات بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و، پێی فەرموو: (بەشداربوانی بەدر لەنێوتاندا چۆن سەیر دەکەن؟).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لە بە فەزلترینی موسڵمانانن)، یان وتەیەکی هاوواتای ئەوە.

جبریلیش فەرمووی: (بۆ فریشتە بەشداربووەکانی بەدریش هەر وایە)[1].

جبریل (علیه السلام) لەگەڵ بەشداربوانی (بەدر)دا بەشداری ئەو غەزایەی کردو،[2] بە فەرمانی خوا لە گەڵ فریشتەکانی تردا، هاو ڕیزی موسڵمانان جیهادیان کرد.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ڕێزێکی زۆری بۆ هاوەڵانی بەدر هەبوو، تەنانەت چاوپۆشی دەکرد لە هەندێ هەڵەیانو، وایشی فێری هاوەڵانی تر دەکرد، تا ئەو چاوپۆشیە و ڕێزەیان هەبێت بۆ هاوەڵانی بەدر، وەك لە ڕووداوەکەی (حاطبی کوڕی ئەبی بەلتەعە)دا هاتووە، کاتێ (حاطب) هەواڵی پلانی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بە نهێنی نارد بۆ قوڕەیشو، دواتر کارەکەی ئاشکرا بوو و (حاطب) هێنرایە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٩٠.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٩٢.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پرسیاری لێکرد بۆ وایکردووە؟

وتی: لەبەر گیانی خۆی، نەك لەبەر هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام!

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ڕاستی پێ وتن.

عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێمگەڕێ، با لەگەردنی بدەم ئەو دوو ڕووە.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ( إنه قد شهد بدرًا، وما يدريك لعل الله أن يكون قد اطلع على أهل بدر فقال : اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم[1]. واتە: ئەو، بەشداری (بەدر)ی کردووە، تۆ چووزانیت، بەڵکو خوا ئاگادارە بە بەشداربوانی ( بەدر) بۆیە پێی فەرموون: چیتان ئەوێ بیکەن، من لێتان خۆش بووم).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کە گوێی لە پۆزشەکەی بوو، فەرمووی: (لا تقولوا له إلا خيرا[2]. واتە: تەنها قسەی چاکی بەرامبەر بڵێن).

لە گێڕانەوەیەکی تردا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، مزگێنییەکە بۆ ئەهلی (بەدر) ڕوونتر دەکاتەوەو هاتووە،کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە عومەری فەرموو: ( صدق يا عمر! أو ليس قد شهد بدراً، لعل الله اطلع إليهم فقال: اعملوا ما شئتم فقد وجبت لكم الجنة[3]. ڕاستی وت ئەی عومەر! مەگەر ئەو بەشداری بەدری نەکردووە؟! بەڵکو خوا ئاگادارە بە بەشداربوانی (بەدر)

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٨٦٦ و ٢٩٣٢ و ٤٠٣٧، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٥٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٥٩٢، سنن أبي داود، الرقم ٢٢٩٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٣١٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١١١٣٥، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٧١٣٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٨٠ .

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٨٢.

(٣) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٨٠٢، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣٧٩، الأدب المفرد للبخاري، الرقم ٤٥٣، و صححه الألباني في صحيح الأدب المفرد، الرقم ١٨١.

و بەوانی فەرموو: چی دەکەن بیکەن، من بەهەشتم واجب کرد بۆ ئێوە)، ئیتر چاوەکانی عومەر فرمێسکیان لێڕژا و وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، تەنانەت ڕێی نەداوە، هاوەڵانی خۆی قسە لەسەر هاوەڵانی بەدر بکەن، ئەوەتا کاتێ خالیدی کوڕی وەلید، کە بەشمشێری هەڵکێشراوی خوا ناسراوە، دڵی (عبدالرحمن ی کوڕی عەوف)ی ئازارداو، (عبدالرحمن)یش سکاڵای خۆی بردە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە خالیدی فەرموو: (لم تؤذي رجلا من أصحاب بدر، لو أنفقت مثل أحد ذهبا لم تدرك عمله[1]. واتە: بۆچی ئازاری یەکێ لە بەشداربوانی بەدر دەدەیت؟ ئەگەر هێندەی شاخی ئوحود زێڕ ببەخشیت،ناگەیتەوە بە کردەوەی ئەودا !).

---

(١) صحيح ابن جبان، الرقم ٧٢٠٠، المعجم الصغير للطبراني، الرقم ٥٨١، البحر الزخار مسند البزار، الرقم ٢٨٥٠، وقد صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ١٩٢٣.

## پلەوپایەی هاوەڵانی

## بەشداربووی تەبوك (رضي الله عنهم)

جەنگی تەبوك، کە لە قورئاندا بە (ساعە العسرە) ناوی هاتووە، بەشدارییەکی زۆری هاوەڵانی بەخۆوە دی، بەجۆرێ دواکەوتنی سێ هاوەڵ لەو جەنگەدا، بوویە هۆکار، تا خوا، سزای ئەو سێ کەسە بداتو، دواجار پاش ماوەیەکی زۆر، ئینجا لێیان خۆش بوو،وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾.(١)

واتە: سوێند بە خوا، بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەر و کۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی، کە شوێنی پێغەمبەر کەوتن لە کاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبوك دا)، دوای ئەوەی، کە خەریك بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت و (بێزاری دەربڕێت)، لەوەودوا تەوبە و پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە بە سۆز و میهرەبانە لەگەڵیاندا).

---

(١) التوبة: ١١٧.

## پلەوپایەی هاوەڵانی
## پێش فەتحی مەککە و پاش فەتح
## ( رضي الله عنهم )

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ ﴾[1].

واتە:(یەکسان نین لە ئێە ئەوانەتان، کە پێش فەتحی مەککە بەخشیتان و جەنگتان کرد، ئەوانەپاداشتیان زۆر گەورەترە لەوانەی دوای فەتحی مەککە بەخشییان و جەنگیان کرد، هەمووشیان- هەموو هاوەڵان — خوا، بەڵێنی چاکەی پێداون، خواش زانا و ئاگادارە بەوەی دەیکەن).

ئەگەرچی هاوەڵانی پێش فەتحی مەککە، پاداشتیان زۆر زیاترە، بەڵام خوا بەڵێنی چاکەی داوە بە هەردوو دەستەکە، بۆیە قسەکردنی هەندێ دەستە، لەسەر هاوەڵانی پاش فەتحی مەککە و تانەلێدانیان لە گەمژەیی عەقڵیان، یان بێمتمانەبوونیانە بەڕاستی قورئان، ئەگەرنا چۆن دەوێرن بەرامبەر بەڵێنی خوا بدوێن، کاتێ دەفەرموێت: (وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ؟ ئەو هاوەڵانە بەڕاستی باوەڕیان هێنا و بوونە هاوەڵ و خزمەتی گەورەیان بە ئیسلام کردو، بەشداری سەنگەر و مینبەرەکانیش بوون، چەندێکیان شەهید بوون.

---

(١) الحدید: ١٠.

هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، سەبارەت بەبرایەتی نێوان کۆچەران و پشتیوانانو، نێوان هاوەڵانی دوای فەتحی مەککە و پلەوپایەیان دەفەرموێت: ( المهاجرون و الأنصار بعضهم أولياء بعض في الدنيا و الآخرة و الطلقاء من قريش و العتقاء من ثقيف بعضهم أولياء بعض في الدنيا و الآخرة[1].

واتە: کۆچەران و پشتیوانان لە دنیا و دوارۆژدا دۆست و هاودەمی یەکترن، تولەقای قورەیش و ئازادکراوانی پەقیفیش لە دنیا و دوارۆژدا دۆست و هاودەمی یەکترن).

---

(١) صحيح ابن حبان، الرقم ٧٣٦٧، مسندأحمد بن حنبل، الرقم ١٨٧٩٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم٢٢٣٦، المستدرك على الصحيحين، الرقم، و صححه الذهبي.

## عـەداڵـەتـی هـاوەڵان

ئەهلی سوننەو جەماعە پێیان وایە: هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مەرجی عەدالەتیان تێدایە، لەمەوە بەجێگەیاندنی فەرزەکان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان بەرهەم دێت، بەدوایدا پەیڕەوی کارە چاکەکان و دوورکەوتنەوە لە کارە ناحەز و سووکەکان دێت.

بە واتایەکی تر، عەدالەت بەواتای: دروستی پەیوەندی نێوان تاك و خودای گەورە و، پەیوەندی نێوان تاك و بەندەکان دێت.

(ئیبن حەجەر) دەڵێت: (اتفق أهل السنة على أن الجميع عدول ولم يخالف في ذلك إلا شذوذ من المبتدعة[1]. واتە: ئەهلی سوننە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، هەموو هاوەڵان عەدالەتیان هەیە و کەس لەوەدا ڕاجیا نییە، جگە لە بڕێکی زۆر کەمی بیدعەچییان).

(ئیبن عەبدولبەر) دەڵێت: (إجماع أهل الحق من المسلمين وهم أهل السنة والجماعة على أنهم كلهم عدول[2]. واتە: یەکدەنگی ئەهلی حەق و ڕاستی موسڵمانان، کە ئەهلی سوننە و جەماعەیە ئەوەیە: هاوەڵان هەموویان عەدالەتیان هەیە).

ئەو ئایەت و فەرموودانەش، کە سەبارەت بە پلەوپایەی هاوەڵان باسمانکردن، بەڵگەن بۆ عەدالەتی هاوەڵان.

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٠.

(٢) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩.

**لەڕاستیدا سێ وشە هەن، کە پێویستە وریا بین تێکەڵیان نەکەین و واتای هەرکامیان بزانین:**

**١-هـەڵـە:** ئەمە هەموو مرۆڤێکی سەرزەوی پشکی هەیە تیایدا، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (كل بنو آدم خطاء و خير الخطائين التوابون[1]. هەموو ئادەمیزادێك هەڵەکارە، چاکترینی هەڵەکارانیش ئەوانەن، کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا).

بەڵام ئەمەش دوو جۆری هەیە: جۆرێکیان بە ئەنقەستە، کە ئەمە تاوانە، واتە: سزای لەسەرە، جۆری دووەمیان بە ئەنقەست نییە، ئەمەیان بۆ خەڵکی ئاسایی، ئومێدی لێخۆشبوونی خوایی هەیە، بەڵام بۆ پێغەمبەران ئیجتیهاد بووە، واتە: تاکە پێغەمبەرێك نییە نیازی خراپی هەبوویێت لە هەڵەیەکدا، کە کردوویەتی، بەڵکو ئیجتیهادێکی کردووەو نەیپێکاوە، هەروەها ئەمە بۆ موجتەهیدانی ناو ئوممەتی ئیسلامیش هەیە، وەك پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ( إذا حكم الحاكم فاجتهد ثم أصاب فله أجران، وإذا حكم فاجتهد ثم أخطأ فله أجر[2]. واتە: ئەگەر حاکم حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد، دواتر پێکای ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر حوکمی کرد و ئیجتیهادی کردو، دواتر نەیپێکا و هەڵەی کرد، ئەوە پاداشتێکی بۆ هەیە).

**٢-عیصمەت:** ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەرانی خوا، کە خوای گەورە هەرچی نیازێکی خراپە هەیە، لە دڵیاندا دەریکردووەو تەواوی نیاز و کاریان تەنها و

---

(١) سنن الترمذي، الرقم٢٤٨٣، سنن ابن ماجة ٤٢٤٨ ، الرقم، المستدرك على الصحيحن، الرقم٧٦٨٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم١٢٧٩٥، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم٢٨٥٢، سنن الدارمي، الرقم ٢٦٨٠،حسنه الألباني في الجامع الصغير وزيادته، الرقم ٨٦٤٤.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٦٩٣٩، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٢٦، سنن أبي دواد، الرقم ٣١٢٠، سنن ابن ماجة، الرقم ٢٣١١، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٧٤٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٧٤٤٠، مسند الشافعي، الرقم ١١٢٨، صحيح ابن حبان، الرقم ٥١٣٨، سنن الدارقطني، الرقم ٣٩٢٠، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٨٩٣٣، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٣٢٦٧.

تەنها، بۆ خواو لەبەر خوایە، ئیتر ئەوان پارێزراو(معصوم)ن لە نیازی هەر کارێکی خراپ.

**٣-عەدالەت:** ئەمە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەگرێتەوە، جگە لە هاوەڵانیش دەگرێتەوە، واتە: ئەوانەی بە رێی هاوەڵاندا هەنگاو بنێنو، بەپێی قورئان و سوننەت بجوولێنەوەو هەڵسوکەوت بکەن، بەویستی خوا مەرجی عەدالەت دەیانگرێتەوە، ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەوەیە هەموو هاوەڵان عەدالەتیان هەبووە.

## بڕوای ئەهلی سـوننە و جەماعە
## سـەبارەت بە هـاوەڵان

ئەهلی سوننە و جەماعە پێیان وایە: هاوەڵان هەموویان خاوەنی عەدالەت بوون و، کەسانی دڵسۆز بۆ ئایینی خوا و دڵسۆزانی دەوری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوون، پێیان وایە: قسەوتن بە هاوەڵان لە تاوانە گەورەکانەو، سنووری هاوەڵان هێڵی سوورەو نابێت ببەزێنرێ.

هەروەها پێیان باشە لە فیتنەی نێوان هاوەڵاندا، دەمیان ڕاگرن و هیچ نەڵێن، چونکە بڕوایان وایە: هاوەڵان دڵسۆز و خواناس بون، ئەوەیش لەنێوانیاندا ڕوویداوە، ئەنجامی ئیجتیهادە جیاجیاکانیانە، بۆ خزمەت بە ئیسلام و قۆستنەوەی بارەکەیە لە لایەن ناحەزانی ئیسلامەوە.

هەروەها سەردەمی هاوەڵان بە چاکترین سەردەم دەزاننو، هاوەڵان بە پێشەنگ دەزانن بۆ خۆیان، بۆ ئەمەش، چەند نموونەیەکی وتەی زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە دەخەینەڕوو:

ئیمامی نەوەوی دەڵێت:(بزانە! قسەوتن بە هاوەڵان حەڕامەو لە هەرە ناشیرینترینی حەڕامەکانە، ئیتر قسەوتن بێ بەو هاوەڵانەی لە ڕووداوەکانی فیتنەی نێوان هاوەڵاندا هەبون، یان جگە لەوان بن، چونکە ئەوانە موجتەهید بوون لەو جەنگانەدا).[1]

---

(١) النووي: المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، ط٢، دار إحياء التراث العربي(بيروت-١٣٩٢هـ)، ج١٦، ص٩٣.

شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیەش دەڵێت:(ئەركی سەرشانمانە، هاوەڵانی پێغەمبەری خوامان خۆش بوێن، لەبەر ئەوەی خوا ستایشی کردون، چونکە بڕوایان بە خوا هەبووە، پێغەمبەری خوایان بە ڕاست زانیوە و سەریانخستووە، چونکە خوا بەجیهادی ئەوان لە ڕێی سەرخستنی ئایینی ئیسلامدا، ئێمەی سوودمەند کردووە، ئەو ئایینەی، کە خوا ئێمەی پێ منەتبار کرد، ئەو هاوەڵانە بە پاك و پوختی گەیاندیان بە ئێمە).[1]

(ئیبن حەجەر) دەڵێت: (ئەهلی سوننە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، هەموو هاوەڵان عەدالەتیان هەیەو، کەس لەوەدا ڕاجیا نییە، جگە لە بڕێکی زۆر کەمی بیدعەچییان).[2]

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت:(یەکدەنگی ئەهلی حەق و ڕاستی موسڵمانان، کە ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە هاوەڵان هەموویان عەدالەتیان هەیە).[3]

---

(١) ابن تيمية: الفرقان بين أولياء الرحمن و أولياء الشيطان، المكتبة الشاملة، ص٢٠٥.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٠.

(٣) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩.

## فیتنەی نێوان هاوەڵان
## (رضي الله عنهم)

وەك وتمان: هاوەڵان ئەو دەستەیە بوون، کە دەیان ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەچاکە وەسفیان دەکەن، ڕەزامەندی خوا و سەربەرزی و دڵخۆشی ڕۆژی دوایی و، موژدەکانی قورئان و سوننەت بوون بۆ هاوەڵان، بۆیە قسەکردن لە سەر مەسەلەکانی پەیوەست بە هاوەڵان، وریاییەکی زۆری دەوێت.

یەکێك لەو مەسەلانەی، کە بوەتە باسی ڕەخنەگرتنی ناحەزانی ئیسلام و ڕۆژهەڵاتناسانو، کەسانێکی ناو ئوممەتی ئیسلامیش بریتییە لە: ڕەخنەگرتنیان لە فیتنەی نێوان هاوەڵان، ئەمانە لە چەند ڕوویەکەوە هەوڵ دەدەن ئەو مەسەلەیە زەق بکەنەوە:

**یەکەم:** دووبارەکردنەوەی گێڕانەوە ناڕاستەکانو، هەوڵدانی تەواو بۆ بەڕاست دانانی ئەو گێڕانەوە ناڕاستانە، هێندە لە نووسینە جیاجیاکان و گوتار و مشتومڕەکانیاندا دەیان لێنەوە، تا وادەکەن خەڵکێکی زۆر بە ڕاستیان بزانن، بێئەوەیتوێژینەوەیەکی بنچینەیی بکەن بۆ گێڕانەوەکان.

**دووەم:** زێدەکاری بۆ گێڕانەوەکان، بۆ نموونە: زیادکردنی ژمارەی کوژراوەکان بەجۆرێ، ئەگەر بڵێین: سەد قات زیاتر نووسراوە ڕاستە.

**سێیەم:** نیازخراپی لە لێکدانەوەکانیاندا، بەجۆرێ هەموو هەوڵ و هەنگاوێکی هاوەڵان دەکەنە تەمای سیاسی، نەك ئیجتیهادێك، ئیتر وا باسەکە دەخەنە ڕوو، کە گوایە هەموو ئەو بارە، هەوڵی دەستخستنی دەسەڵات بووە.

**چوارەم:** چاوپۆشی لە ڕۆڵە دەرەکییەکانی وەك: ڕۆڵی سەبەئییەکان، ئەسڵەن بەجۆرێ حاشای لێ دەکەن، وەك ئەوەی بڵێی، هەرچی سەرچاوەی مێژوویی هەیە بەوانەشەوە، کە ئەوان دڵیان پێ خۆش دەکەن، درۆزن بون و بوختانیان بۆ سەبەئیە کردووە.

**ئامانجیشیان لەمە چەند شتێکە، لەوانە:**

**یەکەم:** هەوڵی ڕەشکردنی ئەزموونی پێشینەی هاوەڵان، تا بڵێن: ئەوانی ئەمەیان کرد لە ڕابردووشدا بۆیان بگونجایە، هەر وایان دەکرد، واتە: تا بڵێن: هەردەم نیازی هاوەڵان دەسەڵات ویستی بووە، بە واتایەکی تر، دەیانەوێ بڵێن: هاوەڵان لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دوو ڕوو بوون.

**دووەم:** هەوڵی گومان خستنە سەر ڕاستی قورئان و فەرموودە، تا بڵێن: ئەم کەسانەن قورئان و فەرموودەیان نەقڵ کردووە، بۆیە دەکرێت بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری ئەو دوانەیان کردبێت.

**سێیەم:** گومان خستنە سەر بیروباوەڕی موسڵمان، بەرامبەر بە زانایی پەروەردگاری بە غەیب، وەك بڵێن: خوایەك کە ڕەزامەندی خۆی بۆ ئەو هاوەڵانە دەربڕی، دواتر هاوەڵان کەوتنە وێزەی یەکتر و خوێنیان ڕشت.

**چوارەم:** تا ئەو پەیامەی خۆیان بسەلمێنن،کە هاوەڵان چاکترین دەستە نەبون، بەڵکو ئەوانیش وەك هەر خەڵکێکی تر وابوون و، هیچ جیاوازیەکیان نەبووە.

**پێنجەم:** تا لێرەوە بڵێن: موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) سەرکەوتوو نەبووە لە گەیاندنی پەیامەکەی و پەروەردەکردنی دەورووبەریدا، تەنانەت قسەبکەن لەسەر چاکی و کەسایەتی پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم).

بەڵام ئەهلی سوننەو جەماعە، بەردەوام ئەو هەوڵانەیان پووچەڵ کردوونەتەوە و ڕاستیەکانیان خستووەتەروو، هەرچەندە کینەلەدڵان، ئەگەر بچنەوە ئەو بارەو، بەچاوی خۆیان بارەکە ببینن، هەر هەمان ڕای خۆیان هەیە، یان دەبوونە هاریکاری سەبەئی و خەواریجەکان.

**دەبێت بەم شێوەیە، بڕوانینە فیتنەی نێوان هاوەڵان:**

١- هاوەڵان نیازیان پاك بووە، ئەوەی كردوویانە نیازی خراپە نەبووە، چونكە زۆرێك لەوانەی بەشدار بوون، لە بەیعەتی ریضواندا هەبوون، كە خوا ڕەزامەندی خۆی بۆیان دەربڕی، مەسەلەكە ڕاجیایی هاوەڵان بوو بۆ چارەسەری كێشەیەك، كە ناحەزانی ئیسلام هەڵیانگیرساندبوو.

٢- ڕێبەرانی هەردوو دەستەی هاوەڵان موجتەهید بون، ئیمامی عەلی (رضي الله عنه) موژدەپێدراوی بەهەشتو، زانایەكی هەڵكەوتە و كەسی نزیكی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، تەلحە و زوبەیریش (رضي الله عنهما) موژدەپێدراوانی بەهەشتو، هاوەڵانی دڵسۆزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و زانایانی ئوممەت بون، دایكمان عائیشەش (رضي الله عنها)، خۆشەویستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و، كچی ڕاستگۆ و گەورەی هاوەڵان و یەكەم خەلیفەی موسڵمانانو، زاناترین ئافرەتی ناو ئوممەتی ئیسلامی بووە، دەی دەكرێ كەسانێك خوا بەهەشتی بڕیبێتەوە بۆیان، هێندە نیازیان پیس بن؟! (پەنا بەخوا لە وتەی وا).

٣- ڕوودانی جەنگ و ناكۆكی لەنێوان موسڵماناندا، كۆتا هێڵی سوور نییە، بەڵكو چاوەڕوانكراوە، وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی كردووە:

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓاْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ ﴾[1]

هەر بۆیە لە (جەنگی جەمەل)دا هەردوو لا ڕێككەوتن، بەڵام شەو، دوڕووە زیان بۆ ماوەكان، جەنگەكەیان هەڵگیرساند.

---

(١) الحجرات: ٩.

٤- ئەو ژمارە زۆرەی سەبارەت بە کوشتاری نێوان هاوەڵان باس دەکرێ، ناڕاستییەکی تەواوە و ڕێژەکە زۆر کەمترە لەوەی باسکراوە، بەڵکو زۆرێك لە هەوادارانی دواتری لایەنە سیاسیەکان، گێڕانەوەیان بۆ ئەو ڕووداوانە زیاد کردووە.

## چۆن بڕوانینە هـاوەڵان
## (رضي الله عنهم)

بەگشتیی چەند خاڵێك دەخەینەڕوو،تا بزانین بە چ چاوێك تەماشای هاوەڵان بکەین، چونکە زۆر کەس، کە حوکمی ناحەق دەدەن بەرامبەر بە هاوەڵان، لە نەبوونی پێوەرێکی ڕەوایە لەلایان، ئیتر یان زێدەڕۆیی دەکەن، یان کەمتەرخەمی دەنوێنن، مەرجیش نییە ڕوانین بۆ هاوەڵانن تەنها لەم خاڵانەدا کۆبکرێتەوە:

**یەکەم: هاوەڵان دەستەی بنەڕەتی پەیوەست بە دینی ئیسلامن:**

چونکە ئەوان خوێندکاری خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و دەستەگوڵی پەروەردەی نێردراوی خوان، بۆیە ئەگەر بوترێت: پۆلی هاوەڵان کەوتوون و لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچون، دروستکردنی نیشانەی پرسیارە، لەسەر خودی کەسێتی و توانا و گەیاندنی پەیامی پێغەمبەرێتی پێغەمبەری خوا.

هەروەها ئەوان نووسەرەوەی قورئان بوون، ئەو قورئانەی ئێستا لەبەردەستی هەمواندایە، لە دڵ و دەست و دەمی هاوەڵانەوە وەرگیراوە، ئەوان قورئانیان لە دڵەکانیاندا دەپاراست و بە دەست دەیانخستە سەر پەڕەکان و، بە دەم دەیانگەیاند و بە کردەوەش پەیڕەویان دەکرد، بە هەمان شێوەش هەمان ئەرکیان بەرامبەر بە فەرموودە بەجێگەیاند، تەنها هێندە نەبێت، نووسینەوەی فەرموودەیان پەیڕەو نەدەکرد، زیاتر گرنگییان دەدا بە گەیاندنی بە زارەکیی و کردەیی.

جا ئەگەر کەسێك بیەوێت هاوەڵان بشکێنێت و تانەیان لێبدات،ئەوا تانەی داوە لە قورئان و فەرموودەش، چونکەسەرچاوەی گەیاندنی قورئان و فەرموودە

بەخەڵکی دی هاوەڵان بوون، جا ئەگەر ئەوان خراپ و ناڕاست بووبن، چۆن دەکرێت بە چاکی و دروستی هەموو سەرچاوەکانی نەقلیان(قورئان و فەرموودە) بەوپەڕی دروستییەوە گەیاندبێت، ئەمەش واتە: تێکشکاندنی قورئان و سوننەت!

هەروەها هاوەڵان گەیەنەری دین و ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکانی ئیسلام بون، ئەوان چ بە فەتحی خاك و ناوچەکان و، چ بە فەتحی دڵان، ئیسلامیان بە سەر زەویدا بڵاوکردەوەو گەیاندیان بە مرۆڤایەتی، هەر ئەوان لە ئەلف، تا یێ، ئیسلامیان بۆ خەڵك باسکرد، چونکە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)، تا مابوو ئەوانی فێرکرد، ئیتر دوای وەفاتی، ئەوان لەبری پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دینیان دەگەیاند، گەیاندنێ بێ زێدەکاریی و بەوپەڕی پاراستنەوە.

بۆیە دەبینین شکاندنی هاوەڵان و تانەلێدانیان، واتە: شکاندن و تانەدان لە هەموو پایەو بنەڕەتەکانی ئیسلام:( قورئان، فەرموودە، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، ئەزموونی باڵای ئیسلامی...).

ئەگەر حەواریەکانی پێغەمبەر عیسا، سەرمەشقی باڵا بن بۆ ئایینی مەسیحیەت، ئەوا هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) سەرچاوەو سەرمەشقی باڵان بۆ موسڵمانان.

لەوانەیە کەسێك، کە هاوڕایە بە پارێزراوی قورئان، بەڵام هاوڕا نییە بە عەدالەت و گەورەیی هاوەڵان، بڵێت: ئاخۆ خوا خۆی بەڵێنی پاراستنی قورئانی داوەو فەرموویەتی: (إنا نحن نزلنا الذكر و إنا له لحافظون)، قسەکەی زۆر دروستە، کە وایە قورئان پارێزراوە، بەڵام لەوەدا تێکەوتووە، کە هۆکاری پاراستنەکە لەبەرچاو ناگرێت، دەی هەر هاوەڵان ئەو هۆکاری پاراستنە بون، ئەگەرنا، ئەم ئایەتەش هەر هاوەڵان تۆماریان کردووە، یان بەدەستی ئەوان نووسراوەتەوە، یان لەسەر زاری ئەوانەوە خراوەتە سەر پەڕاو.

بۆیە ئەگەر هاوەڵان توانیبێتیان لادان لە هەر بەشێکی ئیسلامدا دروست بکەن، دەکرێت ئەو گومانەشیان لێ بکرێت،کە ئەو ئایەتەشیان لەخۆوە دانابێت،

دەی ئەزموونی ئیعجازی قورئانی، پارێزراوی قورئانی سەلماندووە، ئەمەش سەلماندنی دەست و دەم و دڵ پارێزی هاوەڵانە.

بە پوختی لێدانی هاوەڵان، واتە: لێدانی هەموو سەرچاوە بنەڕەتییەکانی ئیسلام و هەڵوەشاندنەوەی وردو درشتی ئەو ئیسلامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، لە خوای گەورەوە وەریگرتووەو گەیاندوویەتی.

## دووەم: هاوەڵان دەستەی شایەتی بۆ دراون:

هاوەڵان ئەو دەستەیەن، کە خوای گەورە لە چەندین شوێنی قورئاندا شایەتی بۆ داون، لێیان ڕازی بووە، وەسفی کردون، ئایەتی لەبارەوە دابەزاندون، بە هاودەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) باسی کردون، ئەوانەن، کە بەڵێنی چاکەو بەهەشتی پێداون، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لە فەرموودەدا، دەیان جار وەسفی کردون و لێیان ڕازی بووەو، شایەتی ڕاستگۆیی و چاکەی بۆ داون.

دەی ئەم تایبەتمەندییە زۆر ناوازەیە، کە کەسانێك لە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی ئیسلامدا شایەتییان بۆ درابێت، ناکرێت کەسانێك، خوا لێیان ڕازی بووەو لە قورئاندا ئەوەشی تۆمارکردبێت و، بەڵێنی چاکەی بۆ دابن، ئێمە بەڵێنی خراپەیان بۆ دابنێین و لێیان ڕازی نەبین، پێشتر چەندین ئایەت و فەرموودەمان لەبارەی پلەوپایەی هاوەڵانەوە هێناوەو، دەکرێت بە خوێندنەوەی ئەم خاڵە ئەو ئایەت و فەرموودانە بێنینە بەرچاو.

## سێیەم: هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مرۆڤ بون:

ئەوان نە لە مرۆڤ زیاتر بون، نە لە مرۆڤ کەمتر بون، مرۆڤ بوونیش، واتای کەمی و نزمی ئاستی ئەو کەسە ناگەیەنێت، بەڵکو مرۆڤ بوون لە ئیسلامدا، پلەیەکی بەرزەو جێی شانازیە، ئەوەتا لە قورئاندا هاتووە:

﴿ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَمَا كَانَ لَنَا أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَانٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ﴾.

واتە: پێغەمبەرەکانیان پێیان وتن: ئێمە هەر ئادەمیەکین وەکو ئێوە، بەڵام خوا منەت دەنێ بەسەر هەر کام لە بەندەکانیدا، کە بیەوێ (دەیکاتە پێغەمبەر)، ئێمە هەرگیز ناتوانین موعجیزە و بەڵگەیەکتان بۆ بێنین، مەگەر بە ئیزنی خوا، با بڕواداران پشت هەر بە خوا ببەستن).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴿١١٠﴾ ﴾.

واتە: بەڵام سروشم بۆ دێت بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە پەروەردگارێکی تاك و تەنیایە، جا هەر کەس بەتەمایە بەخزمەت پەروەردگاری بگات (لە قیامەتدا)، ئەوە با کردەوەی چاك بکات، وەك لە پەرستنی پەروەردگاریدا کەس نەکات بەهاوبەشی).

جا کاتی خۆیشی کۆمەڵێك کاڵفام هەبوون، کە پلەی مرۆڤبوونیان لەلا کەم و بێبایەخ بوو، بۆیە وەك تانەیەك لە پێغەمبەران، دەیانوت: جا خۆ ئەوانەش مرۆڤن، وەك ئەوەی مرۆڤبوون بەهای ئەوەی نەبێت پێغەمبەرایەتی بۆ ببێت، مرۆڤبوون نەك شانازیەکە بۆ هاوەڵان، سەروەریەکە، پێغەمبەران شانازییان پێوەکردووە، خوای گەورە نموونەی وتەی ئەو کەسانەمان بۆ دەخاتەڕوو و دەفەرموێت:

﴿ فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَوْمِهِ مَا هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: جا وتیان: ئەو پیاو ماقوڵانەی، کە بێ باوەڕ بوون لە هۆزەکەی (نوح)، ئەم (نوح)ە، تەنها کەسێکە وەك ئێوە دەیەوێت خۆی بکاتە گەورە بەسەرتانەوە،

ئەگەر خوا بیویستایە (پێغەمبەرێك بنێرێ) فریشتەی دەنارده خوارەوە، ئێمە شتی وامان نەبیستووە لە باوو باپیرە پێشووەکانمانەوە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَـٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَـٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

واتە: پیاو ماقوڵانی گەلەکەی (هود( علیه السلام)) وتیان: ئەوانەی، کە بڕوایان نەهێناو بێ باوەڕ بوون بە دیداری ڕۆژی دوایی و، لە ژیانی دنیادا نازو نیعمەتمان پێدابوون (وتیان) ئەمە هەر مرۆڤێکە وەك ئێوە، لەوەی ئێوە دەیخۆن دەخوات، لەوەی ئێوە دەیخۆنەوە دەخواتەوە).

دەی مرۆڤیش وەك هەر کاڵایەك، ئاستی نزم و مامناوەند و باڵای هەیە، هەرچەندەش لەوبەڕی ئاستی باڵادا بیت، هەر هەڵەو نەپێکان لە ئەزموونی مرۆییدا هەیە، خوای گەورە وا مرۆڤی دروست کردووە، کە هەڵە دەکات، سەروخواری هەیە، لادانی هەیە، تاوان دەکات، بەڵام ڕێژەی لادان و تاوان و ئاستی مانەوە تیایدا و پلەی نەگەڕانەوەو تەوبەنەکردنە، کە ئاستی مرۆڤەکە دیاری دەکات، هەیە تا ئەوبەڕی خراپە دەڕوات و ڕێگەی گەڕانەوەش دادەخات، ئیتر وای لێدێت، خوا وا وەسفی دەکات:

﴿ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَـٰمِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ ﴾.

واتە: ئایا وا دەزانی زۆربەی ئەوانە دەبیستن، یا تێدەگەن، ئەوانە هەر وەك ئاژەڵن، بەڵکو ئەوان گومڕا تریشن).

هەیانە تا ئەوبەڕی چاکەکاری دەڕوات و، ڕێی بەرەو خراپەچوون لەخۆی دادەخات، وای لێدێت خوا لێی ڕازی دەبێت:

﴿ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾.

واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئەمە ڕۆژێکە، ڕاست بێژان ڕاستییەکەیان کەڵکیان پێ دەگەیەنێ، بەهەشتانێکیان بۆ هەیە، کە ڕووبارەکان بە ژێریاندا دەڕۆن، تیایدا ئەمێننەوە بە هەمیشەیی، خوا ڕازی بووە لێیان و ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون،ئائەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە!).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچەران و یاریدەدەران، ئەوانەش زۆر بەچاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە و شوێنیان کەوتوون، خوا لێیان ڕازییە، ئەوانیش لەخوا ڕازین،(خوا) بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون، ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریانداو تێیدا دەمێننەوە بێ برانەوە، ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (كل بنو آدم خطاء و خير الخطائين التوابون)[1]، (هەموو ئادەمیزادێ هەڵەکارە، چاکترینی هەڵەکاریش ئەوانەن، کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا).

بەڵام ئەمەش دوو جۆری هەیە، جۆرێکیان بە ئەنقەستە کە ئەمە تاوانە، واتە: سزای لەسەرە، ئیتر یان ئەو کەسە تەوبەری لەسەر دەکات و خوا لێی خۆش

---

(١) سنن الترمذي، الرقم٢٤٨٣، سنن ابن ماجة٤٢٤٨، الرقم، المستدرك على الصحيحن، الرقم٧٦٨٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم١٢٧٩٥، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم٢٨٥٢، سنن الدارمي، الرقم ٢٦٨٠،حسنه الألباني في الجامع الصغير وزيادته، الرقم ٨٦٤٤.

دەبێت، یان باکی نییە بە تەوبەو دەمێنێتەوە سەر ڕەحم و بڕیاری خوا خۆی، جۆری دووەمیان هەڵەیەك،ە کە بە ئەنقەست نییە، ئەمەیان بۆ خەڵکی ئاسایی ئومێدی لێخۆشبوونی خوایی هەیە، بەڵام بۆ پێغەمبەران ئیجتیهاد بووە، واتە: تاکە پێغەمبەرێك نییە نیازی خراپی هەبوبێت لە هەڵەیەکدا کە کردوویەتی،بەڵکو ئیجتیهادێکی کردووەو نەیپێکاوە، هەروەها ئەمە بۆ موجتەهیدانی ناو ئوممەتی ئیسلامیش هەیە، وەك پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (إذا حكم الحاكم فاجتهد ثم أصاب فله أجران، وإذا حكم فاجتهد ثم أخطأ فله أجر[1]).

واتە: ئەگەر حاکم حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد، دواتر پێکای، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد و دواتر نەیپێکا و هەڵەی کرد، ئەوە پاداشتێکی بۆ هەیە).

هەڵەیەکی کەسانێکی بەهەڵەدا چوو ئەوەیە، یان هاوەڵان لە سەروو مرۆڤەوە تەماشا دەکەن و، ئامادە نین هەڵەیەکی هاوەڵان قبوڵ بکەن، یان ئەوەیە لە خواروو مرۆڤەوە تەماشایان دەکەن و دان بە فەزڵ و پلەوپایەیاندا نانێن، زۆرجار ئەوانەی هاوەڵان لە سەروو مرۆڤەوە تەماشا دەکەن، کە هەڵەیەکی هاوەڵان دەبینن، ئیتر دنیایان لێ دێتەوە یەك و، خێرا هاوکێشەکە سەروخوار دەکەنەوەو، هاوەڵان دەبەنە خواروو ئاستی مرۆڤ واتە: لە هیچ بارێکدا مرۆڤبوونیان پێ ڕەوا نابینن!

مرۆڤ بوون، واتە: ژیان وەك مرۆڤێك بەو تایبەتمەندیانەی، کە خوا داویەتی بە مرۆڤ، لەوانەش: هەڵەو تاوان، ئیتر هەر مرۆڤێك، پێویستە هەنگاو بەرەو کەماڵ بنێت، خواش ڕازیە بەو سیفەتی مرۆڤبوونە بۆ هاوەڵان و موسڵمانانی تریش، چاوەڕوانی ئەوەشی کردووە، موسڵمانانیش لەژێر کارتێکەرە مرۆییەکاندا بن.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٦٩٣٩، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٢٦، سنن أبي دواد، الرقم ٣١٢٠، سنن ابن ماجة، الرقم ٢٣١١، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٧٤٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٧٤٤٠، مسند الشافعي، الرقم ١١٢٨، صحيح ابن حبان، الرقم ٥١٣٨، سنن الدارقطني، الرقم ٣٩٢٠، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٨٩٣٣، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٣٢٦٧.

بۆ نموونە: خوا ئەگەری ئەوەی داناوە، دوو دەستە لە باوەڕداران، نەك تەنها موسڵمانان پێکەوە جەنگ بکەن:

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە ئیمانداران دژ بەیەکتر جەنگیان کرد، ئەوە لە نێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن، ئینجا ئەگەر کۆمەڵێکیان دەست درێژی کرد بۆ سەر کۆمەڵێکی تریان، ئەوە ئێوە (موسوڵمانان) لەگەڵ ئەوەیان بجەنگن، دەست درێژی دەکات، تا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا (ملکەچی فەرمانی دەبێ)، ئینجا ئەگەر گەڕایەوە ئەوسا لە نێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن بە دادگەرانە و، ڕاست و دادپەروەر بن (لە نێوانیاندا)، بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ).

ئەوەی لەبەرچاو گرتووە موسڵمانان تاوان بکەن، بەڵام بۆ هەریەك لەو بارانەش،چارەسەری داناوە،بۆیە پەروەردەیەکی هەڵەیە، ئەگەر وا موسڵمان گۆش بکەین، کە پێی وابێت هاوەڵان عیصمەتیان هەبووەو دوورن لە هەڵەو نەپێکان، ڕاست ئەوەیە،کە هاوەڵان مرۆڤگەلێك بوون، کە ئاستێکی باڵای مرۆڤایەتییان تۆمار کردووە.

ئەوەیش، کە لە فیتنەی نێوان هاوەڵاندا ڕوویدا، حاڵەتێکی ئاسایی بووە لە حاڵەتی مرۆڤبوونتیایدا، یان هەردوولا هەڵە دەبن، یان لایەنێك هەڵە دەبێت، ئەو بارەی فیتنەی نێوان هاوەڵانیش بەجوانی ڕوون کراوەتەوە، کە کێ حەق بووەو کێ هەڵەی کردووە؟

هەر لەم ڕوانگەوە، کە هاوەڵان پلەی مرۆڤبوونیان پێ ڕەوایەو بەو بوونی ڕێژە هەڵەشەوە، خوای گەورە لێیان ڕازی بووە، دەی ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە، کە دەکرێت موسڵمانی ئەمڕۆش، بە بوونی هەندێ هەڵەشەوە، هەر خوا لێی ڕازی بێت، بۆیە وەك چۆن هەڵەیە هاوەڵانمان تەنها بە بێ بوونی بچووکترین

بەڵەش، ئینجا قبوولٚ بێت، هەروەهاش هەڵەیە موسڵمانی ئەمڕۆمان، بەبێ بوونی هیچ پەڵەیەك، ئینجا قبوولٚ بێت، گرنگ لەوەدا ڕێژەی بنەڕەتییە، ئەگەر موسڵمانێك لە بنەڕەتە سەرەکییەکاندا دەرچوو، ئیتر مەرج نییە بۆ ڕەزامەندی خوا و مرۆڤەکانیش بگاتە پلەی کەماڵ، ئینجا دانی خێری پێدا بنرێت.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لە کاتی نەخۆشی سەرە مەرگیدا چووە سەر مینبەرو، بە هاوەڵانی فەرموو: (أما بعد، فإن الناس يكثرون ويقل الأنصار ، حتى يكونوا في الناس بمنزلة الملح في الطعام ، فمن ولي منكم شيئا يضر فيه قوما وينفع فيه آخرين ، فليقبل من محسنهم ويتجاوز عن مسيئهم[1].

واتە: پاشان، خەڵکی زیاد دەکەن و پشتیوانان کەم دەکەن، تا ئەوەی لەناو خەڵکدا وەك خوێی ناو چێشتیان لێدێت، دەی هەرکامتان شتێکی گرتەدەست، کە تیایدا زیانی هەبێ بۆ خەڵکێ و سوودی هەبێ بۆ هەندێکی تر، با کاری چاکەکاری پشتیوانان قبوولٚ بکاتو، چاوپۆشیش لەومیان بکات، کە خراپەیەك دەکات).

**چوارەم: هاوەڵان کەسانی سەردەمی خۆیان بون:**

دەبێت ئەوە لەیاد نەکەین، کە هاوەڵان لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا ژیاون، واتە: چوارده سەدە پێش ئێستا، ئەوان لەمڕۆدا ناژین، بۆیە هەڵەیە،کە حوکمی ئەمڕۆ بدەین بەسەر هاوەڵاندا، بۆیە دەبێت کاریگەری ژینگەی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و زانستیی ئەوکات لەبەرچاو بگرین، ئەمە هەڵەیەکە، کە زۆر کەس بۆ هەر ساتێکی مێژوویی تووشی دەبن، ئەویش ئەوەیە: حوکمی ئەمڕۆ دەدەن بەسەر ڕۆژگاری ڕابردوودا.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٩، ٣٦١٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٣٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١١٤٧١.

بۆ نموونە: کەسانێك لەمڕۆدا، کە دیدی ناسیۆنالیستی باوو بڵاوە، حوکمی نارەزایی دەدەن بەسەر (صەلاحەدین)ێکدا، کە چەندین سەدە پێش ئێستا ژیاوە، سەردەمەکە مۆدێلی دیدی ناسیۆنالیستی نەبووە، بۆیە کاتێك ژیانی هاوەڵان دەخوێنینەوە، دەبێت هەموو لایەنەکانی باری ئەو سەردەمە لەبەرچاو بگرین، جلوبەرگیان، خۆراکیان، گوفتاریان، جوولەیان، هەموو ئەوانە لە واقیعێکی جیا لەم واقیعەدا بون، چۆن هەڵەیە گلەییان لێ بکەین،کە بۆچی لەبری ئۆتۆمبێل، سواری وشتر بون؟ ئاواش هەڵەیە هەندێ واقیعی تری ژیانیان وا تەماشا بکەین.

**پێنجەم: هاوەڵان لەنێو خۆیاندا ئاستیان جیاواز بووە:**

وەك چۆن پێشتر وتمان: پلەبەندی لە ئاستی مرۆڤەکاندا هەیە، لەنێو دەستەیەکی مرۆڤەکانیشدا ئاستی جیاواز هەیە، جا ئاستەکە بەپێی بیر و ئایدۆلۆژیاکان جیاوازن، لە دیدی ماددیگەراکانەوە ئاستی مرۆڤەکان بە پێوەری ماددە دیاری دەکرێت، لە دیدی دەمارگیرەکانەوە، ئاستی مرۆڤەکان بەپێی ڕەنگی پێست، یان باڵا، یان هەر پێوەرێکی دی دیاری دەکرێت.

لە ئیسلامیشدا ئاستی مرۆڤەکان بەپێی ئاستی گوێڕایەڵییان بۆ خوا (تەقوا) دیاری دەکرێت، بۆیە دەبینین لە نێو هاوەڵاندا، ئەو ئاست جیاوازیە هەبووە، نەك وەك فەوتانی مافی کەسەکانی دی، نا وەك ئەوەی هەرکەسەو مافی خۆی دیاریکراو بێت.

خوای گەورە، کە باسی هاوەڵانی پێش فەتحی مەککەو، پاش فەتحی مەککە دەکات، خاڵی جیاوازی و خاڵی هاوبەشیشیان باس دەکات و دەفەرموێت:

﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ ﴾ الحديد: ١٠.

واتە: (یەکسان نین لە نێو ئەوانەتان، کە پێش فەتحی مەککە بەخشیتان و جەنگتان کرد، ئەوانەپاداشتیان زۆر گەورەترە لەوانەی دوای فەتحی مەککە

بەخشییان و جەنگیان کرد، وە هەمووشیان - هەموو هاوەڵان - خوا بەڵێنی چاکەی پێداون، خواش زانا و ئاگادارە بەوەی دەیکەن).

لە فەرموودەیەکدا، کە موعاذ لە ریفاعەی باوکیەوە ( کە بەشداربووی بەدر بووە) دەیگێڕێتەوە دەڵێت: جبریل (علیه السلام) هات بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێی فەرموو: (بەشداربوانی بەدر لەنێوتاندا چۆن سەیر ئەکەن؟ ).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:( لە بە فەزلترینی موسڵمانانن)، یان وتەیەکی هاوواتای ئەوە.

جبریلیش وتی: (بۆ فریشتە بەشداربووەکانی بەدریش هەر وایە).[1]

جارێك عبدالرحمنی کوڕی عەوف هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و سکاڵای لە خالید کرد، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) بە خالیدی فەرموو: (ئەی خالید! بۆچی ئازاری کەسێك لە بەشداربوانی (بەدر) دەدەیت؟ خۆ ئەگەر هێندەی( ئوحود )زێڕ ببەخشیت، ناگەیتەوە بە کردەوەی ئەودا ).

خالیدیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! سەر دەنێنە سەرم و قسەم لەڕوودا دەکەن، منیش ناچار دەبم وەڵامیان بدەمەوە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لا تؤذوا خالدًا فإنه سيف من سيوف الله صبه الله على الكفار[2]. واتە: ئازاری خالید مەدەن، چونکە ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا، کە بەڕووی بێباوەڕاندا هەڵیکردووە).

بۆیە کاتێك قسە لەسەر هاوەڵێك دەکرێت، کە تەنها کاتی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێك، یان دوان بووە، ئیتر چووەتەوە بۆ

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٩٠.

(٢) صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٠، المعجم الصغير للطبراني، الرقم ٥٨١، صححه شعيب الأرناؤوط.

ناوچەی خۆی و لەویێ ژیاوە، ئەمە پلەوپایەی زانستی و ڕووکەشی جیاوازە لەو هاوەڵەی، کە بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بووەو فەرموودەی لێوە وەرگرتووە، هەروەك تاوانی هاوەڵێکیش، کە زۆر کەم لە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوویێت، بە ڕووکەش جیاوازە لە تاوانی هاوەڵێك، کە بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بوویێت، بۆیە ڕەوا نییە لە هەموو مەسەلەیەکدا، یەك حوکم بەسەر هەموو هاوەڵاندا بدرێت.

هاوکات هەرچەندە ئەو پلەبەندیە هەبووە، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، نەیهێشتووە لە پشکە دنیاییەکەدا هاوەڵانێکی دی دوابکەون، بۆ نموونە: هەرچەندە ئەبوبەکر و عومەر، پلەی هاوەڵێتییان لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەپێشتر بوو، کەچی بۆ کۆتا سوپا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئوسامەی کوڕی زەیدی دانا وەك سەرکردە، کە چ لە ڕووی هاوەڵێتیی و، چ لە ڕووی تەمەنیشەوە لە ئاست ئەبوبەکر و عومەردا نەبوو، یان دوای فەتحی مەککە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، عەتتابی کوڕی ئەسیدی وەك والی مەککە دانا، هەرچەندە تازە موسڵمان بووبوو، خۆ عوسمان ی کوڕی عەففانیش هەبوو، کە هەم ئومەوی بوو، هەم لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوان بوو، هەم موژدەپێدراوی بەهەشت بوو و، هەم زۆرینەی سامانی خۆی بۆ ئیسلام خەرج کردبوو و، هەم دوو کچی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) بەهاوسەرگرتبوو و، دەیان فەزڵی تریشی هەبوو!

بۆیە پێویستە بەوجۆرەی لە فەرمووده صەحیحەکاندا هاتووە، پلەوپایەی هەر هاوەڵێ، یان هەر تاقمە هاوەڵێ، وەك خۆی لەبەرچاو بگرین، تا بتوانین حوکمی دروست لەبارەیانەوە بدەین، بۆ نموونە: کاتێك هەڵەیەك لە هاوەڵێکی پشتیوانان دەبینین، دەبێت پلەوپایەیان بزانین.

ئینجا ئەم فەرموودەیە لەبەرچاو بگرین، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (أما بعد، فإن الناس يكثرون ويقل الأنصار ، حتى يكونوا في

الناس بمنزلة الملح في الطعام ، فمن ولي منكم شيئا يضر فيه قوما وينفع فيه آخرين ، فليقبل من محسنهم ويتجاوز عن مسيئهم[1]. واتە: پاشان، خەڵکی زیاد دەکەن و پشتیوانان کەم دەکەن، تا ئەوەی لەناو خەڵکدا وەك خوێی ناو چێشتیان لێدێت، دەی هەرکامتان شتێکی گرتەدەست، کە تیایدا زیانی هەبێ بۆ خەڵکێ و سوودی هەبێ بۆ هەندێکی تر، با کاری چاکەکاری پشتیوانان قبوڵ بکاتو، چاوپۆشیش لەومیان بکات، کە خراپەیەك دەکات).

یان کە هاوەڵێکی بەشداربووی (بەدر) دەکەوێتە هەڵەیەکەوە، بێ حاشا کردن لە هەڵەکەی و بە ڕەوادانانی، ئەوەمان لەبیر بێت، کە ئەوە بەشداربوویەکی (بەدر) بووە، وەك لە ڕووداوەکەی (حاطبی کوڕی ئەبی بەلتەعە) دا هاتووە، کاتێ (حاطب) هەواڵی پلانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بە نهێنی نارد بۆ قورەیشو، دواتر کارەکەی ئاشکرا بوو، (حاطب) هێنرایە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێکرد بۆوایکردووە؟

وتی: لەبەر گیانی خۆی، نەك لەبەر هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ڕاستی پێ وتن.

عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لێمگەڕێ با لەگەردنی ئەو دووڕووە بدەم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (إنه قد شهد بدرًا ، وما يدريك لعل الله أن يكون قد اطلع على أهل بدر فقال : اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم[2]. واتە: ئەو، بەشداری بەدری کردووە، تۆ چووزانیت، بەڵکو خوا ئاگادار بوویێت(خوا ئاگادارە) بە بەشداربوانی بەدر، بۆیە پێی فەرموون: چیتان ئەوێ بیکەن، من لێتان خۆش بووم).

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٩، ٣٦١٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٣٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١١٤٧١.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٨٦٦، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٥٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٥٩٢، سنن أبي داود، الرقم ٢٢٩٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٣١٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١١١٣٥، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٧١٣٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٨٠ .

ئەمانە بۆ ئەوە نییە، کە هەڵەکەیان بشەرعێنین، نا، بەڵکو بۆ ئەوەی ئینصاف بەکاربێت لە ئاست کەسەکەدا، ئەگەرنا، هەڵەیەکی گەورە لای هەندێ موسڵمانی ساویلکە ئەوەیە، کە بۆ بەرگریکردن لە ماوەیەکی مێژووی ئیسلامی، یان لەسەرکردنەوەی سەرکردە، یان کەسایەتییەکی ناو مێژووی ئیسلامی، ڕەوایەتی دەدەن بەکارێ، یان ڕووداوێکی ئەو ماوە، یان سەرکردەو کەسایەتییەکە پێچەوانەی خودی شەریعەتە، گرنگ لای ئێمە، پاراستنی دینەکەیە، نەك پاساو هێنانەوە بۆ هەڵەی پەیڕەوانی، ئەوانە دەستەیەك بون چون، ئەوەی بەدەستیانهێنا بۆ خۆیانەو، ئەوەیش ئێمە بەدەستی دێنین بۆ خۆمانە.

## ڕووداوی ئیفك

ڕووداوی بوختان (ئیفك) لە غەزای (مورەیسیع)دا لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا ڕوویدا، ئەوکات عائیشە تەمەنی دوانزە ساڵان بوو.[1]

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)هەرکات بیویستایە لە مەدینە دەربچێت، تیروپشکی دەکرد بۆ هاوسەرەکانی و، یەکێك لە هاوسەرەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد، لە غەزای (مورەیسیع)دا خاتو عائیشە ناوی دەرچوو.[2]

خاتو عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێ)، خۆی وردەکاری ڕووداوەکە باس دەکات و دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)هەرکات بیویستایە دەربچێت، تیروپشکی دەکرد بۆ هاوسەرەکانی و یەکێك لە هاوسەرەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد.

ئەوەبوو لە غەزایەکدا ناوی من دەرچوو، ئەمەش دوای دابەزینی ئایەتی حیجاب بوو، منیش لەناو کەژاوەیەکدا بووم، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە غەزاکە بوویەوە بەرەو مەدینە کەوتەوەڕێ، کە لە مەدینە نزیك بووینەوە، پاش حەوانەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرمانی دەرچوونی دەرکرد، منیش بە پیادە کەمێك لە سوپاکە دوورکەوتبوومەوە بۆ پێویستیەکم.

کە تەواو بووم، هاتمەوە بەرەو لای کاروانەکە، دەستم دا لە سنگم، دەبینم گەردەنبەندەکەم پچڕاوە، بۆیە گەڕامەوە بۆی، ئەوە دوای خستم، تا هاتمەوە

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٥٣.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٨.

ئەوانەی کەژاوەکەی منیان هەڵگرتبوو، کەژاوەکەیان خستبوویە سەر وشترەکە، وایانزانیبوو من تیایدام، ئەوکات ئافرەتان کێشیان کەم بوو و قەڵەو و قورس نەبوون، چونکە تەنها بەشی نەمانی برسێتی نانیان دەخوارد، بۆیە سووکی کەژاوەکەیان لا نامۆ نەبوبوو، کەوتبوونەڕێ.

که گەردنبەندەکەم دۆزیەوە، گەڕامەوە، دەبینم کەس لەوێ نییە، چوومەوە هەمان شوێن، که تیایدا بووم و وتم: دەگەڕێن بە دوامدا و دێنەوە بە شوێنمدا، دانیشتم تا ئەوەی خەو زۆری هێنا بۆ چاوەکانم و خەوم لێکەوت.

( صەفوانی کوڕی موعەططەلی سولەمی) لە دوای سوپاکەوە بوو، کە گەیشتە لای من، تارمایی کەسێکی خەوتووی بینی، هات بۆ لام، ئەو پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب منی دیبوو، کە وشترەکەی مۆڵ دا بێدار بوومەوە، (صەفوان) دەستی دانا، تا قاچ بخەمە سەری و سەر وشترەکە کەوتم، ئیتر منی بردەوە، تا گەیشتینەوە لای کاروانەکە، ئەوان لە قرچەی نیوەڕۆدا لایاندابوو، کە ئێمە گەیشتینە لایان، یەکەم کەس بەزمی بوهتانەکەی نایەوە، (عبداللەی کوڕی ئویەی کوڕی سەلول) بوو.

کە چووینەوە مەدینە، ماوەی یەك مانگ من بەو دەردەوە - بوهتان بۆ کردن - مامەوەو باسی ئەو ڕووداوە، بنێشتە خۆشەی دەمی ئەوانە بوو، کە بڕوایان وابوو تووشی تاوان بوم، ئەوەی زیاتر منی دەترساند، ئەوەبوون، ئەو نەرمونیانەی پێشتر لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەمدی، لەو ماوەدا لێم نەدەبینی!

دەهاتەوە ماڵەوەو سەلامی دەکرد و دواتر دەیفەرموو: (ئافرەتەکە چۆنە؟) منیش هیچم نەدەزانی، تا لەو نەخۆشیەی تووشم بووبوو چاك بوومەوە، ئەوکات لەگەڵ (ئوممومیسطەح) دەرچووین بۆ دەست بەئاو گەیاندن، کە تەنها بە شەویش دەردەچووین، ئەوکات هێشتا لەپاڵ ماڵدا سەرئاو نەبوو، دەچووین بە ڕێدا، کە پێی گیر بوو لە جلەکەی، وتی: لەناوچێت (میسطەح).

وتم: خراپت وت، قسە بە بەشداربوویەکی بەدر دەڵێیت؟

ئەویش وتی: هۆو خاتوون، مەگەر گوێت لە قسەی ئەو خەڵکە نەبووە؟

ئینجا قسەو باسەکەی بۆ گێڕامەوە، ئیتر هێندەی تر نەخۆش کەوتم، کە گەڕامەوە ماڵەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتەوە ماڵەوەو سەلامی کرد و فەرمووی: (ئافرەتەکە چۆنە؟).

وتم: مۆڵەتم بدە بچمەوە بۆ لای دایك و باوکم، چونکە دەمویست بچمەوە بۆ لایان و دڵنیا بم لەوەی بیستوومە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مۆڵەتی دام و، منیش چوومەوە ماڵەوەو بە دایکم وت: ئەو خەڵکە چی دەڵێت؟

ئەویش وتی: کچە شیرینەکەم! باری خۆت قورس مەکە، بەخوا هەر ئافرەتێکی جوان لای پیاوێ بێت، کە خۆشی بوێت و ئافرەتەکە هەوێی زۆری هەبێت، هەر هێرشی دەکەنە سەر.

منیش وتم: سبحان الله!، خەڵکی وا دەڵێن؟! ئیتر ئەو شەوە، تا بەیانی فرمێسك لە چاوانم نەوەستا و خەو نەچووە چاوم، بۆ بەیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کرد و ڕای ئەوانی وەرگرت، چونکە هێشتا سروش لەو بارەوە دانەبەزیبوو.

ڕای ئەوانی وەرگرت، ئایا لە من جیابێتەوە، یان نا؟

ئوسامە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە خێزانتە و بەخوا تەنها خێر و چاکەی لە بارەوە دەزانین، عەلیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا !خوا بارت تەنگ و سەخت ناکات و، ئافرەتی تریش، جگە لەو زۆرن، پرسیاریش بکە لە خزمەتکارەکە ئەو وەڵامی ڕاستت پێدەدات.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)( بەریرە)ی بانگ کرد، فەرمووی: (ئەی بەریرە! ئایا هیچت لە عائیشە دیوە، کە جێی گومانت بێت؟).

بەیرە وتی: سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە، تاکە شتێك لەم ئافرەتە دیومە ئەوەیە، کە تەمەنی زۆر کەمە، کە هەویر دەشێلرێت، بە دەم هەویرەکەوە

خەوی لێدەکەوێت، پەلەوەر دێت و هەویرەکە دەخوات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)هەر ئەو ڕۆژە هەستا و لەنێو هاوەڵانیدا فەرمووی: (من يعذرني من رجل بلغني أذاه في أهلي، فوالله ما علمت على أهلي إلّا خيراً، وقد ذكروا رجلا ما علمت عليه إلا خيرا، وما كان يدخل على أهلي إلا معي)، (کێ بەرگریم لێدەکات لە کەسێ، کە پێم گەیشتووە بە خراپە باسی خێزانەکەمی کردووە، دەی سوێند بەخوا من هەر چاکەم لێ دیوە، ئەوانە باسی پیاوێکیان کردووە، کە بەس خێرو چاکەی لە بارەوە دەزانم، بەتەنها لەگەڵ خۆیشمدا سەری کردووە بەماڵم).

سەعدی کوڕی موعاذ هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بەخوا من ئەوەت بۆ دەکەم، ئەگەر لە (ئەوسیەکان) بێت، دەدەین لە ملی، ئەگەریش لەناو برا (خەزرەجیەکانمان)دا بێت فەرمانمان پێبکەیت، فەرمانت بەجێدەگەیەنین.

سەعدی کوڕی عوبادە، کە گەورەی خەزرەجیەکان بوو، پیاوێکی چاك بوو، بەڵام دەمارگیری گرتی، هەستاو وتی: سوێند بەخوا درۆ دەکەیت نایکوژیت و ئەوەشت پێ ناکرێت، ئوسەیدی کوڕی حوچهیریش هەستا و وتی: سوێند بەخوا درۆ دەکەیت، ئێمە دەیکوژین، تۆ دووڕوویت و مشتومڕ دەکەیت.

هەردوو دەستەی: (ئەوس و خەزرەج) هەستان و خەریکبوو بکەونە وێزەی یەکتر، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە لەسەر مینبەر بوو دابەزیو، هێوری کردنەوە، تا بێدەنگ بوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بێدەنگ بوو، منیش ئەو ڕۆژە هەر دەگریام، بۆ بەیانی دایك و باوکم هاتن بۆ لام، لە کەنارمەوە دانیشتبوون، کە من دەگریام.

لەو کاتەدا ئافرەتێکی پشتیوانان داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی کرد، منیش مۆڵەتم دا، ئەویش هات دانیشت و لەگەڵم دەستی کرد بە گریان، لەو حاڵەدا بووین، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)هاتە ژوورەوەو لە دوور منەوە دانیشت، چونکە لەو ڕۆژەوەی ئەو قسانە کرابوو، لە کەنار منەوە دانەدەنیشت، ماوەی مانگێك بوو خوا سروشی دانەبەزاندبوو.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)شایەتومانی فەرموو و دواتر فەرمووی: ( یا عائشة، فإنه بلغني عنك كذا وكذا، فإن كنت بريئة فسيبرئك الله، وإن كنت ألممت بذنب، فاستغفري الله وتوبي إليه، فإن العبد إذا اعترف بذنبه ثم تاب تاب الله عليه. واتە: ئەی عائیشە! ئاواو ئاوام لەبارەتەوە بیستووە، ئەگەر پاکیت ئەوە خوا پاکیت دەسەلمێنێت، ئەگەریش تووشی تاوانێك بویت ئەوا داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەو تەوبە بکە، چونکە بەندە ئەگەر دانی نا بە تاوانیدا و دواتر تەوبەی کرد، ئەوە خوا لێی خۆش دەبێت).

کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرمایشتەکەی تەواو بوو، فرمێسك لە چاوانم برا، بە باوکم وت: تۆ لە بری من وەڵامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بدەرەوە.

ئەویش وتی: بەخوا نازانم چی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بڵێم؟

وتم: دەی دایکە تۆ لە بری من وەڵام بدەرەوە! ئەویش هەمان شتی وت.

وتم: بەخوا دەزانم ئێوە قسەی ئەو خەڵکەتان بیستووە و بڕواتان بە قسەی ئەوان کردووە، ئەگەر پێتان بڵێم: من پاکم بڕوام پێ ناکەن، خواش خۆی دەزانێت من بێتاوانم، ئەگەریش بڵێم: شتی وامکردووە بڕوام پێدەکەن، لەکاتێکدا خوا دەزانێت من شتی وام نەکردووە.

نموونەی من و ئێوە، هەروەك بەسەرهاتەکەی باوکی یوسوفە، کە فەرمووی: (فصبر جميل والله المستعان على ما تصفون)، ئینجا چووم بۆ ناو جێگەکەم و دەپاڕامەوە،کە خوا پاکیم نیشان بدات، بەڵام بەخوا، هەرگیز گومانیشم نەدەبرد، کە لە بارەمەوە سروش دابەزێت، خۆم زۆر بە کەمتر لەوە دەزانی، قورئان لە بارەمەوە بدوێت، بەڵام هیوام وابوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)خەوێك ببینێت، کە تیایدا خوا پاکی من بسەلمێنێت.

بەخوا، کەس لەو کۆڕە نەچوویە دەرەوە، تا سروش دابەزی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەو باری نارەحەتیەی لە سروشدا تووشی دەبوو،

تووشی بوو، لەو ڕۆژە باراناویەدا، عارەقەی نێوچاوانی دەتوت: مرواریە! کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قورسی سروشی لەسەر لاچوو، پێکەنی، یەکەم قسە بە منی فەرموو: (ئەی عائیشە! سوپاسی خوا بکە، خوا پاکی تۆی سەلماند).

دایکم وتی: هەستە وەرە بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

وتم: نابەخوا ناچم بۆ لای، تەنها سوپاسی خوا دەکەم، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ
مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ
ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ
بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا
فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾
إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ
ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ
عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ
ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾﴾.

کە خوا لە بارەی منەوە ئەو ئایەتانەی دابەزاند، ئەبوبەکر، کە پێشتر بە پارە یارمەتی (میسطەحی کوڕی ئەپاپە)ی دەدا، وتی: بەخوا ئیتر لەمەودوا، تا ماوم، هیچ یارمەتی نادەم مادەم سەبارەت بە عائیشە وای دەوت، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە:

﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾.

ئەبوبەکر وتی: بەڵی، خوایە من ئەوەم پێ خۆشترە لێم خۆش بیت، بۆیە دەستی کردەوە بە یارمەتیدانی میسطەح![1]

کاتێك ڕووداوی (ئیفك) ڕوویدا، زەینەبی خێزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شایەتی خێری دا بۆ خاتوعائیشە، خاتوعائیشە دەڵێت: لەناو خێزانەکانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، زەینەبی کچی جەحش رکەبەرم بوو، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بەو مەسەلەیە پرسیاری لێکرد.

زەینەب وتی: بەخوا تەنها خێر دەزانم، ئەوەبوو خوا پاراستی لەو بوهتانە، بەڵام (حەمنە)ی خوشکی لەبەر خوشکەکەی، بەرامبەرم تێکەوت.[2]

حەسسانی شاعیری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لە مەسەلەی ئیفکدا تێکەوت، مەسەلەی ئیفکیش ئەو بوختانە بوو کە کرا بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە گوایە تووشی زینا بووە، چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە هەڵە کەوتنە ژێر کاریگەری دوو ڕوان و کەوتنە ئەو هەڵەوە، ئەوانیش بریتی بوون لە حەسسانی کوڕی ثابتی شاعیری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و میسطەح و حەمنە، ئەوەبوو خوای گەورە لەو بارەوە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە:

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩، صحيح مسلم، الرقم ٥٠٨٠، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٨، سنن الترمذي، الرقم ٣١٨٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٥٦، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٥٠٥١، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٩٠٣٨.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٥٠٨٠.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٌ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرًّا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٌ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٍٕ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾﴾ النور:١١.

واتە: (بێگومان کەسانێ کە ئەو بوهتانەیان (بۆ عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەڵبەست، دەستەیە بوون لە خۆتان (با موونافیقیشیان تیا بوو)، وا مەزانن ئەو (بوهتانە) شەڕ و خراپە بۆتان (وانییە)، بەڵکو خێرو چاکەیە بۆتان، بۆ هەریەك لەوانە هەیە لەتاوان بەو ئەندازەی هەوڵیداوە (لەو بوهتانەدا) وە ئەو کەسەیان، کە بەشی گەورەی بوختانەکەی گرتە ئەستۆ (کە عبداللەی کوڕی ئوبەی بوو) (لە ڕۆژی دواییدا) بۆ ئەوە سزای هەرە گەورە،[1] بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد: هەشتا جەڵدە درا لەو سێ کەسە.[2]

سەبارەت بە تاوانباربوونی ئەو سێ هاوەڵەی بەشداری ئەو بوختانە بوو، لەو مەسەلەدا نابێتە بەڵگەی ئەوەی، کە لە هاوەڵبوون دەربچن، چونکە هەرکام لەوانە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پایەی تایبەتیان هەبووە، بۆ نموونە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە (حەسسانی کوڕی ثابت)ی فەرمووە: هێرش بکەرە سەر بێباوەڕان - بە شیعر - چونکە جبریل لەگەڵتدایە،[3] هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مزگەوتی مەدینەدا، مینبەرێکی دانابوو بۆ حەسسان و، حەسسان لەسەری دەوەستا و بە شیعر بەرگری لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکرد، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: ( إن الله يدافع حسان بروح القدس ما ينافح عن رسول الله[4].

---

(١) مشكل الآثار للطحاوي، الرقم ٢٤٩٤

(٢) مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٤٨٠٣، مشكل الآثار للطحاوي، الرقم ٢٤٩٤، تاريخ المدينة لابن شبة، الرقم ٦٣٤.

(٣) البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص١٣١.

(٤) سنن الترمذي، الرقم ٢٨٤٧، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٢٥٤٨٤، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٠٦٣، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٨٨٠، جسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن

واتە: خوای گەورە بە روحولقودوس پاڵپشتی حەسسان دەکات، تا کاتێك بەردەوام بێت لە بەرگری کردن لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)).

هەروەها حەسسان لە فەتحی مەککەدا، لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) پشتگیری کراوە، تا بە شیعر بەرگری لە ئیسلام بکات و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزای خێری بۆ کردوە، ئەوەتا جەنابی کیلابی، کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) و لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە، دەڵێت: بیستم پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم) بە کەسێکی رەبعەی دەفەرموو: (جبرئیل لە ڕاستمەوەیەو میکائیلیش لە چەپمەوەیەو فریشتەکانیش سێبەریان کردووە بۆ سەربازگەکەم، دەی شتێ لە وتەی - شیعری - خۆت بڵێ)، کابراش شیعرێکی وت.

منیش وتم: ئەرێ ئەو شاعیرە کێ بوو؟

وترا: حەسسانە، بینیم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نزای بۆ دەکرد و فەرمایشتی خێری دەفەرموو.[1]

(میسطەح)یش یەکێك بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر،[2] دەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێزێکی زۆری هەبوو بۆ هاوەڵانی (بەدر)، تەنانەت چاوپۆشی دەکرد لە هەندێ هەڵەیانو، وایشی فێری هاوەڵانی تر دەکرد، تا ئەو چاوپۆشیە و ڕێزەیان هەبێت بۆ هاوەڵانی بەدر، وەك لە ڕووداوەکەی (حاطبی کوڕی ئەبی بەلتەع)ەدا هاتووە کاتێ (حاطب) هەواڵی پلانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بە نهێنی نارد بۆ قوڕەیش و دواتر کارەکەی ئاشکرا بوو (حاطب) هێنرایە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێکرد بۆ وایکردووە؟

---

الترمذي، الرقم ٢٨٤٦، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره، صححه الذهبي في التلخيص.

(١) أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٥.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩.

وتی: لەبەر گیانی خۆی نەك لەبەر هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ڕاستی پێ وتن.

عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لێمگەڕێ با بدەم لەگەردنی ئەو دوو ڕووە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (إنه قد شهد بدرا، وما يدريك لعل الله أن يكون قد اطلع على أهل بدر فقال : اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم[1]. واتە: ئەو بەشداری بەدری کردووە، تۆ چووزانیت بەڵکو خوا ئاگادار بوویێت(خوا ئاگادارە) بە بەشداربوانی بەدر بۆیە پێی فەرموون: چیتان ئەوێ بیکەن من لێتان خۆش بووم).

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، مزگێنییەکە بۆ ئەهلی (بەدر) روونتر دەکاتەوەو هاتووە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە عومەری فەرموو: (صدق يا عمر! أو ليس قد شهد بدراً، لعل الله اطلع إليهم فقال: اعملوا ما شئتم فقد وجبت لكم الجنة[2]. واتە: ڕاستی وت ئەی عومەر! مەگەر ئەو بەشداری بەدری نەکردووە؟! بەڵکو خوا ئاگادارە بە بەشداربوانی بەدر و بەوانی فەرموو چی دەکەن بیکەن، من بەهەشتم واجب کرد بۆ ئێوە).

بۆیە ئەمە بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی، موسڵمان دەکەوێتە هەڵەوەو، هاوەڵانیش وەك موسڵمانانی تر کەوتونەتە هەڵەوەو، تەوبەیان کردووەو بە پەیڕەوی ئەو حەددەی خوا دایناوە، بۆ تاوانەکان ڕازی بوون و پاك بوونەتەوە.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٨٦٦ و ٢٩٣٢ و ٤٠٣٧، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٥٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٥٩٢، سنن أبي داود، الرقم ٢٢٩٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٣١٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١١١٣٥، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٧١٣٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٨٠ .

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٨٠٢، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣٧٩، الأدب المفرد للبخاري، الرقم ٤٥٣، و صححه الألباني في صحيح الأدب المفرد، الرقم ١٨١.

## فیتنە لە ماڵی خاتو عائیشەوە

ئیبن عومەر دەڵێت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتاری دەداو ئاماژەی کرد بە ماڵی خاتوعائیشەو فەرمووی: (هنا الفتنة - ثلاثا - من حیث یطلع قرن الشیطان[١].

واتە: فیتنە لێرەوەیە، فیتنە لێرەوەیە، فیتنە لێرەوەیە، لێرەوە شاخی - یان هەوادارانی - شەیتان دەردەکەون).

جا نەیارانی خاتو عائیشە ئەوە دەکەن بە تانە، کە عائیشە سەری فیتنەیە، بەڵام بە خوێندنەوەی فەرموودەکە، کە لە دەقی تردا ڕوونکراوەتەوە دەردەکەوێت: مەبەستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ماڵی خاتوعائیشە نەبووە، بەڵکو مەبەستی ئەو بەرەیە بووە، کە بەری ڕۆژهەڵات دەکات.

ئیبن عومەر دەڵێت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕووی کردبوویە ڕۆژهەڵات و فەرمووی: (بزانن فیتنە لێرەوەیە، بزانن فیتنە لێرەوەیە، بزانن فیتنە لێرەوەیە، لێرەوە شاخی شەیتان دەردەکەوێت).[٢]

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئیبن عومەر دەڵێت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ماڵی عائیشەوە هاتە دەرەوەو فەرمووی: (فیتنە ئا ئەلێرەوەیە، کە شاخی شەیتان دەردەکەوێت) مەبەستی ڕۆژهەڵات بوو.[٣]

جا ڕۆژهەڵاتەکەی ڕووەو بەحرەین بوو، کە یەکەم فیتنە لەوێ، بەدەرکەوتنی موسەیلەمەی درۆزن دەرکەوت.[٤]

---

(١) صحیح البخاري، الرقم ٢٩٥٤.

(٢) صحیح البخاري، الرقم ٦٦٩٧، صحیح مسلم، الرقم ٥٢٧٥.

(٣) صحیح مسلم، الرقم ٥٢٧٨.

(٤) صحیح ابن حبان، الرقم ٦٧٥٨.

## خاتو عائیشە
## لە سەردەمی فیتنەدا

لە سەردەمی خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا، عائیشەی دایکی باوەڕداران لە مەدینە بوو و، زانستی دەبەخشیەوە، بەڵام لە کاتی فیتنەی شەهیدکردنی عوسماندا، ئاشووبگێڕان سوودیان وەرگرت لەناوبانگی خاتو عائیشە، تا دژ بە خەلیفە عوسمان بەکاری بهێنن.

کاتێك عوسمان گەمارۆ درابوو، خاتوعائیشە لە مەککە بوو، ئەوەبوو بەرەو مەدینە کەوتەوە ڕێ، بەڵام لە ڕێدا هەواڵی کوژرانی عوسمانی بیست، بۆیە گەڕایەوە بۆ مەککە و، وتی: بەخوا، عوسمان بە بێتاوانی کوژرا و دەبێت داوای خوێنی بکەم.[1]

مەسروق دەڵێت: بە عائیشەم وت: سەیری ئەو کارەت! نامەت بۆ خەڵك نووسیوەو داوات لێکردن، تا دژ بە عوسمان ڕاپەڕن.

خاتوعائیشەش وتی: سوێند بەوەی باوەڕداران باوەڕیان پێ هێناوە، بێباوەڕان باوەڕیان پێ نەهێناوە، من ڕەشیەکم لەسەر پەڕەی سپی بۆ نەنووسیون - واتە: من هیچم بۆ نەنووسیون.

ئەعمەش دەڵێت: ئەو خەڵکە وایان دەزانی ئەو نامەیە لەسەر زاری عائیشەوە نووسراوە![2]

---

(١) الكامل في التاريخ، ج٣، ص ١٠٠.

(٢) العواصم من القواصم.

کاتێك عوسمان شەهید کرا، دوای ئەوە بەیعەتی خیلافەت درا بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو، بەیعەتەکە هەموو موسڵمانانی لەخۆنەگرت، بەڵکو بەهۆی ڕاجیایی سەبارەت بە خوێنی عوسمان، فیتنەیەك لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویدا، ئەویش بوویە هۆی ڕوودانی هەردوو جەنگی: (جەمەل و صفین)، دواجاریش کێشەکە هەر بەو بارەیەوە مایەوە، تا لەسەر دەستی (حەسەنی کوڕی عەلی) فیتنەکە کوژایەوە.

بەو بەیعەتدانە، موعاویە لە شام و، خەڵکی شام مانەوەو بەیعەتیان نەدا بە عەلی، جگە لەوەی تەلحەو زوبەیرو دایکی باوەڕداران عائیشەش ئیجتیهادیان وابوو: دەبێت بکوژانی عوسمان یەکسەر بکوژرێنەوە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب ڕای وابوو : پەلە نەکرێت لە کوشتنەوەیان، چونکە ئەوان لەناو مەدینەدان و، سەربازانی دەوڵەتی ئیسلامیش لە دەرەوەن و، ئەگەر هەیە خێرا بکرێت لە لێدانیان،کە بتوانن مەدینە بگرن.

بەهەرحاڵ، ئەمە بوویە هۆی کەوتنەوەی فیتنەیەکی گەورە، کە ئەنجامێکی دڵتەزێنی هەبوو بۆ موسڵمانان و، تا ئەمڕۆش ئاهی داخی ئەو فیتنەیە لای موسڵمانان گەرمەو، هێشتا خەفەتیان بەو فیتنەیە دانەمرکاوەتەوەو، بووە بە چەکێك بەدەست دوژمنانی ئیسلام و مێژووی ئیسلامی و هاوەڵانەوە، تا داخی دڵی خۆیان بڕێژن.

کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان کوژرا، دایکانی باوەڕداران (هاوسەرەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)) چووبوون بۆ حەج بۆ مەککە، تا لەدەست ئەو فیتنەی مەدینەی گرتووەتەوە، ڕزگار بن، کاتێك ویستیان بگەڕێنەوە مەککە، هەواڵیان پێگەیشتن کە عوسمان کوژراوە، بۆیە لە مەککە مانەوە، تا بزانن بارەکە بە چی دەگات!

ئەوەبوو بێ پێشنیازی خۆی، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بەیعەتی پێدرا، بەتایبەت، کە خەواریجەکان زۆریان لە (عەلی) کرد، هەرچەندە( عەلی ) خۆی ڕقی بوو لێیان، بەڵام هیوای وابوو دەرفەتێکی بۆ بگونجێت، تا لەناویان بەرێت.

ئەوەبوو، کە ئەو فشارە بینرا، ژمارەیەك لە خزمانی عوسمان، لە بەنوئومەییە دەرچوون بۆ مەککە، هەریەك لە: زوبەیر و طەلحەش داوای مۆڵەتیان کرد، تا بچن بۆ مەککە، عەلیش مۆڵەتی پێدان، ئەوانیش چوون بۆ مەککە، خەڵکێکی زۆریش شوێنیان کەوت، لە بەصرەو مەدینەو یەمەن و چەند شوێنی ترەوە، خەڵکێکی زۆر ڕوویکردە مەککەو، لەوێ ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان و دایکانی باوەڕداران و جەماوەرێك کۆبوونەوەو، داوای خوێنی عوسمانیان دەکرد، عائیشەی دایکی باوەڕدارانیش جڵەوی مەسەلەکەی گرتبوویەدەست.[1]

لە مەککە سێ ڕای جیاواز دروست بوو، دەستەیەك وتیان: با بچین بۆ لای موعاویە بۆ شام و لەوێوە بێین تۆڵە بکەینەوە، دەستەی دووەم وتیان: بەڵکو با بچین بۆ مەدینە بۆ لای عەلی و داوای تۆڵەی عوسمان بکەینەوە، دەستەی سێیەم وتیان: بەڵکو دەچین بۆ بەصرەو، لەوێ خۆمان بەهێز دەکەین و هەر لەوێوە دەکەوینە لەناوبردنی بکوژانی عوسمان، ئەوەبوو لەسەر ئەم ڕایە ڕێککەوتن.[2]

(سەبارەت بە چوونی - هاوەڵانی عائیشەو طەلحەو زوبەیر- بەرەو بەصرە ڕاستەو، هیچ کێشەیەکی لەسەر نییە، بەڵام بۆچی دەرچوون؟

لەمەدا گێڕانەوەیەکی لەسەر نییەو متمانە بە هیچ گێڕانەوەیەکیان ناکرێت، چونکە کەسی جێمتمانە نەیگێڕاونەتەوە، قسەی کەسی هەوادار وەرناگیرێت، حەزی تانەدان لە ئیسلام و بەکەمدانانی هاوەڵان، چووەتە ناخی کەسی هەوادار و دەمارگیر.

لەوانەیە بۆ ئەوە دەرچووبن، تا لەبەر شتێك، کە بۆیان دەرکەوتووە ویستبێتیان عەلی - لە خیلافەت - لاببەن، بۆیەش بەیعەتیان دابێت، تا شۆڕشگێڕەکان هێور ببنەوە، دواتر کەوتبنە داوای حەق.

لەوانەشە بۆیە چووبنە دەرەوە، تا بکوژانی عوسمان لەناوبەرن.

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٠ – ٢٣١.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣١.

لەوانەشە بە چەند دەستەیەکی موسڵمانانەوە دەرچووبن، تا بیانگێڕنەوە بۆیەك قانوون،تا بەریەك نەکەون و دژ بەیەك نەجەنگن، ئەمەش دروستە نەك شتی تر، هەواڵی ڕاستیش بەم جۆرە هاتووە.

سەبارەت بە گێڕانەوەکانی بەشەکانی یەکەم، هەموویان پووچ و لاوازن.

سەبارەت بەوەی ئەوان، بە زۆر و ناچاری بەیعەتیان دابێت، ئەوە بێ بنەما و پووچەو، پێشتریش ڕوونمان کردوەتەوە.

سەبارەت بەوەی ویستبێتیان (عەلی) لە خیلافەت لاببەن،ئەمەش بێ بنەما و پووچە، چونکە لابردن بە ڕاو ڕوانینی هەموان دەبێت، دەکرێت یەك، یان دوو کەس لە دەسەڵاتدا بن، بەڵام لابردن، تەنها دوای سەلماندن و ڕوونکردنەوە دەبێت.

سەبارەت بەوەش، کە لەوانەیە بۆ کوشتنی بکوژانی عوسمان دەرچووبن، پێش ئەمە کارەکە بنەڕەتەکەی بۆ یەکدەنگی بووە، دەشکرێت هەردوو مەسەلەکە پێکەوە بن.

دەگێڕدرێتەوە لە کاتی ئامادەنەبوونی- طەلحە و زوبەیر و عائیشە لە مەدینەدا - ئاژاوەی نێوان خەڵك نەما، طەلحە و زوبەیر و عائیشەش دایکی باوەڕدارانیش، بەو هیوایە چوونەدەرەوە، تا خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای دایکیان و ڕەچاوی حورمەتی پێغەمبەرەکەیان بکەن).[1]

کە گەیشتنە( بەصرە)،بەرپرسی ئەوێ نوێنەری نارد، تا بزانێت بۆچی هاتون؟

چوونە لای عائیشە وتیان: بۆچی هاتویت؟

وتی: بۆ داوای خوێنی عوسمان هاتوین، چوونە لای طەلحە، ئەویش هەمان شتی وت، چوونە لای زوبەیر، ئەویش هەمان شتی وت.[2]

---

(١) العوصم من القواصم لابن العربي.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٢.

بەڵام سوپاکەی عوسمانی کوڕی حنیف، بەوە ڕازی نەبوون و هەوڵیاندەدا لەگەڵ سوپای عائیشە بجەنگن، عائیشەش فەرمانی کرد: کەس جەنگ نەکات، ڕۆژێك خۆیان پاراست، بەڵام لە ڕۆژی دووەمدا جەنگ ڕوویدا و ژمارەیەك لە هاوەڵان و کەسانی تر کوژران.(١)

دواتر بڕیاریان دا هەواڵ وەربگرن ئەگەر طەلحەو زوبەیر بە ناچاری بەیعەتیان دابوو ئەوە عوسمان بەصرەیان بۆ چۆڵ بکات، ئەگەریش بە ویستی خۆیان بوویێت ئەوە ئەو دوانە دەبێت بەصرە چۆڵ بکەن، نوێنەریان ناردە مەدینەو نوێنەر هەواڵی پرسی، کەس وەڵامی نەدەدایەوە جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە وتی: بەخوا بە ناچاری بەیعەتیان دا، کەچی خەڵکانێك هەڵمەتیان بۆ برد، چەند هاوەڵێك رزگاریان کرد، بارەکە نەگەیشتە ئەنجام.(٢)

لە بەصرە جەنگ ڕوویداو ژمارەیەکی تر کوژران و عوسمان بەدیل گیرا و برا بۆ لای عائیشە، ئەویش داوای کرد ئازاد بکرێت، بەڵام شار کەوتە دەست سوپای عائیشە.(٣)

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، کە ئەمەی بیست بڕیاریدا بچێت بەرەو بەصرە، خەڵکێکی کەمی مەدینەی لەگەڵ بوو، ژمارەیەك لە هاوەڵانی بەشداربووی غەزای بەدری لەگەڵدا بوو، ژمارەی سوپاکەی عەلی تەنها نۆسەد کەس بوو، حەسەنی کوڕی داوای لێکرد نەچێت، عبداللەی کوڕی سەلامیش هەمان داوای لێکرد، بەڵام عەلی ڕازی نەبوو، ئینجا هەواڵی نارد بۆ کوفە تا بدەنە پاڵی، بەرەبەرە سوپاکەی (عەلی) ڕووی لە زیاد بوون بوو.(٤)

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

(٤) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٤ — ٢٣٥.

(عەلی) کە عوسمانی کوڕی حنیفی بینی و هەواڵی کارەکانی طەلحەو زوبەیری بیست، نزای کرد: خوایە! طەلحەو زوبەیر بەرامبەر بەو هەڵەی کردوویانە، بێدار بکەیتەوە.[1]

کاتێك زوبەیر لە بەصرە بوو کەسێك هات بۆ لای و وتی: ئەریَ بچم عەلی بکوژم؟

ئەویش وتی: چۆن دەیکوژیت لەکاتێکدا سەربازی زۆری لەگەڵدایە؟

ئەویش وتی: دەچمە ناو سوپاکەی و خۆمی لێ نزیك دەکەمەوەو دواتر دەرفەتی لێ دێنم.

زوبەیر وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (الإيمان قيد الفتك، لا يفتك مؤمن)[2]، (ئیمان نامەردکوژی کۆت کردووە، باوەڕدار نامەردکوژی ناکات).

دواجار ( قەعقاع ) کەوتە نێوانەوە، چووە بەصرەو، طەلحەو زوبەیری بانگهێشت کرد بۆ یەکڕیزیی و دوورگرتن لە دووبەرەکیی، سەرەتا لەگەڵ خاتوعائیشە قسەی کرد و وتی: دایە گیان! بۆچی هاتوویتەتە ئێرە؟

ئەویش وتی: کوڕی شیرینم بۆ ڕێککردنی باری نێوان خەڵك، ئینجا (قەعقاع) داوای کرد، طەلحەو زوبەیریش بانگ بکات، ئەوانیش هاتن، (قەعقاع) وتی: دایکی باوەڕداران دەڵێت: بۆ صولح هاتوم، ئەوانیش وتیان: ئێمەش بەس بۆ ئەوە هاتوین.

ئەویش وتی: دەی پێم بڵێن: ئەو صولحەتان لە چ ڕوانگەیەکەوەیە؟ ئەگەر بە ڕەوامان زانی، شوێنتان دەکەوین، ئەگەریش بە ڕەوامان نەزانی ئیتر هیچ.

ئەوانیش وتیان: بکوژانی عوسمانمان دەوێن لەناوببرێن.

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٥.

(٢) مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٧٥٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٣٧٥، صححه شعيب الأرناؤوط.

(قەعقاع) وتی: خۆ ئێوە بکوژانی ئەوتان لە (بەصرە) کوشت، شەش سەد کەستان کوشت، شەش هەزار کەس چوونە ڕیزی ئەوانەوەو دژتان وەستان، داوای تەنها کەسێکتان کرد، کە (حرقووص) بوو، شەش هەزار کەس بوونە پارێزەری، ئەمەی ئێوە داوای دەکەن بۆ چاکەیە، بەڵام خراپەیەکی زۆر گەورەی لێدەکەوێتەوە!

عائیشە وتی: ئەی تۆ چ چارەسەرێکت پێیە؟

(قەعقاع) وتی: من پێم وایە: دەرمانی ئەم دەردە ئارامگرتنە، تا بارەکە هێور دەبێتەوە، ئەمە بکەن، خێر و ڕەحمەت دێت، ئەگەریش ڕازی نەبن، باری خراپە زیاتر دەبێت بۆ هەردوو لامان.

ئەوانیش وتیان: دەی بۆچوونەکەت زۆ دروستە، برۆ ئەگەر (عەلی)ش هەمان ڕای هەبوو، ڕازی دەبین، ئەویش چوویەوە بینی (عەلی) هەمان ڕای هەیە، ئیتر هەردوولا ڕێککەوتن، عائیشەش نوێنەری نارد بۆ لای (عەلی) تا پێی بڵێت، ئەو تەنها بۆ صولح هاتووە، هەردوولا دڵخۆش بوون و، (عەلی)ش وتارێکی پێشکەش کرد بۆ خەڵکەکە، کە تیایدا باسی خراپیی دووبەرەکیی کرد و، نیازی ڕێککەوتنەکەی خستەڕوو.[1]

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٧.

## جەنگی جەمەل

لە وتارەکەی (عەلی)یەوە، دەستەی ئاژاوەگێڕان زانییان خەریکە ڕێکدەکەون، بۆیە کەوتنە خۆ، لەوانە: ( ئەشتەری نەخەعی و عبداللەی کوڕی سەبە و شریح و سالم) و چەندکەسێکی تر، کە هیچ هاوەڵێکیان تێدا نەبوو، نزیکەی دوو هەزار و پێنج سەد کەسێك دەبوون، کەوتنەخۆ و وتیان: ئەم ڕێککەوتنە دژ بە ئێمەیەو ژمارەشمان کەمە، ڕێککەوتنی ئەوان تەنها لەسەر خوێنی ئێمەیە، بۆیە دەبێت (عەلی)ش وەك عوسمان لێبکەین!

خەڵکەکەش ڕازیبوون، بەڵام عبداللەی کوڕی سەبە وتی: ڕایەکەتان زۆر خراپە، چونکە ئەوکات هەردوولا دەبنە دوژمن و لێتان دەدەن، بەڵکو دەبێت جەنگ لەنێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەڵبگیرسێنین.

کاتێك زوبەیر و طەلحە چوون بۆ لای (عەلی) تا ڕێکبکەون، دەستەی سەبەئیەکان خۆیان بەشکرد بەسەر هەردوولاداو جەنگیان هەڵگیرساند.

هەردوولا وایانزانی، کەسانی بەرامبەر ناپاکی نواندووە، بۆیە کەوتنە هێرش، سوپای عەلی نزیکەی بیست هەزار کەس و، سوپای خاتوعائیشەش نزیکەی سی هەزار کەس دەبوون، جەنگێکی قورس ڕوویدا، (عەلی) هاواری دەکرد: دەست هەڵگرن! بەڵام کەس نەیدەبیست، لەولاشەوە خاتوعائیشە بە سواری وشترێکەوە بۆ هەمان نیاز هات، (عەلی) هێندە بێزار بوو، بە حەسەنی کوڕی دەوت: کوڕەکەم! خۆزگە باوکت بیست ساڵ لەمەوبەر دەمرد.

(عەلی) چوو، تا زوبەیر و طەلحە بدوێنێت، وتی: ئەم سوپایەتان ئامادە کردووە، بیانووشتان بۆ قیامەتتان ئامادە کردووە؟

دەی لەخوا بترسن، من خوێنی ئێوەم حەڵاڵ نەکردووە، ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان پێیە بۆ ڕەوایی خوێنی من؟[1]

عبداللەی کوڕی زوبەیر، کە خوشکەزای خاتوعائیشە بوو، جڵەوی وشترەکەی عائیشەی پووری گرتبوو و، ئاگاداری پووری بوو، هیچ قسەیەکیشی نەدەکرد، لەو کاتەدا (ئەشتەری نەخەعی) هەڵمەتی بۆ برد و یەکتریان بریندار کرد، عبدالله هێندە بریندار بوو، کە دەوترێت: نزیکەی سی و حەوت برینی پێوە بووە.[2]

سوپای (عەلی) بەردەوام هەوڵیان دەدا، وشترەکەی خاتو عائیشە بخەن، تا بەوە سەرکەوتن ڕابگەیەنن، ئەوەبوو کوشتارێکی زۆر کران، تا دواجار توانییان وشترەکە بپێکن و بیخەن،خاتو عائیشەش لە کەژاوەکەی کەوتە خوارەوە.

(عەلی) فەرمانی کرد: خێرا کەژاوەکەی خاتوعائیشە ببەنە دەرەوە، فەرمانی کرد: موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر و عەممار خیوەتێکیان بۆ هەڵدا، موحەممەدی برای خاتوعائیشە لەناو سوپای (عەلی)دا بوو، ئینجا (عەلی) هات بۆ لای خاتوعائیشە و وتی: دایەگیان چۆنیت؟

وتی: باشم.

عەلی وتی: خوا لێت خۆش بێت، ئینجا یەك یەك، سەرکردەو کەسایەتیەکان دەهاتن، سەلامیان لە خاتوعائیشە دەکرد، دواتر کە شەو داهات،خاتو عائیشە هاودەم لەگەڵ موحەممەدی برای چوونەوە بەصرە، ئینجا (عەلی) پاش سێ ڕۆژ، فەرمانیکرد: چی کەلوپەلێ گیراوە، ببرێتە بەصرەو هەوادارانی خاتوعائیشە بێن، چییان هەبووە بیبەنەوە.

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٨ — ٢٤١.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٤.

خەڵکێ گلەییان کرد، کە بۆچی خوێنیان ڕەوا بێت، کەچی سامانیان ڕەوا نەبێت، با بیبەین؟

(عەلی)ش بە تووڕەییەوە وەك تانەیەك بۆیان، وتی: کامتان پێی خۆشە دایکی باوەڕداران ببات بۆ خۆی؟!

هەموان بێدەنگ بوون، دواتر خاتوعائیشە بڕیاریدا: بەصرە جێبهێڵێت، (عەلی) هەموو پێداویستییەکی بۆ ئامادەکردو، مۆڵەتیدا هەرکەسیش لە سوپاکەی ڕزگار بووە، لەگەڵی بگەڕێتەوە، ئینجا چل ئافرەتی بەصرەی هەڵبژارد، تا لەگەڵ خاتوعائیشە بچنەوە، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکریشی لەگەڵ ناردەوە.

ئەو ڕۆژەی بڕیار بوو خاتوعائیشە بڕوات، (عەلی) هاتە بەردەگاو خاتوعائیشەش بە کەژاوەکەوە هێنرایە دەرەوە، ماڵئاوایی لەخەڵك دەکرد، خاتوعائیشە وتی: کوڕە شیرینەکانم! کەستان لەسەر ئەم بارە سەرکۆنەمان نەکات، بەخوا، نێوانی من و عەلی، تەنها وەك ئافرەت و پارێزەرانی وایە، ئەو لای من لە کەسە هەرە چاکەکانە.

(عەلی)ش وتی: بەخوا ڕاست دەکات، نێوانمان وایە و ئەو هاوسەری پێغەمبەرەکەتانە لە دنیا و ئاخیرەتدا، ئینجا (عەلی) چەند کیلۆمەترێك لەگەڵ خاتوعائیشە چوو و بەڕێی کرد، خاتوعائیشەش چوو بەرەو مەککەو، لەوێ حەجی ئەو ساڵەی کرد و دواتر گەڕایەوە بۆ مەدینە.[١]

هەر لەو کاتەی خاتوعائیشە لە بەصرە بوو، عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب گلەیی لە عائیشە دەکرد، کە بۆچی وایکرد؟! خاتوعائیشەش زۆر پەشیمان بوو، دواتر (عەلی) کاروانی ئامادەکرد و خاتوعائیشەی بەرەو مەدینە ناردەوە، دوانزە هەزاریشی پێدا.[٢]

---

(١) البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٠٢٤٧.

(٢) سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٧٨.

خاتوعائیشە دوای جەنگی (جەمەل) زۆرپەشیمان بوو، کە چوویوو بەرەو بەصرەو، لە (جەمەل)دا بەشداری کردبوو، پێشتریش وای نەدەزانی بارەکە دەگاتە ئەوە، بۆیە دوای جەنگی جەمەل، هەرکات ئەو ئایەتە بخوێنرایە: (وقرن فی بیوتکن. واتە: ئەی ئافرەتان! لە ماڵەکانتاندا ئۆقرە بگرن)، خاتوعائیشە هێندە دەگریا، تا کوڵمەکانی تەڕ دەبوون![1]

---

(١) سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٧٧.

## لە خیلافەتی
## حەسەنی کوڕی عەلیدا

خاتوعائیشە لەو ماوەیەدا لە مەدینە مابوویەوەو کەناری گرتبوو، لە مەسەلە سیاسییەکاندا، هیچ قسەو کردارێکی نەبوو، پەیوەندیشی لەگەڵ حەسەنی کوڕی عەلیدا زۆر چاك بوو، تەنانەت دوای ئەوەش، کە وازی لە خیلافەت هێنا، حەسەنی کوڕی عەلی لە سەرەمەرگیدا، حوسەینی برای بانگ کرد و وەسیەتی بۆ کرد، تیایدا وتی: داوام لە خاتوعائیشە کردووە، ئەگەر مردم، مۆڵەتم بدات لە ماڵەکەی ئەودا لەلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەسپەردە بکرێم، ئەویش ڕازی بووە، دەڵێم لەوانەیە لە شەرمدا وتبێتی: بەڵێ و، ڕازی بووبێت، بۆیە ئەگەر مردم بڕۆ بۆ لای و داوای هەمان شتی لێ بکەرەوە، ئەگەر پێی خۆش بوو، ئەوە لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەم بکە، گومانم زۆرە خەڵکێك نەهێڵن ئەوە بکەیت، جا ئەگەر ڕێگرییان لێکردیت، لەسەر ئەوە لێیان مەپاڕێرەوەو، لەسەری مەڕۆ و لە (بەقیع) ئەسپەردەم بکە، چونکە لەوێش کەسانی پێشەنگی لێیە).[1]

---

(١) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.

## خاتو عائیشە و
## بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب

پەیوەندی نێوان عائیشەی دایکی باوەڕداران و خێزانی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب، پەیوەندییەکی دۆستانە بوو، هەرکام لەوان فەزڵی یەکتریان دەزانی، فەرموودەکانیش شایەتی ئەو ڕاستیەن، لێرەشدا بەنموونە چەند گێڕانەوەیەك دەخەینەڕوو:

خاتوعائیشە و فاطیمەی کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێکەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە:

خاتوعائیشە دەڵێت: دوای ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆچی کرد بۆ مەدینە، زەیدی کوڕی حارثەی نارد بۆ لامان و ئەبورافیعی مەولاشی لەگەڵدا نارد، دوو وشتر و پێنج سەد درهەمی پێدان، تا بۆ کۆچەکە چی وشتریان پێویستە بیکڕن.

ئەبوبەکریش، عبداللەی کوڕی ئورەیقیگی بە دوو، یان سێ وشترەوە نارد و، نامەیەکی نووسی بۆ عبداللەی کوڕی ئەبوبەکر و فەرمانی پێکرد،کە دایکی و من و ئەسمائی خوشکم بەودا بنێرێت بۆ مەدینە، ئەوەبوو کەوتنەڕێ، لەنیوەی ڕێدا (زەید) بە پارەکە سێ وشتری کڕی، دواتر هەموویان هاتنە مەککەو ڕێیان کەوتە طەلحەی کوڕی عبیداللە، کە دەیویست خێزانی ئەبوبەکر ببات بۆ مەدینە، ئەوەبوو هەموومان کەوتینەڕێ، زەید و ئەبوڕافیع، فاطیمە و ئوممو کەلسوم و سەودەی کچی زەمعەیان هێنان، هەروەها زەید، ئومموئەیمەن و ئوسامەی کوڕی زەیدی هێنا، عبداللەی کوڕی ئەبوبەکریش، دایکم و من

و ئەسمائی هێنا، طەلحەش هاودەم بە ئێمە هات و هەموو پێکەوە کەوتینەڕێ، تا گەیشتینە مەدینە، ئەو کات موسڵمانان خەریکی دروستکردنی مزگەوتی مەدینە بوون.[١]

**فاطیمە بە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) وت: بەڵێ، خۆشم دەوێت.**

جارێك هەندێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆبوونەوە، تا ناڕەزایی دەرببڕن بەرامبەر بەو خۆشەویستیە زۆرەی، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەیبوو بۆ عائیشە، جافاطیمەی کچی پێغەمبەریان نارد بۆ لای پێغەمبەرو وتیان: پێی بڵێ: بۆ خاتری خوا! لە خۆشەویستی بۆ عائیشە دادپەروەر بێت.

ئەویش چوو و ئەوەی بە پێغەمبەر وت، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (کچە ئازیزەکەم! ئایا ئەو ئافرەتەت خۆش ناوێت، کە من خۆشم دەوێت؟!).

فاطیمە وتی: با، گەڕایەوەو هەواڵەکەی دایەوە بە هاوسەرەکانی تری، ئینجا بڕیارياندا زەینەبی کچی جەحش بنێرن، زەینەب چوو بۆ لای پێغەمبەر و تووڕە بوو، وتی: ژنەکانت دەڵێن: بۆ خاتری خوا! بەرامبەر بە خۆشەویستیت بۆ عائیشە دادپەروەر بە، هێندە دەنگی بەرز کردەوە، تا کار گەیشتە ئەوەی قسەیەکی بەعائیشە وت !

عائیشەش لەولاوە دانیشتبوو، پێغەمبەر تەماشایەکی عائیشەی کرد، وەك پێی بفەرموێت: قسەت نییە؟ عائیشەش کەوتە وەڵامدانەوەی زەینەب، تا بێدەنگی کرد، پێغەمبەر تەماشایەکی عائیشەی کرد و فەرمووی: ئەوە کچی ئەبوبەکرە.[٢]

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٥٥.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢.

## عائیشە پەیامی فاطیمە دەگەیەنێت:

جارێك فاطیمە لای باوکی سکاڵای کرد، کە لەدەست کار و هەویر شێلان، چی بەدەستەکانی هاتووە؟ ئەوەبوو پاش ماوەیەك برێ دیل هێنران، کە ئافرەتیشی تێدا بوو، فاطیمە چوو، تا داوای خزمەتکارێك بکات، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەوێ نەبوو، بۆیە باسی حاڵی خۆی بۆ عائیشە کرد و پێی وت: بۆچی هاتووەو بە عائیشەی وت : تا بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بڵێت، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتەوە.

خاتوعائیشە بەپێغەمبەری وت: فاطیمە بۆ شتێکی لەو جۆرە هاتووە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) چوو بۆ ماڵەوە، عەلی و فاطیمەش لە جێگەدا بوون، ویستیان هەستن، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: لە شوێنی خۆتاندا بن، ئینجا هات و لەلایان دانیشت، فەرمووی: ( ألا أدلكما على خير مما سألتما، إذا أخذتما مضاجعكما فسبحا ثلاثا وثلاثين، واحمدا ثلاثا وثلاثين، وكبرا أربعا وثلاثين، فهو خير لكما من خادم[1]. واتە: ئایا شتێکی باشتر لەوەتان پێ نیشان نەدەم، کە داواتان کردبوون؟ ئەوا کە چوونە ناو جێگەکەتان، سی و سێ جار (سبحان الله) و سی و سێ جار (الحمد لله) و سی و چوار جار (الله أكبر) بکەن، ئەوە زۆر بۆتان باشترە لە خزمەتکارێك).

## خاتو عائیشە شایەتی پاکی بۆ عەلی و فاطیمە و حەسەن و حوسەین دەدات:

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: بەیانییەك پێغەمبەر چووە دەرەوەو جلێکی خوری لەبەر بوو، کە لە مووی ڕەش دروستکرابوو، ئینجا حەسەنی کوڕی عەلی هات و پێغەمبەر هێنایە ژوورەوە، دوای ماوەیەکی تر حوسەین هات و

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٩٦٢، صحيح مسلم، الرقم ٥٠١٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٥٦٠١، سنن أبي داود، الرقم ٤٤٢٤.

لەگەڵی هاتە ژوورەوە، دواتر فاطیمە هات و پێغەمبەر ئەویشی هێنایەژوورەوە، ئینجا (عەلی)ش هات و پێغەمبەر ئەویشی هێنایە ژوورەوە، ئینجا پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾.[١]

الاحزاب:٣٣

## عائیشە شایەتی بۆ ڕێزداری فاطیمە دەدات:

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: هیچ کەسم نەدیوە هێندەی فاطیمە هەڵسوکەوت و قسەکردنی لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بچێت، هەرکات فاطیمە دەچوو بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)،لەبەری هەڵدەستا و ماچی دەکرد و بەخێرهاتنی دەکرد و، دەستی دەگرت و لە پاڵ خۆیدا دایدەنیشاند.

هەرکاتیش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)بچوایە بۆ لای فاطیمە، فاطیمە لەبەری هەڵدەستا و ماچی دەکرد و، دەستی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم)دەگرت و ماچی دەکرد.[٢]

## خاتو عائیشە شایەتی دەدات فاطیمە گەورەی ژنانی بەهەشتە:

خاتو عائیشە دەڵێت: فاطیمە هات بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە دەچوو بەڕێدا، دەتوت: هەمان ڕێکردنی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: مەرحەبا لە کچەکەم،

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٤٥٥٤، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣١٤٦٢، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٢٦٦٢،

(٢) سنن أبي داود، الرقم ٤٥٦١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٧٧٨٤، صحيح ابن حبان، الرقم٧٠٦٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٨٩ وقال حسن صحيح، صححه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٥٢١٧.

ئینجا لای خۆیەوە داینیشاند، دواتر چپەیەکی بۆ کرد و فاطیمە گریا، وتم: بۆچی دەگریت؟

دواتر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)چپەیەکی تری بۆ کرد و فاطیمە دەستی کرد بە پێکەنین!

منیش وتم: تا ئێستا نەمدیوە خەم و خۆشی ئاوا لەیەك نزیك بن، وتم: چۆن بوو واگریایت و دواتر پکەنیت؟

فاطیمەش وتی: نهێنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ئاشکرا ناکەم، دواتر کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)وەفاتی کرد، چووم هەمان پرسیارم لێکردەوە.

ئەویش وتی: چپاندی بە گوێمدا (جیبریل هەموو ساڵێك یەك جار قورئانی لەگەڵ دەور دەکردمەوە، ئەمساڵ دوو جار لەگەڵم دەوری کردەوە، وادەزانم ئەمە ئاماژەی مەرگمە، تۆیش یەکەم کەسیت بە من دەگەیتەوە)، منیش دەستم کرد بە گریان، دواتر فەرمووی: (ئایا ڕازی نابیت تۆ گەورەی ژنانی بەهەشت - یان گەورەی ژنانی باوەڕداران - بیت؟) منیش بەوە پێکەنیم.[١]

---

(١) صحیح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

## عەلی شایەتی دەدات:
## خاتو عائیشە هاوسەری هەردوو دنیای پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم ) :

پاش ئەوەی جەنگی (جەمەل) ڕوویدا و، سوپای خاتوعائیشە شکستی خوارد، (عەلی) هات بۆ لای خاتوعائیشە وتی: دایەگیان چۆنیت؟

وتی: باشم.

عەلی وتی: خوا لێت خۆش بێت، ئینجا یەك یەك، سەرکردەو کەسایەتیەکان دەهاتن سەلامیان لە خاتوعائیشە دەکرد، دواتر کە شەو داهات، خاتوعائیشە هاودەم لەگەڵ موحەممەدی برای چوونەوە بەصرە، ئینجا (عەلی)، پاش سێ ڕۆژ فەرمانیکرد: چی کەلوپەلێ گیراوە، ببرێتە بەصرەو هەوادارانی خاتوعائیشە بێن چییان هەبووە ببەنەوە.

خەڵکێ گلەییان کرد، کە بۆچی خوێنیان ڕەوا بێت، کە چی سامانیان ڕەوا نەبێت، با بیبەین، (عەلی)ش بە تووڕەییەوە وەك تانەیەك بۆیان، وتی: کامتان پێی خۆشە دایکی باوەڕداران ببات بۆ خۆی؟!

هەموان بێدەنگ بوون، دواتر عائیشە بڕیاریدا بەصرە جێبهێڵێت، (عەلی) هەموو پێداویستییەکی بۆ ئامادە کرد و مۆڵەتیدا هەرکەسیش لە سوپاکەی ڕزگار بووە، لەگەڵی بگەڕێتەوە، ئینجا چل ئافرەتی بەصرەی هەڵبژارد، تا لەگەڵ خاتوعائیشە بچنەوە، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکریشی لەگەڵ ناردەوە.

ئەو ڕۆژەی بڕیار بوو خاتوعائیشە بڕوات، (عەلی) هاتە بەردەگاو خاتوعائیشەش بە کەژاوەکەوە هێنرایە دەرەوەو ماڵئاوایی لە خەڵك دەکرد، عائیشە وتی: کوڕە شیرینەکانم، کەستان لەسەر ئەم بارە سەرکۆنەمان نەکات، بەخوا نێوانی من و عەلی، تەنها وەك ئافرەت و پارێزەرانی وایە، ئەو، لای من لە کەسە هەرە چاکەکانە،

(عەلی)ش وتی: بەخوا ڕاست دەکات نێوانمان وایە، ئەو، هاوسەری پێغەمبەرەکەتانە لە دنیا و ئاخیرەتدا، ئینجا (عەلی) چەند کیلۆمەترێك لەگەڵ خاتوعائیشە چوو و بەڕێی کرد، خاتوعائیشەش چوو بەرەو مەککەو، لەوێ حەجی ئەو ساڵەی کرد و دواتر گەڕایەوە بۆ مەدینە.[1]

## خاتو عائیشە شوێنی گۆڕی خۆی دەدات بە حەسەنی کوڕی عەلی:

حەسەنی کوڕی عەلی لە سەرەمەرگیدا حوسەینی برای بانگ کرد و وەسیەتی بۆ کرد، تیایدا وتی: من داوام لە خاتوعائیشە کردووە، ئەگەر مردم، مۆڵەتم بدات لە ماڵەکەی ئەودا لەلای پێغەمبەر ئەسپەردە بکرێم، ئەویش ڕازی بووە، دەڵێم: لەوانەیە لە شەرمدا وتبێتی : بەڵێ و ڕازی بوویێت، بۆیە ئەگەر مردم بڕۆ بۆ لای و داوای هەمان شتی لێ بکەرەوە، ئەگەر پێی خۆش بوو، ئەوە لە ماڵەکەی ئەودا ئەسپەردەم بکە.[2]

کاتێك حەسەنی کوڕی عەلی وەفاتی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی، حوسەینی برای چوو بۆ لای عائیشەو داوای لێکردەوە، کە حەسەنی برای لای پێغەمبەر ئەسپەردە بکرێت، ئەویش ڕازی بوو و، وتی: باشە، بەڵام مەڕوان ڕێی نەدا و لە (بەقیع) ئەسپەردە کرا.[3]

---

(١) البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٠٢٤٧.

(٢) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.

(٣) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٢.

**خاتوعائیشە لەسەر حوسەین، ئامۆژگاری موعاویە دەکات:**

کاتێك موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، بەیعەتی بۆ یەزیدی کوڕی وەرگرت، حوسەینی کوڕی عەلی و چەندکەسێکی دی ناڕازی بوون، جا خاتوعائیشە وای بیست، کە موعاویە هەڕەشەی لەوانە کردووە، ئەگەر بەیعەت نەدەن دەیانکوژێت، بۆیە عائیشە ئامۆژگاری موعاویەی کرد و پێی وت: بیستوومە هەڕەشەی کوشتنت لەوانە کردووە!

موعاویە وتی: ئەی دایکی باوەڕداران! ئەوانە زۆر لەوە شکۆدارترن، کە هەڕەشەی کوشتنیان لێ بکەم، بەڵام من بەیعەتم بۆ (یەزید) وەرگرتووە، خەڵکی جگە لەوان بەیعەتیان داوە، جا ڕات وایە دوای ئەو هەمووە، بەیعەتەکەی لەکار بخەم؟!

خاتوعائیشە وتی: دەی بەرامبەریان نەرمونیان بە، ئەگەر خوا بیەوێت، دێنە سەر ڕاکەت.

موعاویەش وتی: وادەکەم.[١]

---

(١) الكامل في التاريخ، ج٣، ص ٣٥٣.

## عائیشە لەنێوان هەوادارن و نەیارانیدا

بە گشتیی ئەوانەی هەڵوێستی نەیارییان هەیە، بەرامبەر بەدایکی باوەڕداران، خاتو عائیشە، خۆیان لە دوو دەستەدا دەبیننەوە:

**دەستەی یەکەم:** دڵسۆزانێکی ئیسلام، کە بە نەشارەزایی هەڵوێست دەنوێنن، ئەوانە پێیان وایە، کە شکاندنی خاتوعائیشەو تانە لێدانی، سەرخستنی دینە! ئەمانەش چەند جۆرێکن:

هەوادارانی ئالوبەیتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)،کە بەپێی شرۆڤەیەکی مەزهەبی، پێیان وایە: ئالوبەیت، تەنها لە خێزانی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبدا بەرتەسك بووەتەوە، جا قەناعەتیشیان پێکراوە، کە خاتوعائیشەو عەلی، هەر لە کۆنەوە نەیاری یەك بوون و، خاتوعائیشە ئامانجی بووە، هەر مافێکی ئاسمانی و زەمینی عەلی زەوت بکات و، وا بکات بە مافی ڕەوای خۆی نەگات.

ئیتر لێرەوە لە بری گەڕانێکی بێلایەنانە بە دوای ڕاستییەکاندا، دەکەونە هەوڵی کۆکردنەوەی بەڵگە بۆ ئەو قەناعەتەیان، جا چ داماویەکە،کە چاو لە ئایەتێ دابخەن، کە خاتوعائیشەی بەدایکی باوەڕداران دانابێت و، بەدوای بڕێ ڕیوایەتی بێ سەنەددا بگەڕێن.

ئەمانە پێویستیان بەدڵسۆزیی هەیە، دەبێت کەسانێکی دڵسۆزی شارەزای نەرمونیان ببنە هاریکاریان و، بەو چاوەوە بۆیان بڕوانن، کە خوشك و برای خۆیانن و خەریکە دەکەونە چاڵێکی ئاگرینەوە، تا لێواری چاڵەکە دەبێت دەستیان ڕاکێشن بەرەو نەملا، ئەو کاتەی هیوای ڕزگاربوون نەما، ئەوجا دەستیان لێ

بەربدەن، تا ئەوانیش نەکەونە ئەو چاڵەوە، بەڵام نابێت لە نێوەندی ئەو دڵسۆزی نواندن و نەرمونیانییەدا دەستبەرداری تاکە حەقیقەتێك بن، چۆن ڕاشکاوانە دەبێت بڵێین:خاتو عائیشە لە خیلافەتی عەلیدا ئیجتیهادی هەڵەی کرد، بە هەمان شێوە دەبێت، تا دواجار جەخت لەوە بکەنەوە،کەخاتو عائیشە پاك بووەو دایکی باوەڕداران و خۆشەویستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و، گەورە زانایەکی ئوممەتی ئیسلام بووە.

دەستەیەکی تر لەوانەی دڵسۆزییەکی نەشارەزایانە دەنوێنن، بریتین لە: موسڵمانانێکی دەروون بەزیو بەرامبەر بە نەیارانی ئیسلام و، مێژووی ئیسلام و لەپێناو ڕازیکردنی دڵی نەیارانی ئیسلامدا، ئامادەن تانە بدەن لە خاتوعائیشە، ئەوەش بە پاراستنی دین بزانن، وادەزانن: ئەگەر بڵێین:خاتو عائیشە هەندێ فەرموودەی هەڵبەستووە بەدەم پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم)، ئیتر ئیسلامیان سەرخستووە، بێئاگا لەوەی خوای گەورە، بەدەقی ئایەت ڕاستگۆیی عائیشەی سەلماندووە!

یان هەندێ لەپێناو ڕاگرتنی بەرزیی و شکۆی کەسانێکی تری وەك: خەدیجە، یان فاطیمەو...هتد، دێن لە شان و شکۆی خاتوعائیشە کەم دەکەنەوە، تا لەو مشتومڕەی دەوترێت:خاتو عائیشە پلەی بەرزترە، یان خەدیجە، یان خاتوعائیشەو فاطیمە، کامیان پلەیان بەرزترە؟ بەڵکو خاتوائیشە بخەنە ڕیزی دووەمەوە، هەموو ئەم جۆرە کەسانەی وا دەڕواننە خاتوعائیشە، نییەتێکی چاك و ڕێگەیەکی هەڵەو خراپیان گرتووەتەبەر!

**دەستەی دووەم:** نەیارانێکی شارەزای کینەلەدڵ، ئەمانە لە نەشارەزاییانەوە نییە،کە تانە لە خاتوعائیشە دەدەن، بەڵکو چاك شارەزای بارەکەن، بەڵام لەپێناو سەرخستنی بڕواو ڕوانینی خۆیان،دەکەونە تانەدان لە خاتوعائیشە، جا ئەمانە، یان کەسانێکن لەنێو ڕێبازی شیعەدا، یان کەسانێکن لە ڕۆژهەڵاتناسان، کە مەبەستیانە لە خستنی خاتوعائیشەوە بدەن، لە خودی کەسێتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، زمان و دەست و دڵی ئەمانە بە دوو هۆکار دەوەستێت: یان

خوای گەورە ڕێنموونییان پێ ببەخشێت، یان موسڵمانان وەڵامی ڕەواو یەکلا بە گومانەکانیان بخەنەڕوو، هەر هێرشێکی هەرچەشنەی ئەوان وەڵام بدەنەوە.

خستنی خاتوعائیشەو تانەلێدانی، تەنها بریتی نییە لە لابردنی کەسێتییەك لە مێژووی ئیسلامیدا و بەس، بەڵکو ئەگەر بڵێین: ئەو تۆمەتانەی دەدرێنەوە پاڵ خاتوعائیشە ڕاستن، ئەوە دەبێت بەم دەرەنجامانەش ڕازی بین:

**یەکەم:** گومانکردن لەقورئانی پیرۆز، چونکە قورئانی پیرۆز، خاتوعائیشەی بەدایکی باوەڕداران ناوبردووە:

(ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ.......)

واتە: پێغەمبەر بەبڕواداران لەخۆیان لە پێشترە، هاوسەرەکانیشی دایکانی بڕوادارانن)، کەواتە، چۆن دەکرێت قورئان ئافرەتێکی خراپەکار بە دایکی باوەڕداران وەسف بکات؟!

نەك تەنها دایکی موسڵمانان، بەڵکو دایکی باوەڕداران، وەك دەشزانین باوەڕداریی، پلەیەکی بەرزترە لە موسڵمانێتی، هەروەها خوای گەورە بە دەقی ئایەت، پاکیی خاتوعائیشەی سەلماندووە وەك پێشتر لە ڕووداوی( ئیفك)دا باسمان کرد.

**دووەم:** گومان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)بکەین، چ لە ڕاستگۆیی، چ لە غیرەتی، چ لە پەیڕەویی، چونکە چۆن دەکرێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)،ئافرەتێك بە هاوسەری خۆی بهێڵێتەوە، کە تووشی زینا بوویێت؟! هاوکات لەسەر ئەو ئافرەتە، سزای هاوەڵانی خۆی بدات، پاشان حوکمی ئیسلامی بەسەردا جێبەجێ نەکات، لە کاتێکدا سوێندی دەخوارد، کە ئەگەر فاطیمەی کچم دزی بکات، دەستی دەبڕم!

**سێیەم:** بەخستنی خاتوعائیشە بەجارێك، سەدان فەرموودەی ناو کتێبەکانی فەرموودە لەکاردەکەون، چونکە گێڕەرەوەکەیان خاتوعائیشە بووە، جا خاتوعائیشە خۆی هێندە تاوانی هەبوویێت، چۆن فەرموودەی لێوە وەربگیرێت؟!

**چوارەم:** عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ستەمێکی گەورەی کردووە، کە ئافرەتێکی وا تاوانباری پاش جەنگێکی سەخت و خوێن ڕژانێك گرتبێت، ئینجا بە دایك ناوی ببات و بەڕێی بکات بۆ مەدینەو، پارەشی پێ بدات و هیچ سزایەکی نەدات، لەکاتێکدا بەرامبەر بە خەواریجەکان ئەوەی کرد، کە کردی!

**پێنجەم:** کۆمەڵگەی سەردەمی هاوەڵان و دەستەی یەکەمی، بەو هەموو تاوانەوە ڕێڕەوی بەشێك لە کۆمەڵگەی ئیسلامی و لایەکی فراوانی زانستی ئیسلامی بگرێتە دەست.

بۆیە مەسەلەی تانەدان لە خاتوعائیشە، تەنها تانەدان نییە لە کەسایەتییەکی ئاسایی و بەوە کۆتایی بێت، بەڵکو تانەدانە لە کەسێتییەك، کە بەشێك لە بنەڕەتەکانی ئەم دینە پێوەی پەیوەست بوون، قورئان و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵان و کۆمەڵێك لە فەرموودەو فەتوا، ناشگونجێت یەك کۆمەڵگەی گەورە دەرفەت بدەن، ئافرەتێکی خراپ (دوور لە دایکمان عائیشە) بتوانێت بە ویستی خۆی چی دەوێت بیکات!

## موسڵمانبوونی عەبباس

بەپێی چەند بەڵگەیەك دەردەكەوێت: عەبباسی مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هەر زوو لە مەككە موسڵمان بووە، بەڵام موسڵمانبوونەكەی شاردۆتەوە، تا پشتیوانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)بكات و، كاری هەواڵگریی و پێویستی ئەركەكانی مەككەی بۆ ڕاپەڕێنێت.

مەسەلەی بەشداربوونی لە (بەدر)دا پەیوەستە بە گوێڕایەڵی عەبباس بۆ فەرمانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، نەك دژایەتیكردنی، چونكە عەبباس وەك هەواڵگری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەككە مابوویەوە، ئەگینا خۆشەویستی بەرچاوی عەبباس، بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە چەندین هەڵوێستدا دیارە، وەك: چوونی بە تەنها لەگەڵی، بۆ بەیعەتی (عەقەبە) و ڕاسپاردەی بۆ پشتیوانان، تا تەواو نازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕاگرن و وریای بن.[1]

هەروەها لە (بەدر)دا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی كرد: هەركەس گەیشت بە عەبباس نەیكوژێت، چونكە بە نابەدڵی هاتووە،[2] كاتێكیش بەدیل گیرا، بە پێغەمبەری خوا، ناوی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دەبرد، نەك بە موحەممەد،[3] لە كاتێكدا برازاشی بوو، ئیتر چۆن لە دژی شمشێر هەڵگرێ؟! بەڵكو عەبباس كاتێ ویستی كۆچ بكات بۆ مەدینە،

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٦٠.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٢٨٤.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٢٧٨.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (مقامك بمكة خير. واتە: مانەوەت لە مەککە چاکترە)، ئەویش لە مەککە مایەوە و لەوێ هەواڵی دەنارد بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).[١]

ئەبورافیعی خزمەتکاری عەبباس دەڵێت: من خزمەتکاری عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب بووم و موسڵمان ببووم، ئوممولفەضلی ژنی عەبباس و، خودی عەبباسیش موسڵمان ببوون، بەڵام عەبباس موسڵمانبوونەکەی خۆی دەشاردەوە.[٢]

**لەم بەسەرهاتەوە ڕوونتر بابەتەکەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:**

کاتێك حەججاجی کوڕی عیلاط موسڵمان بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا!من لە مەککە، ژن و منداڵ و سامانم جێهێشتووە، دەبێت بچم بیانهێنم، جا ئەگەر ناچار کرام بەرامبەر بە تۆ قسە بڵێم، مۆڵەتم دەدەیت؟ پێغەمبەریش مۆڵەتی پێدا، تا چی ویست بیڵێت، ئەویش چوویەوە بۆ مەککەو، بە ژنەکەی وت: چیت هەیە کۆی بکەرەوە، چونکە من دەمەوێت شتێك لە سامانی فەوتاوو مەرو ماڵاتی موحەممەد و هاوەڵانی بکڕم، چونکە ئەوان لە جەنگدا دۆڕاون و حاڵیان شڕە،[٣] وا موحەممەد لەلایەن جولەکەکانەوە بەدیل گیراوەو هاوەڵەکانیشی، یان کوژراون، یان بڵاوەیان لێکردووە.[٤]

ئەو هەواڵە لە مەککە بڵاوبوویەوەو موسڵمانەکانی مەککە پێی دڵگران بوون، بێباوەڕەکانیش پێی دڵخۆش بوون، هەواڵەکە گەیشتە عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب، عەبباسیش، کە ئەوەی بیست، لە پێ کەوت و دۆش داما،

---

(١) أسد الغابة، ج٣، ص١٦٣.

(٢) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٣٧٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٣٢٢٥، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

(٣) صحيح ابن حبان، الرقم ٤٦٠٠، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٧١٥٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢١٦٦، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣٣٨٣، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣١٢٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٤) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٠٨.

نەیئەتوانی بجووڵێت، ئینجا عەبباس،کە کوڕێکی هەبوو، ناوی (قوثەم) بوو، زۆر لە پێغەمبەر دەچوو، ڕاکشا و لەسەر سنگی داینا و شیعری دەهۆنییەوە، کە تیایدا دەیوت: خۆشەویستم لە پێغەمبەری خوا دەچێت:

حـبي قثـم حبـي قثـــم
شبــيه ذي الأنـــف الأشـم

نــبــي رب ذي النـــعـــم
بــرغــم أنــف مــن رغـم

ئینجا غولامێکی نارد بۆ لای حەججاجی کوڕی عیلاط و پێی وت: ماڵوێران! ئەمە چ هەواڵێك بوو هێنات؟ تۆ چی دەڵێیت؟

بەڵێنی خوا لەو هەواڵەی تۆ باشترە.

حەججاجیش بە غوڵامەکەی وت: سەلامم بگەیەنە بە ئەبولفەضل و پێی بڵێ: بچێتە ماڵێکەوە، تا بە تەنها ببینم، چونکە هەواڵێکم هەیە بۆی، کە دڵی خۆش دەکات، غولامەکە هاتەوە، کە گەیشتەوە بەردەرگا، وتی: ئەی ئەبولفەضل! موژدەت لێبێت، عەبباسیش لە خۆشیدا خۆی بۆ فڕێدا و ناوچاوانی ماچ کرد، ئەویش هەواڵی قسەکانی حەججاجی پێدا!

عەبباسیش ئەو غوڵامەی ئازاد کرد، ئینجا چوو بۆ لای حەججاج و ئەویش هەواڵی دروستی پێ وت، وتی: پێغەمبەری خوا خەیبەری فەتح کردووەو، سامانی ئەوانی بەدەستکەوت گرتووە، پێغەمبەرلە دەستکەوتەکاندا، (صەفیەی کچی حویە)ی بۆ خۆی هەڵبژارد و سەرپشکی کرد، ئایا ئازادی بکات و ببێتە ژنی، یان بچێتەوە بۆ ناو ماڵ و کەسوکاری خۆی، ئەویش پێی باش بوو ئازادی بکات و شوو بکات بە پێغەمبەر، منیش بۆیە هاتوم بۆ ئێرە، تا ئەو سامان و ژن و منداڵەی لێرە هەمە، ببەم و بڕۆم، مۆڵەتیشم لە پێغەمبەر وەرگرت و ئەویش مۆڵەتی دام چی پێویست بکات بیڵێم، جا تکام وایە، تا سێ ڕۆژ هیچ نەڵێیت، دوای سێ ڕۆژەکە چیت پێ خۆش بوو، باسی بکە.

ئەوەبوو ژنەکەی حەججاج چی خشڵ و پێویستی هەبوو، کۆی کردەوەو دای بە حەججاج، حەججایش هەموو برد لەگەڵ خۆی و کەوتەڕێ، دوای تێپەڕبوونی سێ ڕۆژەکە، عەبباس چوو بۆ لای ژنەکەی حەججاج و وتی: مێردەکەت کوا؟

ئەویش هەواڵی ئەوەی پێدا، کە حەججاج چووە بۆ مەدینە، ئینجا وتی: خوا سەرشۆڕت نەکات ئەی ئەبولفەضل! ئەوەی پێت وتین زۆر لەسەرمان قورس بوو.

ئەویش وتی: بەڵێ خوا سەرشۆڕم ناکات، سوپاس بۆ خواش، تەنها ئەوە ڕوویداوە، کە حەزمان پێ بووە، حەججاج هەواڵی پێداوم، کە خوای گەورە فەتحی خەیبەری بەخشیوە بە پێغەمبەرەکەی و، تیایدا پشکەکان جیاکراونەتەوەو، پێغەمبەر (صەفییە)ی هەڵبژاردووە بۆ خۆی، جا ئەگەر پێویستیەکت هەیە بە مێردەکەت، ئەوە بڕۆ و خۆت بگەیەنە پێی.

ژنەکەی حەججاجیش وتی: سوێند بەخوا، بڕوات پێدەکەم.

ئەویش وتی: من ڕاست دەڵێم و مەسەلەکە ئاوەهایە، کە پێم وتیت، ئینجا عەبباس چوویەدەرەوەو چوو بۆ کۆڕی قوڕەیشیەکان، دەیبیست دەیانوت: ئەی ئەبولفەضل! بەس خێرت بێتەڕێ.

ئەویش وتی: سوپاس بۆ خوا خێرم هاتوەتەڕێ و حەججاجیش هەواڵی پێداوم، کە خوای گەورە فەتحی خەیبەری بەخشیوە بە پێغەمبەرەکەی و، تیایدا پشکەکان جیاکراونەتەوەو پێغەمبەر (صەفییە)ی هەڵبژاردووە بۆ خۆی، حەججاج داوای لێکردم سێ ڕۆژ ئەو قسەی بشارمەوەو نەیڵێم، ئەو تەنها بۆ ئەوە هاتبوو، چی سامانی هەیە بیبات و بڕوات.

بەو هەواڵە خوای گەورە دڵتەنگی سەر موسڵمانانی هەڵگرت و دای بەسەر بێباوەڕاندا، چی موسڵمانی دڵتەنگی مەککەش هەبوون، دەهاتن بۆ لای عەبباس، ئەویش هەواڵی پێدەدان و، موسڵمانانیش دڵخۆش دەبوون![1]

---

(١) صحيح ابن حبان، الرقم ٤٦٠٠، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٧١٥٧، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢١٦٦، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٣٣٨٣، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣١٢٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

ئەم بەسەرهاتە، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی،کە عەبباسی مامی پێغەمبەری خوا، پێشتر موسڵمان بووەو مانەوەی لە مەککە، بەڕێنمایی پێغەمبەری خوا بووە، تا هەم هەواڵی قوڕەیشییەکان بنێرێت بۆ پێغەمبەری خوا، هەم ئاگای لە موسڵمانبووەکانی ناو مەککە بێت.

وەك دەبینین، کاتێك هەواڵی ناخۆش سەبارەت بە پێغەمبەری خوا و موسڵمانان دەبیستێت، زۆر دڵتەنگ دەبێت، هەروەها کاتێکیش هەواڵە ڕاست و دڵخۆشکەرەکە دەبیستێت، زۆر دڵخۆش دەبێت، موسڵمانانیش دێن بۆ لای و ئەویش موژدەیان پێدەدات.

واتە: لەوێ وەك جەمسەرێك بووە بۆ موسڵمانە لاوازەکانی ناو مەککە، کە توانای کۆچیان نەبووەو هەواڵی خۆشی و ناخۆشی موسڵمانانیشیان لەوەوە وەرگرتووە، لەو بارەوە ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: (دەوترێت: عەبباس پێش غەزای (بەدر) موسڵمان بووەو، هەواڵی بێباوەڕانی دەنارد بۆ پێغەمبەرو، موسڵمانانی مەککە وەك پشتێك تەماشای عەبباسیان دەکرد.

عەبباس حەزی لەوە بوو بچێت بۆ لای پێغەمبەر، بەڵام پێغەمبەر نامەی بۆ نووسی، کە مانەوەت لە مەککە باشترە، بۆیە پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی (بەدر)دا فەرمووی: (هەرکامتان گەیشت بەعەبباس با نەیکوژێت، چونکە ئەو بەناچاریی هاتووە).[١]

هەروەها عەبباس، وردەکاری کارو ئامادەکارییەکانی قوڕەیشییەکانی بە نامە دەنووسی بۆ پێغەمبەر، وەك چۆن لە غەزای (ئوحود)دا کاتێك قوڕەیش، خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ، عەبباس هەموو زانیارییەکانی بە نامەیەکدا نارد بۆ پێغەمبەر[٢].

---

(١) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٨١٢.

(٢) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣٧.

عەبباس بە ناچاریی و بە نابەدڵیی، لە جەنگی (بەدر)دا لەگەڵ بێباوەڕاندا، بەشداری کرد و تیایدا بە دیل گیرا، جا کابرایەکی باڵاکورتی پشتیوانیی، عەبباسی بە دیلی هێنا، کە گەیشتنە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لبەخوا ئەمە منی بەدیل نەگرت، کەسێکی زۆر کەشخە، کە لەسەر ئەسپێکی ڕەش و سپی بوو منی گرت، ئەو کەسە لەناو ئەم خەڵکەدا نابینم.

کابرای پشتیوانیی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من ئەوم بەدیل گرت.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بێدەنگ بە!خوا بە فریشتەیەکی ڕێزدار پاڵپشتی کردیت.[1]

پێش ئەوەی جەنگی (بەدر) ڕوویدات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵانی فەرموو: هەرکەس عەبباسی بینی، نەیکوژێت، چونکە بە نابەدڵی دەرچووە.[2]

ئەبوحوذەیفە وتی: یانی باوك و کوڕ و برای خۆمان بکوژین و عەبباس نەکوژین؟!

بەخوا بگەم پێی بەشمشێر پارچە پارچەی دەکەم!

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)کە ئەوەی بیستەوە، بە عومەری فەرموو: (ئەی ئەبوحەفص! ڕەوایە بە شمشێر بدرێت لە دەموچاوی مامی پێغەمبەری خوا؟).

عومەر وتی: ئەی پێغەمبەر !مۆڵەتم بدە بە شمشێر بدەم لە گەردنی ئەو کابرایە، ئەوە مونافیق بووە.

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٩١٩، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٢٨٤.

ئەبوحوذەیفە پەشیمان بۆوە لەو قسەیەی کردی، دواتریش هەمیشە دەیوت: هیچ کات دڵنیا نیم لەو قسەی ئەو ڕۆژە کردم، هیوام وایە: تەنها شەهیدبوونم، ئەو تاوانەم لەسەر بسڕێتەوە.(١)

ئەو شەوەی عەبباس دیل بوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)نەخەوت، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! بۆچی ناخەویت؟!

فەرمووی: نرکەی عەبباسی مامم بیست، کە کۆتکراوە، ئەوانیش چوون کۆتەکەیان لابرد، ئیتر عەبباس بێدەنگ بوو، ئینجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خەوت!(٢)

دواتر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە عەبباسی فەرموو: ئەی عەبباس! خۆت و (عەقیل)ی برازات و (نەوفەلی کوڕی حارث) و (عوتبە)ی هاوپەیمانت بە سامان ئازاد بکە، چونکە تۆ سامانت هەیە!

ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەر !من موسڵمان بووم، بەڵام هۆزەکەم بە زۆر منیان هێنا.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: خوا زاناترە بە موسڵمان بوونت، ئەگەر وابێت، کە دەیڵێیت، ئەوە خوا پاداشتت دەداتەوە، بەڵام ڕووکەشی بارەکەت ئەوەیە، کە دەبێت خۆت ئازاد بکەیت، ئەویش وایکرد.(٣)

کاتێك بێباوەڕان خۆیان بۆ جەنگی (ئوحود) ئامادە کرد،عەبباس وردەکاری زانیاری بێباوەڕانی بە نامەیەك بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ی نووسی.(٤)

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٩٤١.

(٢) السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٨٧٥.

(٣) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ١٣-١٤.

(٤) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ٣٧.

## ململانێی هاشمی و ئومەویەکان

یەکێك لەو گومانانەی، کە لە مێژوی ئیسلامیدا زەقکراوەتەوە، بریتییە لە: مەسەلەی ململانێی نێوان هاشمی و ئومەویەکان، واش هاتووە، کە ئەبوسوفیان ڕێبەرێکی دیاری ئەو مەیدانە بوویێت، جا ئایا ئەمە ڕاستە، یان نا؟

ململانێی نێوان هاشمی و ئومەویەکان، ڕاستییەکی ناو مێژووی ئیسلامییەو حاشای لێ ناکرێت، بەڵام تەوقیتی ڕووداوەکە هەڵوەستەی دەوێت، چونکە شیعە پێیان وایە: ئەو تەوقیتە لە سەردەمی پێغەمبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)بووە، بەڵام لەڕاستیدا، ئەو ڕووداوە لە سەردەمی پاش شەهیدبوونی عوسمانی کوڕی عەففانەوە، سەرهتایەکی دەرکەوت، تا لە نێوەندەکانی دەوڵەتی ئومەویدا، بوو بە ئامانجی ڕوون، دواتریش بە لەناوچوونی دەوڵەتی ئومەوی، ئەو مەسەلەیە پووکایەوە.[1]

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێشتا سروشی بۆ دانەبەزیبوو، لە جەنگی (فوجار)دا بەشداری کرد، کە سەرکردەی سوپاکە (حەربی کوڕی ئومەییە)ی ئومەوی بوو،[2] هاشمییەکانیش تیایدا هاوشانی ئومەویەکان بەشداربوون، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دەفەرموێت: (من تیرم دەدایەوە دەست مامەکانم)،[3] دەی مامەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و خودی پێغەمبەریش، هاشمی بوون.

---

(١) خوێنەری نازیز! بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە، بڕوانە کتێبەکەی دکتۆر عبدالشافي محمد عبداللطيف،تایبەت بە دەوڵەتی ئومەوی، کە وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٨٩.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٠.

ئەگەر تەماشا بکەین، لە گەڵ هاتنی ئیسلامدا، بەشێك کەسایەتی دیاری ناو ئومەویەکان بڕوایان بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێنا، کە لە هاشمییەکان بوو، لەوانە:

عوسمانی کوڕی عەففانی ئومەوی، کە زاوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو و، دوو کچی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) بە هاوسەر گرت، کە لە یەکەمین موسڵمانبوانی مەککە بوو، لە دە یەکەمین موسڵمان بووەکانە، گێڕانەوە هەیە، کە چوارەم کەسە موسڵمان بووە.[١]

خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییەیە، کە لە قوڕەیشییەکانە لە ئومەویەکان،[٢] زۆر زوو موسڵمان بوو، دەوترێت: چوارەم، یان پێنجەم کەس بووە موسڵمان بووە.[٣]

خالیدی کوڕی سەعید، نووسەری خزمەت پێغەمبەر بوو و نامەکانی بۆ دەنووسی،[٤] هەروەها سروشیشی بۆ پێغەمبەر دەنووسیەوە.[٥]

هەریەك لە (ئەبان) و(عەمر) دوو برای تری بوون، کە هەر زوو لە مەککە موسڵمان بوون.[٦]

---

(١) أسد الغابة، ج٣، ص ٦٠٦.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٦.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٦

(٤) البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤.

(٥) البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٤٠.

(٦) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٦.

**با تەماشایەکی ڕووداوەکانی کاتی فەتحی مەککەیش بکەین:**

عەبباسی هاشمی، کە مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، پەیوەندییەکی پتەوو دۆستانەی هەبوو، لەگەڵ ئەبوسوفیانی سەرکردەی ئومەوییەکاندا، ئەوەتا پێشتر لە کاری بازرگانیدا پێکەوە دەردەچوون.[١]

لە کاتی فەتحی مەککەشدا، عەبباس خەمی ئەبوسوفیان دەخوات و هانی دەدات، تا موسڵمان بێت و خۆیشی دەیبات بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پەنای دەدات، تا دەیگەیەنێتە خزمەتی و، دوای موسڵمان بوونی ئەبوسوفیانیش، داوا لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات، شکۆ و پێگەیەکی تایبەتی بۆ دابنێت.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ڕیاکەی وەردەگرێت، جا ئەگەر دوژمنایەتی هاشمی و ئومەوی هەبوایە، بۆ عەبباسی هاشمی ئەو هەموو دڵسۆزییە، بۆ سەرکردەی ئومەوییەکان نیشان دەدات، لەکاتێکدا ئەوە چاکترین دەرفەتی لەناوبردنی ئومەوییەکان بوو؟!!!

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)پاش فەتحی مەککە، عەتتابی کوڕی ئەسیدی کرد بە بەرپرسی مەککەو، تا ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە والی مەککە مایەوە.[٢]

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەبوسوفیانی کرد بەبەرپرسی ناوچەی (نەجران) و، تا وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)لەو پۆستەی مایەوە.[٣]

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج

(٢) أسد الغابة، ج٣، ص ٥٧٥.

(٣) أسد الغابة، ج٣، ص ١١.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانی بەنووسەری بەردەستی خۆی دانا.[١]

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)،عەمری کوڕی سەعیدی ئومەوی کرد بە بەرپرسی بەرهەمی خەیبەر.[٢]

بۆیە دەڵێین: ململانێی هاشمی و ئومەوییەکان نەلە قۆناغی پێش پێغەمبەڕایەتی و، نە لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و، نە لە سەردەمی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانیشدا بوونی نەبووە، بەڵکو سەرەتاکەی، لە سەردەمی خەلیفەی چوارەمی موسڵمانانەوە، عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب دەرکەوت، ئەویش نەك وەك دژایەتی نێوانیان، بەڵکو وەك دابەشبوونی دوو بەرەی ئیجتیهادی جیاواز، ئیتر بەرەبەرە لەوێوە مەسەلەکە زەق بوویەوەو، لە قۆناغەکانی دواتردا کرا بە ئامانج.

---

(١) أسد الغابة، ج٥، ص ٢٢١.

(٢) أسد الغابة، ج٤، ص ٢٤٥.

## بـۆچـی ئـەبـوهـورەیـرە
## فـەرمـوودەی زۆری دەگێڕایـەوە؟

**وەڵامی ئەم پرسیارە لە خودی ئەبوهورەیرەوە وەردەگرین، چونکە هەمان ئەو پرسیارەی لێکراوە.**

ئەبوهورەیرە دەیوت: خەڵکی دەڵێن: ئەبوهورەیرە فەرموودەی زۆر دەگێڕێتەوە، جا ئەگەر دوو ئایەت لە قورئاندا نەبوونایە، یەك فەرموودەشم نەدەگێڕایەوە، دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ (البقرة: ١٥٩-١٦٠)

برا کۆچەرییەکانم سەرقاڵی کاری ناوبازاڕ بوون و، برا پشتیوانییەکانم سەرقاڵی ئیشی ماڵەوە بوون، بەڵام ئەبوهورەیرە بەردەوام وابەستەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)بوو و کاتێك ئەوان ئامادە نەبوون، ئەو ئامادە بوو، ئەوەی ئەوان لەبەریان نەدەکرد، ئەبو هورەیرە لەبەری دەکرد).[1]

ئەبوهورەیرە دەیوت: ئەی خەڵکینە! ئێوە دەڵێن: ئەبوهورەیرە فەرموودەی زۆر دەگێڕێتەوەو، کۆچەران و پشتیوانان هێندە فەرموودە ناگێڕنەوە، دەی برا کۆچەریەکانم، سەرقاڵی کاری ناوبازاڕ بوون و برا پشتیوانییەکانم سەرقاڵی

---

(١) صحیح البخاري، الرقم ١١٧.

ئیشی ماڵەوە بوون، بەڵام من كەسێكی هەژاری ناو (ئەهلی صوففە) بووم،كە دایم هاودەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووم، كاتێك ئەوان ئامادە نەبوون، من لەوێ بووم، كاتێك ئەوان بیریان دەڕۆیشت، من بیرم لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كۆكردبۆوە.

ڕۆژێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (هەركەس جلەكەی ڕابخات، تا هەموو قسەكەم تەواو بكەم و دواتر كۆی بكاتەوە، ئەوە هەموو ئەوە وەردەگرێت، كە دەیڵێم)، منیش عەبایەكی سەرشانم هەبوو بڵاوم كردەوە، تا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەموو قسەكانی كرد، ئینجا نام بە سنگمەوە، ئیتر لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچیم بیرنەچۆتەوە![1]

ئەبوهورەیرە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! فەرموودەی زۆرت لێ دەبیستم و بیرم دەچێتەوە، فەرمووی (عەباكەت ڕاخە)، منیش ڕامخست، دەستی پێدا هێنا و فەرمووی: كۆی بكەرەوە، منیش كۆمكردەوە، ئیتر دوای ئەوە هیچ فەرموودەیەكم بیر نەچوویەوە.[2]

ئەبوهورەیرە دەڵێت: جارێك وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! لە ڕۆژی دواییدا، چ كەسێك بەختەوەرترە بە شەفاعەتی تۆ؟

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ( لقد ظننت یا أبا هریرة أن لا یسألني عن هذا الحدیث أحد أول منك، لما رأیت من حرصك علی الحدیث، أسعد الناس بشفاعتي یوم القیامة من قال: لا إله إلا الله، خالصا من قبل نفسه[3].

واتە: ئەی ئەبوهورەیرە! گومانم برد هیچ كەس پێش تۆ سەبارەت بەمە پرسیارم لێ نەكات، چونكە دەبینم زۆر سووریت لەسەر وەرگرتنی فەرموودە،

---

(١) سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥٩٥و صححه الذهبي.

(٢) صحیح البخاري، الرقم ١١٨.

(٣) صحیح البخاري، الرقم ٦٢١١، السنن الكبری للنسائي، الرقم ٥٦٦٩، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٨٦٥٥، الإیمان لابن منده، الرقم ٩٢٢.

بەختەوەرترین کەس بە شەفاعەتی من لە ڕۆژی دواییدا، ئەو کەسەیە،کە بە پوختی و نیازپاکی لە ناخی دڵییەوە وتبێتی: لا اله الا الله).

## ئەبوهورەیرە زانستی شاردۆتەوە :

یەکێك لەو گومانانەی ئاڕاستەی ئەبوهورەیرە دەکرێت، دەڵێت: زانستی شاردوەتەوەو هەمووی ئاشکرا نەکردووە!

ئەبوهورەیرە خۆی لە وتەیەکیدا دەڵێت: ئەگەر هەموو ئەوەی دەیزانم پێتان بڵێم، ئەوە خەڵکی گۆزەشیان تێدەگرتم و دەیانوت: ئەبوهورەیرە شێتە،[1] ئەم دەقە بە چەند شێوەی تر هاتووە.

ئەوەی ئەبوهورەیرە باسی نەکردووەو شاردوویەتیەوە پەیوەست نەبووە بە مەسەلەی حەڵاڵ و حەرامەوە، بەڵکو پەیوەست بووە بە مەسەلەی فیتنەو ڕووداوەکانی دواترەوە، کە دێن یان شتانێك،کە لەو سەردەمەدا نەبون، بۆیە دەڵێت: ئەگەر بیانڵێم، بە شێتم دەزانن، ماوەیەکی کەم بەسەر ئەو وتەیدا تێپەڕ بووبوو، کە حەسەن دەیوت: بەخوا ڕاستی فەرموو، ئەگەر پێی بوتینایە ماڵی خوا دەڕووخێنرێت، یان دەسووتێنرێت، خەڵکی بڕوایان پێ نەدەکرد.[2]

لە گێڕانەوەیەکی تردا، ئەبوهورەیرە دەڵێت: لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) دوو کوپ زانستم وەرگرتووە، کە یەکێکیانم لەناو خەڵکدا بڵاوکردۆتەوەو، ئەوی تریان نا، چونکە ئەگەر بڵاوی بکەمەوە، ئەم قوڕقوڕاگە دەبڕن![3]

---

(١) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٣١.

(٢) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٣١.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٠٦.

ئیبن کەثیر دەڵێت: ئەو کۆپە زانیاریەی ئەبوهورەیرە شاردیەوەو نەیوت، هەمان باسی ئەو فیتنانە بوو، کە ڕوویاندا و دواتریش ڕوودەدەن، ئەگەر پێش ڕوودانیان بە خەڵك بوترایە، بڕوایان پێ نەدەکرد و بە درۆیان دەخستەوە، بەرپەرچی ئەو دەقە حەقەیان دەدایەوە.[١]

## ئەبوهوڕەیرە ڕقی لە ئالوبەیت بووە :

گومانێکی تر، کە سەبارەت بە ئەبوهورەیرە هاتووە ئەوەیە،کە دەوترێت: بەرامبەر بەئالوبەیت گێڕانەوەی دژایەتی و شکاندنی ئالوبەیتی هێناوە، ئەمەش لە ڕاستییەوە دوورە، فەرموودەی صەحیح لە ئەبوهورەیرەوە نەهاتووە سەبارەت بە ئالوبەیت، مەگەر لە وەسف و پیاهەڵدانیاندا نەبێت.

ئەبو هورەیرە دەڵێت: جارێك لەگەڵ پێغەمبەر لە بازاڕی مەدینە بووم، پێغەمبەر چوو و منیش بە دوایدا چووم، پێی فەرمووم: (أين لكع. واتە: کوا لوکەع؟) - وشەی لوکەع بۆ خۆشی بۆ منداڵ بەکاردەهێنرا -، سێ جار ئەوەی فەرموو.

ئینجا فەرمووی: (حەسەنی کوڕی عەلی بانگ بکە)، منیش چووم بینیم: حەسەن دەڕوات بە ڕێدا و ملیوانێك لە ملیدایە، پێغەمبەر بە دەست ئاماژەی بۆ کرد و، ئەویش ئاماژەی بۆ کرد - واتە: پێغەمبەر باوەشی بۆ کردەوەو بەئاماژەی دەست بانگی کرد-، کە حەسەن هات، پێغەمبەر گرتیە کۆش و فەرمووی: (خوایە! من خۆشم دەوێت، دەی تۆیش خۆشت بوێت و ئەوەشت خۆش بوێت، کە ئەوی خۆش دەوێت).

ئەبوهورەیرە دەڵێت: ئیتر دوای ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر کەس نەبوو هێندەی حەسەنی کوڕی عەلی لام خۆشەویست بێت.[٢]

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٠٦.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٥٥٥٢ و اللفظ له، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٥٠، صحيح ابن حبان، الرقم

ئەبوهورەیرە دەڵێت: جارێك ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی، لای پێغەمبەر دانیشتبوو، پێغەمبەر حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد.

ئەقرەع وتی: من دە کوڕم هەیە، تا ئێستا هیچکامیانم ماچ نەکردووە.

پێغەمبەریش سەیرێکی کرد و پاشان فەرمووی: (من لا یرحم لا یرحم[1]. واتە: ئەوەی میهرو سۆزی نەبێت، میهر و سۆزی بۆ نییە).

هەروەها ئەبو هورەیرە دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەرم بینی، چوو بۆ بەر دەرگای ماڵی فاطیمەو فەرمووی: ئەی حەسەن! حەسەنیش هاتە دەرەوە بۆ لای، پێغەمبەر دەمی ماچ کرد و زمانی مژی و گرتیە کۆش، ئەبوهورەیرە دەڵێت: سوێند بە خوا، تا ئێستاش بەردەوام حەسەنم خۆش دەوێت.[2]

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر دەیفەرموو: (من أحب الحسن و الحسين فقد أحبني، ومن أبغضهما فقد أبغضني[3]. واتە: هەرکەس حەسەن و حوسەینی خۆش بوێت، ئەوە منی خۆش ویستووە، هەرکەسیش ڕقی لێیان بێت، ئەوە ڕقی لە منە).

کاتێك حەسەنی کوڕی عەلی وەفاتی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی، حوسەین چوو بۆ لای عائیشەو داوای لێکردەوە، کە حەسەنی برای لای پێغەمبەر ئەسپەردە بکرێت.

ئەویش ڕازی بوو و وتی: باشە.

---

٧٠٧٣، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٨١٧٤، مسند الحميدي، الرقم ١٠٠٤.

(١) صحيح البخاري، الرقم ٥٦٥٧، صحيح مسلم، الرقم ٤٣٨٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٥٨، سنن أبي داود، الرقم ٤٥٦٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧١٠٥.

(٢) المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٦٥٨٦.

(٣) سنن ابن ماجة، الرقم ١٤٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٧٦٧٢، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٦٠٨٤، المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٤٨٩٥، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٤٣.

بەڵام مەڕوان،کە ئەمەی بیست وتی: سوێند بەخوا، نابێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکرێت، نەیانهێشت عوسمان لەوێ ئەسپەردە بکرێت، ئێستا ئەمان دەیانەوێت حەسەن لەوێ ئەسپەردە بکەن؟

کە حوسەینیش ئەم قسەی بیست، بە چەکەوە هاودەم بە چەندێکی تر چوو، مەڕوانیش خۆی ئامادە کرد، کە ئەبوهورەیرە بیستی بارەکە گەیشتوەتە ئەوە، وتی: سوێند بەخوا ئەوە ستەمێکە لە حەسەن دەکرێت، دەبێت ڕێ بدرێت لەگەڵ باوکیدا (واتە: مەبەستی پێغەمبەر بوو) کفن بکرێت، ئەو، کچەزای پێغەمبەرە.

ئینجا چوو بۆ لای حوسەین و قسەی لەگەڵ کرد و سوێندی دا وازبهێنێت، وتی: مەگەر براکەت نەیوت ئەگەر زانیت جەنگی لێدەکەوێتەوە، ئەوا بمبەنەوە بۆ گۆڕستانی موسڵمانان؟

بۆیە زۆر لێی پاڕایەوە، تا حوسەین ڕازی بوو و، حەسەنیان برد لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەی بکەن.[١]

---

(١) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩٢.

## کۆبوونەوەی بەنی ساعیدە[1]

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد، پشتیوانان لە کەپری بەنی ساعیدە کۆبوونەوە،[2] ئەوان لە دەوری سەعدی کوڕی عوبادە کۆبوونەوە، پشتیوانان پێیان وابوو: دەبێت ئەوانیش پشکی خیلافەتیان هەبێت، ئینجا ئەبوبەکر و عومەر و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح، کە هەواڵەکەیان زانی، چوون بۆ لای پشتیوانان.

پشتیوانان دەیانوت: با ئێمە ئەمیرێکمان هەبێت و ئێوەش ئەمیرێکتان هەبێت، ئەبوبەکر قسەی کرد و وتەکانی هەموویانی قەناعەت پێکرد، لە میانەی وتەکانیدا وتی: ئەمیرایەتی لە ئێمەو وەزیریی لە ئێوە، بەڵام حوبابی کوڕی مونژیر وتی: نابەخوا، ئەمیرێك لە ئێوەو ئەمیرێك لە ئێمە.

ئەبوبەکر تێیگەیاند، کە بۆچی وای وتووە، پاشان وتی: بەیعەت بدەن بە عومەر، یان بە ئەبوعوبەیدە، خێرا عومەر وتی: بەڵکو بەیعەت بە تۆ دەدەین، تۆ گەورەو چاکترینمانیت، تۆ لە هەمووومان لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆشەویستتر بوویت، عومەر دەستی ئەبوبەکری گرت و بەیعەتی پێدا،خەڵکەکەش بەیعەتیان پێدا.[3]

---

(١) خوێنەری ئازیز، ئەم بابەتە مشتومڕێکی زۆری دەوێت و پێویستی بە توێژینەوەیەکی سەربەخۆ هەیە، بۆیە لێرەدا بە کورتی دەیخەینەڕوو .

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٣٥٠.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٨٨.

## بەیعەتدان بە ئەبوبەکر

مێژوونووسی شیعە، یەعقوبی دەقێکی هێناوەو دەڵێت: دەستەیەك لە کۆچەران و پشتیوانان لە بەیعەت دان بە ئەبوبەکر دواکەوتن و، هەواداری عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب بوون، لەوانە: (عەبباسی کوڕی عبدولموطەلیب و فەضلی کوڕی عەبباس و زوبەیری کوڕی عەووام و خالیدی کوڕی سەعید و میقدادی کوڕی عەمر و سەلمانی فارسی و ئەبوذەری غیفاری و عەمماری کوڕی یاسر و بەررائی کوڕی عازب و ئوبەی کوڕی کەعب).[1]

ئەم مەسەلەیە پەیوەست کراوە بە ناکۆکی نێوان شیعەو سوننە، لەسەر مەسەلەی خیلافەت و ئیمامەت.

شیعە پێیان وایە: ئیمامەت لە دوای پێغەمبەر، بە میراتی بۆ عەلی و نەوەکانی ماوەتەوە، تا ڕۆژی دوایی، ئەبوبەکر و هاوەڵانی تر ئەو مافەیان لێ زەوت کردووە.

سوننەش پێیان وایە: هیچ بنەڕەتێك نییە بۆ مەسەلەی ئیمامەتی عەلی، خیلافەتی ئەبوبەکریش دروست بووە و هەموو موسڵمانانیش لەسەری کۆدەنگ بون.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئەگەر ئیمامەت بەشێکی چەسپاوی بیروباوەڕەو، مافی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب و نەوەکانییەتی:

---

(١) تاريخ اليعقوبي، دار صادر، بيروت، ج٢، ص ١٢٤.

**یەکەم:** ئەو بنەڕەتە، کە بڕیارە بەھەشت و دۆزەخ یەکلا بکاتەوەو، ڕیشەی قەڵەمڕەوی ھەموو کۆمەڵگەی ئیسلامیە، تا ڕۆژی دوایی، بۆچی بە ئایەتێك ڕاشکاوانە باسنەکراوە، ئایا ئەمە ناڕاستی ئەو بانگەشەیە نییە؟ یان ئەوەیە: ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان، لە کۆکردنەوەی قورئاندا، ڕاستیگەلێکی ناو قورئانیان لابردووە؟ جا ئەگەر بڵێین: یەکەمیان ڕاستە، ئیتر بنەڕەتی بانگەشەی ئیمامەت بە دەلیلی قورئانی لەکاردەکەوێت.

ئەگەریش بڵێین: دووەمیان ڕاستە، ئەوە ھیچ بنەڕەتێکی دروست بۆ ئیسلام نامێنێتەوە، کە لەسەری بڕۆین، چونکە ئەگەر ئەوان و ھاوەڵانی تر قورئانیان ناتەواو تۆمار کردبێت، کەوابوو ھەم قورئان تەواوی پەیامی خوا نییە، ھەم چی فەرموودەیە لەکاردەکەوێت، ھەم خوێندکارەکانی پێغەمبەر، دەبنە خوێندکارانێکی باش پەروەردە نەکرا و و ناپاك و ھەلپەرست (دوور لەوان).

**دووەم:** چۆن دەکرێت عەلی کوڕی ئەبوتالیب، کە موژدەپێدراوی بەھەشت و زاوای پێغەمبەر و، میراتگری دین و دنیایی پێغەمبەر بێت، کەچی ئامادە نەبێت لەسەر ئەو مافە خوداییە شەڕ بکات و، دەرفەت بدات کەسانێکی تر ڕێڕەوی بڕیاری خوا و ئایینی خوا بگۆڕن، لە کاتێکدا ئەو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا، چەندین جار لە غەزاکاندا چووەتە گەرمەی جەنگەوەو، باکی نەبووە لە مان و نەمانی لە دنیادا.

ئەوەی لێرەدا بە کورتی قسەی لەسەر دەکەین بریتییە لە: ئاماژەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بۆ ھەریەك لە ئەبوبەکر و عەلی، کۆبوونەوەی بەنی ساعیدەو بەیعەتدان بە ئەبوبەکر، ئەوانەی لە بەیعەتدان دواکەوتن، بەیعەتدانی عەلی بە ئەبوبەکر.

## چەند ئاماژەیەکی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بـۆ ئەبوبەکر

جارێك جوبەیر لەگەڵ پێغەمبەر بوو، ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر، پێغەمبەر فەرمانی کرد بە ئافرەتەکە، جارێکی تر بێتەوە خزمەتی.

ئافرەتەکە وتی: ئەی ئەگەر هاتمەوەو تۆم نەبینی؟ وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر مردبوویت؟

ئەویش فەرمووی: (إن لـم تـجـديـني فـأتـي أبـابكر[1]. واتە: ئەگەر منت بەدی نەکرد، وەرە بۆ لای ئەبوبەکر).

ئبن عەبباس دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی نەخۆشیەکەیدا، بە پارچە قوماشێك سەری بەستبوو، چووە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کرد، دواتر فەرمووی: ( إنه ليس من الناس أحد أمن علي في نفسه وماله من أبي بكر بن أبي قحافة، ولو كنت متخذا من الناس خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا، ولكن خلة الإسلام أفضل، سدوا عني كل خوخة في هذا المسجد، غير خوخة أبي بكر[2].

واتە: کەس نییە بەهۆی گیان و سامانییەوە منەتباری بم، جگە لە ئەبوبەکری کوڕی قوحافە، ئەگەر من دۆستی زۆر نزیکم لەنێو خەڵکدا بگرتایە، بە دڵنیایەوە ئەبوبەکر دەبوو، بەڵام هاودەمی ئیسلام باشترە، لەم مزگەوتەدا چی خێمە هەیە بەڕوومدا دایخەن، جگە لە خێمەکەی ئەبوبەکر).

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٨٠، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٠١، سنن الترمذي، الرقم ٣٦٩٦، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٧٦٦، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٥٤٢٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٤٣٤، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٧٢٣٤، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٥٣٨.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٥٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٩٧٠، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٨٣٤، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٣٧، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم ٢٥٢٨، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١١٧٢٣.

عبداللەی کوڕی زەمعە دەڵێت: کاتێك نەخۆشیەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆری بۆ هێنا، منیش هاودەم بە ژمارەیەك لە موسڵمانان لەلای بووم، بیلال بانگی دا.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: کەسێك بنێرن نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات.

منیش چووم بینیم عومەر لەناو خەڵکەکەدایەو ئەبوبەکر لەوێ نییە.

وتم: ئەی عومەر نوێژ بۆ خەڵکەکە بکە !

عومەریش هەستا، (الله اکبر)ی کرد، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەنگی بیست، هەواڵی ئەبوبەکری پرسی، ئەوەبوو دوای ئەوە ئەبوبەکر نوێژی بۆ موسڵمانان کرد[1].

دواتر عومەر پێی وتم: ماڵوێران ئیبن زەمعە، چیت پێکردم، بەخوا کە وتت: بەرنوێژی بکە، وامزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)فەرمانی ئەوەی پێکردویت، ئەگەر وا تێنەگەیشتمایە، بەرنوێژیم نەدەکرد بۆ خەڵکەکە!

منیش وتم: بەخوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)فەرمانی پێنەکردم، بەڵام کە ئەبوبەکرم نەبینی، ئیتر تۆم بە شیاوتر زانی.[2]

سالیمی کوڕی عوبەید، باسی ساتەکانی نەخۆشی پێغەمبەری خوا دەکات و دەڵێت: پێغەمبەر نەخۆش کەوت و لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی: ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟

منیش وتم بەڵێ.

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ٤٠٦٢، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٤١، مسند احمد بن حنبل، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٥٢١، الرقم ١٣٨٥٨، قال الألباني في صحيح و ضعيف سن أبي داود حسن صحيح.

(٢) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٤١، مسند احمد بن حنبل، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٥٢١، الرقم ١٣٨٥٨.

فەرمووی: بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبوبەکریش بڵێن، با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لە هۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی: ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟

منیش وتم :بەڵێ.

فەرمووی بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبوبەکریش بڵێن: با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی.

خاتوعائیشە وتی: باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی.

پێغەمبەر هەمدی فەرمووی: ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟

وتمان: بەڵێ.

فەرمووی: بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبوبەکریش بڵێن: با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی خاتوعائیشە وتی: باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی.

پێغەمبەر فەرمووی: (ئێوەی ئافرەتان هاودەمە ژنەکانی یوسفن، بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات و بە ئەبوبەکریش بڵێن: با بەرنوێژی بکات بۆ خەڵك)، هەمدی لەخۆش خۆی چوو.

بیلال بانگیدا و قامەتی کرد، ئەبوبەکریش چوو بەرنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە، پێغەمبەر هاتەوە هۆش خۆی و فەرمووی ئایا نوێژ دابەستراوە؟

وتم : بەڵێ.

فەرمووی: (کەسێکم بۆ بانگ بکەن تا خۆمی پێوە بگرم)، ئەوەبوو (بەریرە) و کەسێکی تر هاتن و پێغەمبەر باڵی دایە سەر شانیان و بەو حاڵەوە چوو بۆ

نوێژ، لەپاڵ ئەبوبەکردا دانیشێنرا، ئەبوبەکر ویستی بگەڕێتە دواوە، پێغەمبەر ئەبوبەکری هێشتەوە تا نوێژەکە تەواو بوو.[١]

## چەند ئاماژەیەکی تایبەت بە عەلی کوڕی ئەبوتالیب:

بەڕائی کوڕی عازب، بەسەرهاتێکی بەشداربوونی لە حەجی ماڵئاوایی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەو حەجەدا بووین، کە تیایدا پێغەمبەر حەجی کرد، پێغەمبەر لە نێوەندی ڕێدا دابەزی و فەرمانی بە نوێژ کرد، دەستی عەلی گرت و فەرمووی: ئایا من بۆ باوەڕداران لە خودی خۆیان لەپێشتر نیم؟

وتیان: با.

فەرمووی: ئایا بۆ هەر باوەڕدارێك، من لە نەفسی خۆی لەپێشتر نیم؟

وتیان: با، فەرمووی: ( فهذا ولي مـن أنـا مولاه ، اللهـم وال مـن والاه ، اللهـم عـاد مـن عـاداه[٢]. واتە: دەی ئەمە وەلی هەر کەسە، کە من مەولای بم، خوایە لەگەڵ ئەوەبە، کە لەگەڵیەتی و دژی ئەوە بە کە دژیەتی ).

ئیبن عەبباس دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەخۆش کەوتو ئازارەکەی زیادی کرد، فەرمووی: (پەڕەیەکم بۆ بهێنن، تا نووسراوێکتان بۆ بنووسم، تا دوای ئەوە گومڕا نەبن).

عومەری کوڕی خەططاب وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئازار زۆری بۆ هێناوە، هاوکات کتێبی خوا لەنێوماندایە بەسمانە، ئیتر قسەو مشتومڕ

---

(١) صحيح ابن خزيمة، الرقم ١٥٢٧، سنن ابن ماجة، الرقم ١٢٣٠، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سن ابن ماجة، الرقم ١٢٣٤.

(٢) سنن ابن ماجة، الرقم ١١٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨١١٥. صححه الألباني في صحيح وضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١١٦.

لەنێو هاوەڵاندا زۆر بوو، تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ( قوموا عني ولا ينبغي عندي التنازع[١]. واتە: لەلام هەستن و بڕۆن، نابێ لە لای مندا ناكۆكی بكرێت).

ئیبن عەبباس، كە ئەم فەرموودەی دەگێڕایەوە، دەیوت: ڕۆژی پێنج شەممە بوو، ئینجا دەستیكرد بە گریان و زۆر گریا![٢]

جا شیعەو هەوادارانیان، پێیان وابووە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ویستوویەتی ئەو نووسراوە بنووسێت بۆ عەلی كوڕی ئەبوتاڵیب، بەڵام عومەری كوڕی خەططاب ئەوەی زانیوە، بۆیە ڕێی لێگرتووە!

كاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەخۆش كەوت، خەڵكی بە (عەلی كوڕی ئەبوتاڵیب)یان وت: ئەرێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حاڵی چۆنە؟

وتی: سوپاس بۆ خوا باشەو چاك دەبێتەوە.

عەبباس دەستی عەلی گرت و وتی: مەگەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)نابینیت؟! بەخوا من تەواو وای دەبینم: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)لەم نەخۆشیەیدا، كۆچی دوایی دەكات، با بچین بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و پرسیاری لێبكەین، تا بزانین كارو بەرپرسیاریەتی دواتر بۆ كێ دەبێت، ئەگەر بۆ ئێمەیە، با بیزانین، ئەگەریش بۆ ئێمە نییە، پێی دەڵێین و وەسیەتمان بۆ دەكات.

عەلی وتی: بەخوا ئەگەر پرسیار لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بكەین لەوبارەوە - داوای بكەین - و ڕازی نەبێت پێمان ببەخشێت، ئەوە ئیتر هەرگیز خەڵكی پێمان نابەخشێت، منیش هەرگیز ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ناكەم.[٣]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ١١٣.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٣١٧٤.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٥٩١٩، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٢٨٥.

## بەیعەت دانی عەلی بە ئەبوبەکر

**لەم بارەیەوە دوو گێڕانەوەی سەرەکی هاتون، کە بریتین لە:**

**گێڕانەوەی یەکەم:**

کاتێك خەلیفەی باوەڕداران لە ڕۆژی دووەمدا، بەیعەتی لە موسڵمانان وەردەگرت، هەریەك لە عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب و زوبەیری کوڕی عەووام لەوێ نەبوون، بۆیە ئەبوبەکر داوای عەلی کرد، بڕێك لە پشتیوانان چوون (عەلی) یان هێنا.

ئەبوبەکر وتی: ئامۆزا و زاوای پێغەمبەر! دەتەوێت ڕیزی موسڵمانان دووکەرت بکەیت؟

عەلی وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر! کێشەم نییە، ئەوەبوو بەیعەتی پێدا، ئینجا تەماشای کرد، زوبەیر دیار نییە، بۆیە ناردی بە شوێنیدا و، زوبەیر هات.

ئەبوبەکر وتی: پوورزا و حەواری پێغەمبەر! دەتەوێت ڕیزی موسڵمانان دووکەرت بکەیت؟

ئەویش هەمان شتی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی وتەوەو بەیعەتی پێدا.[1]

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٤٠٥، سكت عنه الذهبي في التلخيص.

**گێڕانەوەی دووەم:**

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، فاطیمە داوای لە ئەبوبەکر کرد، تا لە بەجێماوی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) میراتی پێ بدات.

ئەبوبەکر پێی وت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (چی بەمیرات جێبهێڵین، صەدەقەیە).

فاطیمە بەوە تووڕە بوو و قسەی لەگەڵ ئەبوبەکر بڕی و، تا مرد ئەبوبەکری نەدواند، کە فاطیمە وەفاتی کرد، عەلی بە شەو ئەسپەردەی کرد و ئەبوبەکری بانگ نەکرد!

دوای مردنی فاطیمە، دەموچاوی خەڵکی شیرین نەدەبینی، بۆیە بڕیاریدا لەگەڵ ئەبوبەکر رێکبکەوێت و بەیعەتی پێبدات، ئەو ماوەیەش - شەش مانگە - هێشتا بەیعەتی نەدابوو، بۆیە هەواڵی نارد بۆ ئەبوبەکر و وتی: وەرە بۆ لامان و با کەس نەیەت لەگەڵتدا، چونکە حەزی نەدەکرد عومەر ئامادەی کۆڕەکە بێت، عومەر کە ئەوەی زانی وتی: نا بەخوا، بە تەنها ناچیت بۆ لایان.

ئەبوبەکر وتی: بۆ پێت وایە چیم پێدەکەن؟

بەخوا دەچم بۆ لایان، ئەبوبەکر چوو بۆ لایان.

عەلی قسەی کرد و وتی: ئێمە فەزڵی تۆ دەزانین و ئاگادارین خوا چی پێ بەخشیویت، حەسودیش نابەین بەو خێرەی خوا پێیداویت، بەڵام تۆ تاکڕەوانەو بێ ئێمە بڕیارت دا، ئێمە پێمان وابوو: بە نزیکیمان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پشکێکمان دەبێت.

کە ئەبوبەکر ئەم قسانەی بیست، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، ئینجا ئەبوبەکر قسەی کرد و وتی: سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە، خزمایەتی و نزیکی پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) لا ئازیزترە، لە پەیوەندی

خزمایه‌تی خۆم، به‌ڵام ئه‌وه‌ی له‌ نێوان من و ئێوه‌دا سه‌باره‌ت به‌و سامانه‌ هه‌بووه‌، له‌به‌ر چاکه‌ بووه‌و، بینیبێتم پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) چی کردبێت، منیش وامکردووه‌.

عه‌لی به‌ ئه‌بوبه‌کری وت: سبه‌ی ئێواره‌ واده‌ی به‌یعه‌ت ده‌بێت.

ئه‌وه‌بوو، که‌ ئه‌بوبه‌کر نوێژی نیوه‌ڕۆی کرد، چوویه‌ سه‌ر مینبه‌ر و شایه‌تومانی وته‌وه‌و، باسی عه‌لی و شکۆی کرد و باسی ئه‌وه‌شی کرد، که‌ به‌یعه‌تی نه‌داوه‌ و بیانووی عه‌لی بۆ ئه‌وه‌ چی بووه‌، دواتر داوای لێخۆشبوونی له‌ خوا کرد.

ئینجا عه‌لی شایه‌تومانی وته‌وه‌و باسی گه‌وره‌یی مافی ئه‌بوبه‌کری کرد و وتی: ئه‌وه‌ی کردوویه‌تی له‌به‌ر حه‌سوودی بردن به‌ ئه‌بوبه‌کر و له‌به‌رچاو نه‌گرتنی فه‌زڵی نه‌بووه‌، به‌ڵکو پێی وابووه‌: پشکی هه‌بووه‌ له‌و بواره‌دا و ئه‌بوبه‌کر تاکڕه‌وانه‌ بۆ خۆی بردووه‌، به‌وه‌ دڵمان ناره‌حه‌ت بوو، موسڵمانان به‌مه‌ دڵخۆش بوون و وتیان ڕاستت پێکا.[١]

(ئیبن حه‌جه‌ر) ده‌ڵێت: سه‌باره‌ت به‌ داواکاری ئاماده‌نه‌بوونی عومه‌ر له‌به‌رئه‌وه‌ بوو، که‌ ده‌یانناسی عومه‌ر له‌ گوفتار و کرداریشدا ڕه‌ق و تونده‌، به‌ڵام ئه‌بوبه‌کر که‌سێکی نه‌رم بوو، سه‌باره‌ت به‌وه‌ش، که‌ ده‌ڵێت: ئه‌و ماوه‌یه‌ به‌یعه‌تی پێ نه‌داوه‌، له‌وانه‌یه‌ مه‌به‌ستی ئاماده‌ نه‌بوونی بووبێت له‌ کۆڕ و کۆبوونه‌وه‌یدا.[٢]

نه‌وه‌وی له‌ شه‌رحی فه‌رمووده‌که‌دا ده‌ڵێت: مه‌به‌ست به‌وه‌ی ده‌ڵێت: (فاتیمه‌ تا مرد نه‌یدواند) ئه‌وه‌یه‌، که‌ یان له‌و باره‌وه‌ حسابی میرات - نه‌یدواندووه‌، یان ئه‌وه‌یه‌: خۆی لێ دوورگرتووه‌، نه‌ك ئه‌وه‌ی به‌ یه‌ك بگه‌ن و سه‌لام له‌ ئه‌بوبه‌کر نه‌کات و قسه‌ی له‌گه‌ڵ نه‌کات، سه‌باره‌ت به‌ به‌یعه‌ت نه‌دانه‌که‌ی (عه‌لی)ش، ئه‌وه‌ زانایان کۆکن له‌سه‌رئه‌وه‌ی، مه‌رج نییه‌ بۆ دروستی به‌یعه‌ت، هه‌موو خه‌ڵك و هه‌موو ئه‌هلی حه‌ل و عه‌قدیش به‌یعه‌ت بده‌ن، به‌ڵکو مه‌رجه‌که‌ ئه‌وه‌یه‌: چه‌نده‌ له‌

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤٠١١، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٩١، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٩٠٠.

(٢) فتح الباري، ج٧، ص ٤٩٥.

کۆی زانا و سەرکردەو پیاوماقوڵانی ناو خەڵك بگونجێت، بەیعەت بدەن، هەروەها مەرج نییە هەر کەس دەست بخاتە دەستی و بەیعەت بدات، کەسێك ملکەچ بێت و دژایەتی نیشان نەدات بەسە، (عەلی)ش لەو ماوەیەدا ئاوا بووە، بەڵکو نەیاری نەنواندووەو ڕیزی کەرت نەکردووە، بەڵکو گلەییەك لە دڵیدا ماوەتەوەو وەستاوە، تا ئەوە نەماوە، جا ئەم فەرموودەیە روونکردنەوەی دروستی خیلافەتی ئەبوبەکرە.(١)

سەبارەت بە ڕاستی ئەم دوو فەرموودەیە بەیهەقی دەڵێت: ئەو گێڕانەوەی کە دەڵێت: عەلی تا دوای مردنی فاطیمە بەیعەتی نەداوە-گێڕانەوەی دووەم- مونقەگیعە، فەرموودەکەی ئەبوسەعیدی خودری کە دەڵێت: پاش پەقیفە لە بەیعەتی گشتیدا عەلی بەیعەتی داوە بە ئەبوبەکر ڕاستترە.(٢)

(ئیبن کەثیر) سەبارەت بەوەی کام لەم دوو گێڕانەوەیە ڕاستە، دەڵێت: بەیعەتی پاش مەرگی فاطیمە بەیعەتی دووپات کردنەوە بوو و، دووەم بەیعەت بوو، بەڵکو لەو ماوەدا، عەلی لە دوای ئەبوبەکرەوە نوێژی دەکرد و، بۆ ڕاوێژ کردن لای ئەبوبەکر بوو و، لەگەڵیشیدا چوو بۆ (ذیلقیصصە).(٣)

---

(١) شرح النوي على صحيح مسلم، ج١٢، ص ٧٤،٧٧،٧٨.

(٢) السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٩١٠.

(٣) البداية والنهاية لابن كثر، ج٥، ص ٢٨٦.

## ئایا عەلی حەزی بە خیلافەت هەبووە؟

سەبارەت بەوەی، ئایا عەلی حەزی بەخیلافەت هەبووە، یان نا؟

ئەوا دەتوانین بەچەند بەڵگەیەك بیسەلمێنین، كە بەڵێ، بەڵام سەبارەت بەوەی، ئایا خیلافەتی بۆ واجب بووە، یان نا؟

ئەوە هیچ بەڵگەیەكی صەحیح نییە، بۆ واجب بوونی خیلافەت، یان ئەوەی شیعە پێی دەڵێت: ئیمامەت بۆ عەلی:

كاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەخۆش كەوت، خەڵكی بە (عەلی كوڕی ئەبوتاڵیب)یان وت: ئەرێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حاڵی چۆنە؟

وتی: سوپاس بۆ خوا باشەو چاك دەبێتەوە.

عەبباس دەستی عەلی گرت و وتی: مەگەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نابینیت؟

بەخوا من تەواو وای دەبینم،كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەم نەخۆشیەیدا كۆچی دوایی دەكات، با بچین بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پرسیاری لێ بكەین، تا بزانین كارو بەرپرسیاریەتی دواتر بۆ كێ دەبێت؟ ئەگەر بۆ ئێمەیە، با بیزانین، ئەگەریش بۆ ئێمە نییە، پێی دەڵێین و وەسیەتمان بۆ دەكات!

عەلی وتی: بەخوا ئەگەر پرسیار لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بكەین لەویارەوە - داوای بكەین -و ڕازی نەبێت پێمان ببەخشێت، ئەوە ئیتر

هەرگیز خەڵکی پێمان نابەخشێت، منیش هەرگیز ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناکەم.[١]

لە گێڕانەوەکەی بوخاریدا، سەبارەت بە بەیعەتدانی عەلی بە ئەبوبەکر، کاتێك عەلی قسەی کرد، وتی: ئێمە فەزڵی تۆ دەزانین و ئاگادرین خوا چی پێ بەخشیوت، حەسودیش نابەین بەو خێرەی خوا پێیداویت، بەڵام تۆ تاکڕەوانە بێ ئێمە بڕیارت دا، ئێمە پێمان وابوو: بە نزیکیمان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)پشکێکمان دەبێت،[٢] ئەمەش ئاماژەیە بەوەی نیازی هەبووە پشکی هەبێت.

حەسەنی کوڕی عەلی، پێش مردنی، حوسەینی برای بانگ کرد و ئەم وەسیەتەی بۆ کرد: (براکەم! باوکمان - عەلی - بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت، کە پێغەمبەر وەفاتی کرد، خۆی بۆ ئەم بارە- دەسەڵات - دانابوو و، هیوای وابوو بۆ ئەو بێت.

ئەوەبوو خوا دووری گرت لێی و، دایە دەست ئەبوبەکر، کە ئەبوبەکر سەرەمەرگی هات هەمدی حەزی پێکرد، ئەوەبوو هەمدی دوورخرایەوە لێی و بەر عومەر کەوت، کە عومەر سەرەمەرگی هات، کردی بە شوورا لە نێوان شەش کەسدا، کە باوکمان یەکێك بوو لەوان، ئەوەبوو بەر عوسمان کەوت، کە عوسمانیش کوژرا بەیعەتی پێدرا، دوایی ململانێی لەگەڵ کرا، تا شمشێری بۆ هەڵکرد و لەسەری جەنگا، بارەکە بۆی لەبار نەبوو و، هیچی لێ دەست نەکەوت، سوێند بەخوا، وانابینم خوای گەورە، پێغەمبەرایەتی و خیلافەتیش لە ناو ئێمەی ئالوبەیتدا کۆبکاتەوە.[٣]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٥٩١٩، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٢٨٥.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٠١١، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٩١، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٩٠٠.

(٣) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٣٩١-٣٩٢.

## سەعدی کوڕی عوبادە و
## خیلافەتی ئەبوبەکری صدیق

بڕێك گێڕانەوە هاتون، سەبارەت بەوەی،کە سەعدی کوڕی عوبادە ئامادە نەبوە بەیعەت بدات بە ئەبوبەکر و، هەوڵی داوە پشکی پشتیوانان سەربخات و، تا دواساتی ژیانی، بەیعەتی نەداوە!

بەڵام ئەمە لە ڕاستییەوە دوورە، تەنها بۆ شێواندنی مێژووی ئیسلامییە، ئەگەرنا، چ ڕابردووی سەعد و چ دەقە صەحیحەکان، ئەوە دەسەلمێنن: مەسەلەکە وا نەبووە، بەڵام وەك سپاردەیەکی زانستیی، هەموو دەقەکان دەهێنین:

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد و، پشتیوانان لە کەپری (بەنی ساعیدە) کۆبوونەوە، لە دەوری سەعدی کوڕی عوبادە کۆبوونەوەو دەیانوت: ئەمیرێك لە ئێمەو ئەمیرێك لە پشتیوانان، ئەوان دەیانویست بەیعەت بە سەعدی کوڕی عوبادە بدەن.[1]

سەعد لەو کاتەدا نەخۆش بوو، تایەکی زۆری هەبوو، خۆی گرمۆڵە کردبوو.[2]

بە پێی گێڕانەوەیەکی لاواز - ذەهەبی دەڵێت: سەنەدەکەی بەو جۆرەیە، کە دەیبینیت  هاتووە: کاتێك بەیعەت درا بەئەبوبەکری صدیق، ئەبوبەکر ناردی بە شوێن (سەعد)دا و پێی وت: وەرە بەیعەت بدە وا خەڵکەکە بەیعەتیان داوە.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٨٨.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٦٤٥٥.

بەڵام سەعد وتی: بەخوا بەیعەتتان پێنادەم، تا هاودەم بەوانەی لەگەڵ منن، لەگەڵتان دەجەنگم، بەشیری کوڕی سەعد لەوێ بوو، وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر! ئەو یاخی بووە و تا نەکوژرێت بەیعەتتان پێ نادات، تا منداڵ و عەشیرەتەکەشی لەگەڵی نەکوژرێن ناکوژرێت، بۆیە تا دەتوانن مەیبزوێنن، ئەو خۆی تەنهایە.

ئەبوبەکریش وازی لێهێنا، دواتر، کە عومەر بوو بە خەلیفە پێی گەیشت و وتی: ئێ سەعد، ئەویش وتی: ئێ عومەر، عومەر لێی پرسی: بەیعەتی پێدەدات؟

کەچی وتی: هاوەڵەکەت لە تۆ لامان خۆشەویستتر بوو، بەخوا حەزم بە دراوسێیەتیت نییە!

عومەر وتی: هەرکەس ڕقی بێت لە دراوسێکەی جێی دێڵێت، ئەوەبوو سەعد چوو بۆ شام و پاش ماوەیەك لەوێ مرد.[١]

بەڵام بەپێی گێڕانەوەی صەحیح هاتووە، کە کاتێك پشتیوانان داوای خیلافەتیان کرد و، ئەبوبەکر دواتر وتاری پێشکەش کرد، تیایدا وتی: ئەی سەعد! تۆ خۆت لای پێغەمبەر دانیشتبوویت، کە فەرمووی: (قريش ولاة هذا الامر، فبر الناس تبع لبرهم و فاجرهم تبع لفاجرهم. واتە: قوڕەیشییەکان هەڵگری ئەم پرسەن، خەڵکی چاکەکاریان شوێنکەوتەی چاکەکاریانن و، خراپەکاریشیان شوێنکەوتەی خراپەکاریانن).

سەعد پێی وت: ڕاست دەکەیت، دەی ئێمە وەزیر و ئێوەش ئەمیرن.[٢]

پاشان، ئەگەر سەعد ئامادە نەبوویێت بەیعەت بدات، لەکاتێکدا گەورە و قسە ڕۆیشتووی ناو پشتیوانان بووەو، هەموان ڕازی بون بەبڕیارەکانی، چۆن لە هەموو ماوەی خیلافەتی ئەبوبەکر و عومەردا، کێشە و گرفتێکی نەنایەوە؟

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٧٧، قال الذهبي إسنادها كما ترى.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٢، قال شعيب الارناؤوط صحيح لغيره.

چۆن لەکاتی ئەو هەموو بارگرژییەی سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکردا، دەستی خۆی نەوەشاند و هەوڵی جوداخوازی نەدا؟

بۆیە ئەمانە تەنها خەونی کەسانێك بووە، کە حەزیان کردووە ئاقاری ڕووداوی کەپری بەنی ساعیدە، وای لێبێت و دواتر ئەو خەونەیان داڕشتووەو، لە سەرچاوەکاندا دایانناوەتەوە، ئەگەرنا، لە ڕوانگەی مێژووییەوە، هیچ پاڵپشتییەکی واقیعی دەست ناکەوێت.

## لەناوبردنی مالیکی کوڕی نوەیرە

کاتێك پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) وەفاتی کردو، خەڵکێك لە عەرەب بێباوەڕ بوون، ئەبوبەکر ویستی جەنگیان بکات.

عومەر وتی: ئەی ئەبوبەکر! چۆن جەنگی ئەو خەڵکە دەکەیت، لەکاتێکدا پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) فەرموویەتی: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله، فمن قالها فقد عصم مني ماله ونفسه إلا بحقه، وحسابه على الله.

واتە: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵك بجەنگم، تا دەڵێن: (لا الە الا اللە)، جا هەرکەس ئەوەی وت، ئیتر سامان و گیانی لێم قەدەغە دەبێت، بەحەقی خۆی نەبێت، حیسابیشی لای خوایە).

ئەبوبەکر وتی: بەخوا هەرکەس جیاوازی لەنێوان نوێژ و زەکاتدا بکات، لەگەڵی دەجەنگم، چونکە زەکات مافی سامانە، سوێند بەخوا، ئەگەر گیسکێکیان دابێت بە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)و، ئێستا نەیدەن بەمن، ئەوە لەسەر ئەوە جەنگیان لەگەڵ دەکەم!

عومەر دەڵێت: هێندەی نەبرد، خوا سینەی فراوان کردم بۆ ڕایەکەی ئەبوبەکر و، زانیم ڕایەکەی ئەو ڕاستە.[1]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ١٣٤٦، صحيح مسلم، الرقم ٥٤، صحيح ابن حبان، الرقم ٢١٦، سنن أبي داود، الرقم ١٣٤، سنن الترمذي، الرقم ٢٥٩٥، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٢١٩٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١٥.

ئەبوبەکری صدیق، یانزە لیوای پێکهێنا بۆ (جەنگی هەڵگەڕاوەکان)، ئینجا لیوایەکی تایبەت کرد بە خالیدی کوڕی وەلید و، ڕایسپارد بچێت بەرەو لای گولەیحەی کوڕی خوەیلید، ئەگەریش لەو ئەرکەی لێبوویەوە، ئینجا بڕوات بەرەو لای مالیکی کوڕی نوەیرە.[1]

ئینجا خالید چوو بەرەو لای مالیکی کوڕی نوەیرە، چونکە مالیکی کوڕی نوەیرە، پاش وەفاتی پێغەمبەر لە ئیسلام هەڵگەڕابوویەوە، ئەوەبوو کاتێك خالید چوو بۆ ئەوێ، قسەی لەگەڵدا کرد.

ئیتر لێرەوە ڕاجیاییەکان سەبارەت بە هەڵوێستی مالیکی کوڕی نوەیرە پەیدا دەبن:

مالیك بە خالیدی وت: سەبارەت بە نوێژ، ئامادەم نوێژ بکەم، بەڵام سەبارەت بەزەکات ئامادە نیم زەکات بدەم![2]

ئەمە هەڵوێستی پێشووتریشی بوو، ئەوەبوو کاتێك هۆزەکەی زەکاتیان کۆکردەوە، تا بینێرن، مالیکی کوڕی نوەیرە ڕێی نەدا و هەر لەناو خۆیاندا دابەشیکرد.[3]

مالیکی کوڕی نوەیرە، پەیوەندی بە (سەجاح)ی ژنە شاعیرەوە هەبوو، کە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کردبوو و، بڕیاری دابوو: بەشوێنکەوتەکانییەوە هێرش بباتە سەر مەدینە، مالیکیش چوو بەدەم بانگەوازەکەی (سەجاح)ەوە، بەڵام کاتێك (سەجاح) پەیوەندی بە (موسەیلەمەی درۆزن)ەوە کرد، ئیتر مالیك پەشیمان بوویەوەو، چوو بۆ ناوچەیەك، کە پێی دەوترا: (بطاح).

خالیدیش بڕیاریدا بچێت بۆ ئەوێ، بەڵام سوپای پشتیوانان، کە لەگەڵ خالید بوون، وتیان: ئێمە نایەین و تەنها ئەوە دەکەین، کە ئەبوبەکر فەرمانی پێداوین!

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣١٥.

(٢) تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٣٣.

(٣) شرح النووي على صحيح مسلم، ج١، ص ٢٠٣.

خالیدیش لە وەڵامدا وتی: ئەم کارە هەر دەبێت بکرێت و دەرفەتێکە، دەبێت بە هەند وەربگیرێت، ئێستاش هیچ نامەیەکم لەو بارەوە بۆ نەهاتووە، من ئەمیرم و فەرمانەکانم بەدەستە، بەڵام ناچاریشتان ناکەم بێن لەگەڵم، وا من دەچم بەرەو (بطاح).

ماوەی دوو ڕۆژ ڕێی بڕی، ئینجا پشتیوانان، ڕایان لەسەر ئەوە کۆك بوو، کە دەبێت لەگەڵ (خالید) بچین،چونکە ئەو ئەمیرە، خێرا نێردراویان نارد، تا بە خالید بڵێت: چاوەڕێیان بکات، تا خۆیان دەگەیەننەوە پێی، ئەوەبوو خۆیان گەیاندەوە بە خالید.[١]

خالید، کە گەیشتە ئەوێ، چەند کەسی نارد، تا خەڵکەکە کۆبکەنەوە، خەڵکەکەش کۆبوونەوەو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ نواند و، ئامادە بوون زەکاتیش بدەن، تەنها مالیکی کوڕی نوەیرە نەبێت، کە کەناری گرتبوو و خۆی یەکلا نەکردبوویەوەو نەیدەزانی چی بکات!

ئەوەبوو خۆی و هاوەڵەکانی بەدیل گیران، ئەبوقەتادەی ئەنصاری دەڵێت: من شایەتیم دەدا، کە نوێژیان دەکرد، کەسانێکی تر هەبوون شایەتییان دەدا، کە نەبانگیان دەدا و نە نوێژیان دەکرد، شەوێك لە شەوەکان، کە سەرمایەکی زۆر بوو، هاوارکەرەکەی خالید هاواری کرد دیلەکانتان گەرم بکەنەوە!

کەچی پاسەوانەکان وایانزانی مەبەستی ئەوەیە: دیلەکان بکوژن، بۆیە کەوتنە کوشتنی دیلەکان، چیراری کوڕی ئەوزیش، مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشت، هاوارکەرەکە، کە هاواری کوشتنەکانی بیست، خێرا هاتەدەرەوە، کەچی بینی تازە کار لەکار ترازاوە![٢]

ڕایەکی تر دەڵێت: بەڵکو هۆکاری کوژرانەکەی (مالیك) ئەوەبوو، کە خالید، مالیکی بانگ کرد و پێی وت: تۆ پێشتر شوێن (سەجاح) کەوتیت و ئامادە نەبوویت زەکات بدەیت.

---

(١) البداية و النهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٠ – ٣٢٢.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٢.

ئینجا خالید وتی: مەگەر نازانیت نوێژ و زەکات پێکەوە باس کراون؟

مالیکیش وتی: هاوەڵەکەی تۆ وای وتووە؟

خالید وتی: مەگەر ئەوە بەس هاوەڵی ئێمەیە و هی تۆ نییە؟

ئەی چیرار! بدە لە گەردنی، ئەویش دای لە گەردنی.

گێڕانەوەیەکی تر وا هاتووە، کە خالید، ئەبو قەتادەو دەستەیەکی تری نارد، کە گەیشتنە لای مالیك وتی: ئێوە کێن؟

وتیان: موسڵمانانین.

مالیکیش وتی: منیش بەندەی موسڵمانی خوام.

ئەبو قەتادە وتی: دەی چەکەکانتان دابنێن! ئەوانیش چەکەکانیان دانان و بەسترانەوەو، بردران بۆ لای خالید.

لەوێ ئەبو قەتادە وتی: ئەمانە موسڵمانن و پەنا دراون، بەڵام ئەندامانی تری دەستەکە وتیان: بەڵکو هیچ پەنایەکمان نەداون و بە زۆرەملێ هێنراون، بۆیە خالید فەرمانی کرد بە کوشتنیان.[1]

قەتادە بەکوشتارەکەی خالید ناڕازی بوو و لەو بارەوە مشتومڕی لەگەڵ کردو، گەڕایەوە بۆ لای ئەبوبەکر و سکاڵای لە خالید کرد، هەروەها ئەوانەی بۆ عومەریش باس کرد،[2] عومەریش چوو ئەبوبەکری دواند و وتی: خالید لابدە، چونکە شمشێرەکەی خوێن ڕێژی زیادە دەکات.

ئەبوبەکر وتی: شمشێرێ، کە خوا هەڵیکردووە بە ڕووی بێباوەڕاندا، نایخەمەوە کالان، ئینجا براکەی مالیکیش هاتە لای ئەبوبەکر و سکاڵای خالیدی کرد، عومەریش پاڵپشتی دەکرد، ئەبوبەکریش خوێن باییەکەی مالیکی دا بە براکەی.[3]

---

(١) تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٣٧.

(٢) الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٢١٧.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٢.

**سەبارەت بە کوژرانی (مالیك) ئەم چەند خاڵە دەخەینەڕوو:**

**یەکەم:** ڕاجیایی هەیە، ئایا (مالیك) بە بێباوەڕی کوژراوە، یان بە موسڵمانی؟

بەڵام ئەگەر تەماشا بکەین: لە هەموو گێڕانەوەکاندا ئەوە چەسپاوە، کە (مالیك) ئامادەیی ئەوەی نەبووە زەکات بدات، جا ئەگەر گێڕانەوەی یەکەم بێت، کە شەو لەگەڵ دیلەکانی تر کوژرابێت، ئەوە بە هەمان چەشنی هەڵەکەی پێشووتری (صبأنا، صبأنا) بووەو، وەك لە گێڕانەوەکەدا هاتووە: خالید مەبەستی نەبووە بیکوژێت، ئەگەریش بە گێڕانەوەی دووەم بێت، کە تیایدا (مالیك) لەبەردەم خالیددا حاشای کردووە لە واجب بوونی زەکات، ئەوە دەزانین ئەبوبەکر لەبەر نەدانی زەکات، فەتوای جیهاد و کوشتنی ئەوانەی دا، کە ئامادەی زەکات دان نین.

**دووەم:** لەوانەیە ڕاڕایی زۆری (مالیك) وایکردبێت،کە بارەکە ئاڵۆز بکات، سەرەتا چوونی بۆ لای (سەجاح)، دواتر دەستبەرداربوونی لە (سەجاح) و گەڕانەوە بەرەو ئیسلام، دواتر بەرگرتن لە هۆزەکەی، تا زەکات نەدەن.

هەروەها دواتر هەڵوێستێکی وای بووە، کە موسڵمانانی دوو لەت کردووە، دەستەیەك بە موسڵمانیان داناوە، وەك، ئەبوقەتادە، دەستەیەکیش بە شیاوی کوشتنیان داناوە، وەك: خالید، لەسەر ئەو دوو بڕیارە جیاوازەش حوکمی دوو گەورە هاوەڵی پێغەمبەر لەسەری جیاواز دەبێت.

عومەر لەو کوشتنەدا، خالید بە هەڵەو تاوانبار دەزانێت و پێی وایە: ئیتر دەبێت خالید پۆستەکەی لێ بسەنرێتەوە، ئەبوبەکریش لەوپەڕی قەناعەتیدا، بە ئیجتیهادێکی هەڵەی خالیدی دەزانێت و، ئامادە نییە خالید لاببات، بۆیە خوێن باییەکەی مالیك دەدات.

ئەم هەڵوێستەی ئەبوبەکریش ڕاستتر بوو، چونکە پێغەمبەر پێشتر لە بارێکی لەو چەشنەدا، هەمان هەڵوێستی ئەبوبەکری هەبوو، ئەبوبەکریش چاوی

لە پێغەمبەری خواکرد، ئەوەبوو کاتێك خالید لە سەردەمی پێغەمبەردا بە ئیجتیهادێکی هەڵە خەڵکانێکی کوشت، پێغەمبەر،خالیدی لە بەرپرسیارێتییەکان لانەبرد، هاوکات خوێن بایی کوژراوەکانیدا.

سێیەم: سەبارەت بە هەڵوێستی ئەبو قەتادەی ئەنصاری، پێدەچێت ڕاڕاییەکەی مالیك، وای لە هەڵوێستی کردبێت، چونکە مالیکی کوڕی نوەیرە، دوای دەستبەرداربوونی لە (سەجاح) ڕاڕا کەوتبوو، لەلایەکەوە دەیویست بەرەنگاری سوپای موسڵمانان نەبێتەوە، لەلایەکیشەوە ئامادە نەبوو زەکات بدات، پێدەچێت: لە دواندنی ئەبوقەتادەدا، جۆرێك لە بڕوا بوونی بە زەکات دەربڕیبێت و، لای خالیدیش هەڵوێستی بڕوانەبوونی هەبوویێت.

بەهەرحاڵ، هەڵوێستەکەی (خالید)، خۆی لە دوو ئەگەردا دەبینێتەوە:

یان بە ئیجتیهادێکی هەڵە، مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشتووە!

یان بە حەق پەیڕەوی بڕیاری خەلیفەی کردووە، بۆ کوشتنی ئەوانەی حاشا لە زەکات دەکەن.

بەڵام بە هەڵوێستی ئەبوقەتادەو عومەر و ئەبوبەکردا دەردەکەوێت: ئەگەری زیاتر ئەوە بووە، کە خالیدی کوڕی وەلید بەئیجتیهادێکی هەڵە، مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشتووە، حوکمی ئەبوبەکر و عومەریش لە بارەی خالیدەوە جیاواز بوو،حوکمەکەی ئەبوبەکریش دروستتر بوو، چونکە پێشەنگی کردن بوو بەهەڵوێستێکی پێغەمبەر، لە هەمان چەشنی ڕووداودا.

هەروەها بەڵگەیەکی تر ئەوەیە، کەکاتێك عومەر لای ئەبوبەکر دژی خالید قسەی کرد، ئەبوبەکر وا وەڵامی دایەوە: عومەر! لەسەرخۆبە، خالید ئیجتیهادێکی کردووەو هەڵەی تێدا کردووە، دەی زمانت بگرەوە لە خالید، چونکە من شمشێرێك داناگرم، کە خوا بە ڕووی بێباوەڕاندا هەڵیکردووە.[1]

---

(١) الکامل في التأریخ، ج٢، ص ٢١٧.

## هاوسەرگیری خالید و ژنەکەی مالیکی کوڕی نوەیرە

لە مێژوودا ئەم بابەتە، بووەتە تانەیەك بۆ خالیدی کوڕی وەلید، کاتێك خالید، مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشت، دواتر لەگەڵ ژنەکەیدا هاوسەرگیریی کرد، جا دەستەیەك بە چەند بەڵگەیەك ئەوە بە ڕەوا دەزانن، دەستەیەکیش بە ناڕەوای دەزانن و دەڵێن: خالید لەبەر ژنەکەی، مالیکی کوشتووە![1]

بەپێی گێڕانەوەیەك هاتووە: خالید پاش کوشتنی مالیك، وەستا، تا ژنەکەی ماوەی پاکبوونەوەی تەواو بوو، بەڵام ئەبوبەکر سەبارەت بە هاوسەرگیرییەکەی لێی تووڕە بوو.[2]

کاتێك مەسەلەکە لای ئەبوبەکر و عومەر قسەی زۆری لێکرا، ئەبوبەکر فەرمانی کرد: خالید بێتەوە مەدینە، کە خالید هاتەوە، عومەر پێی وت: بە ناحەق موسڵمانێکت کوشتووەو ژنەکەیشت بردووە! دەبێت سزا بدرێیت.

کاتێك خالید چوو بۆ لای ئەبوبەکر و دواندی، خالید بەڵگەی هێنایەوە بۆ کارەکەی و توانی قەناعەت بە ئەبوبەکر بکات، ئەبوبەکر بەڵگەکانی خالیدی پەسەند کرد و خوێن بایی مالیکیدا و، وازی هێنا لە خالید و لە پۆستەکەیدا هێشتییەوە.[3]

بەهەرحاڵ، بەپێی دەقە مێژووییەکانەوە، مەسەلەی کوشتنی مالیك، هیچ پەیوەندییەکی نەبووە بە ژنەکەیەوە، بەڵکو هاوسەرگیریی دوای ئەوە قسەی لەسەرە، کە ئایا ڕەوا بووە، یان نا؟ ئەمەش ناڕەزایی عومەر و ئەبوبەکریشی لەسەر بووە.

---

(١) البدء و التاريخ، ج٥، ص ١٥٩.

(٢) تأريخ الطبري، ج٢، ص ٢٧٣.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٣.

# لابردنی كاربەدەستەكان لەلایەن ئیمامی عومەرەوە

## ١- لابردنی خالیدی كوڕی وەلید

كاتێك عومەری كوڕی خەططاب بوو بە خەلیفە، خالیدی كوڕی وەلیدی لە پۆستەكەی لابرد و، بە نامەیەك ئەوەی نارد بۆ ئەبو عوبەیدە، خالیدیش لە وەڵامدا وتی: گوێڕایەڵی فەرمانی ئەمیری باوەڕدارانم،[١] پاش ئەوەش لە ژێر فەرمانی ئەبو عوبەیدەدا مایەوەو بەردەوام جیهادی دەكرد، وەك لە فەتحی دیمەشقدا بەشداری كرد و، ئەبوعوبەیدەش بەرپرس بوو.[٢]

لێرەدا تەمومژیەك دروستكراوە، سەبارەت بە هۆكاری لابردنی خالیدی كوڕی وەلید، لەلایەن عومەری كوڕی خەتتابەوە، جا هەیانە هۆكارەكەی بە كینەیەكی سەردەمی جاهیلی دادەنێن، هەیانە هۆكارەكەی دەبەستنەوە بە كوشتنی مالیكی كوڕی نوەیرەوە، هەشیانە دەیبەستێتەوە بە گوێڕایەڵ نەبوونی خالید بۆ عومەر، وا لە خوارەوە گێڕانەوەكان دەخەینەڕوو:

كاتێك عومەر و خالید مێرمنداڵ بون، زۆرانێكیان كرد، خالید قاچێكی عومەری شكاند، ئەو داخە لە دەروونی عومەردا مایەوە، تا كە بوو بە خەلیفە تۆڵەی كردەوە.[٣]

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٩.

(٢) تاريخ دمشق، ج٢٥، ص ٤٧٥.

(٣) السيرة الحلبية، دار المعرفة(بيروت — ١٤٠٠هـ)، ج٢، ص ٢١٣.

له‌ سه‌رده‌می ئه‌بوبه‌كردا، عومه‌ر به‌ئه‌بوبه‌كری وت: نامه‌یه‌ك بنێره‌ بۆ خالید و فه‌رمانی پێ بكه‌، به‌ فه‌رمانی تۆ نه‌بێت، هیچ جووڵه‌یه‌ك نه‌كات.

خالیدیش وه‌ڵامی دایه‌وه‌، یان له‌ هه‌ڵسوكه‌وتمدا ده‌ستم واڵا بكه‌، یان لام ببه‌.

عومه‌ریش وتی: ده‌ی لایببه‌.

ئه‌بوبه‌كر وتی: جا كێ جێی خالیدم بۆ ده‌گرێته‌وه‌؟!

له‌ سه‌رده‌می عومه‌ریشدا، خه‌لیفه‌ هه‌مان نامه‌ی بۆ نووسی، خالیدیش هه‌مان وه‌ڵامی بۆ عومه‌ر نووسی، كه‌ بۆ ئه‌بوبه‌كری نووسیبوو.

عومه‌ریش لایبرد، پاش ماوه‌یه‌ك، داوای له‌ خالید كرده‌وه‌، تا پۆست وه‌ربگرێته‌وه‌، به‌ڵام خالید ئاماده‌یی نه‌بوو، مه‌گه‌ر به‌و مه‌رجه‌ی ده‌ستی واڵا بكات، عومه‌ریش به‌وه‌ ڕازی نه‌ده‌بوو.[1]

بۆیه‌ ده‌توانین بڵێین: تاكه‌ هۆكاری لابردنی خالید، له‌لایه‌ن عومه‌ری كوڕی خه‌ططابه‌وه‌، بریتی بوو له‌و جموجووڵه‌ سه‌ربه‌خۆییه‌ی خالید، له‌ كاتی جه‌نگ و فتوحاتیدا، عومه‌ریش لای سه‌خت بوو له‌ پاڵ هه‌زار ڕاستیدا، ناحه‌قیه‌ك هه‌بێت، بۆیه‌ خالیدی لابرد.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر ته‌ماشا بكه‌ین: هۆكارێكی سه‌ركه‌وتنه‌ گه‌وره‌كانی خالید، ئه‌و جۆره‌ سه‌ربه‌خۆیی و ده‌ست واڵاییه‌ی بوو، كه‌ هه‌یبوو، پێغه‌مبه‌ری خواو ئه‌بوبه‌كری صدیقیش، ئه‌و ده‌رفه‌ته‌یان بۆ هێشته‌وه‌و له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا، جۆرێك له‌ لێپێچینه‌وه‌و لێ توندكردنه‌وه‌یان بۆ به‌كارده‌هێنا، به‌ڵام له‌ پۆسته‌كه‌ی لایان نه‌ده‌برد، چونكه‌ ئه‌وه‌ شمشێری هه‌ڵكراوی خوا بوو به‌ ڕووی بێباوه‌ڕاندا، ده‌بینین خالید به‌و ده‌ست واڵاییه‌ی بڕیاردانه‌ی له‌ سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ری خوادا چه‌ند هه‌ڵه‌یه‌كی كرد، به‌ڵام پێغه‌مبه‌ری خوا كه‌ناری نه‌خست، له‌ سه‌رده‌می ئه‌بوبه‌كریشدا، دووباره‌ له‌ كوشتنی مالیكی كوڕی نوه‌یره‌دا ئیجتیهادی هه‌ڵه‌ی

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.

کرد، بەڵام ئەبوبەکر لای نەبرد، عومەریش، کە بوو بە خەلیفە، ئیجتیهادێکی کرد بە لابردنی خالید، جائایا پێکای، یان نا؟

ئەوە خوا زاناترە.

## ٢- لابردنی عەممـاری کوڕی یاسـر

عومەری کوڕی خەططاب، عەمماری کوڕی یاسری هاودەم بە ئیبن مەسعود نارد بۆ عێراق و، ئەرکی کارگێڕیی و مامۆستایی پێ بەخشین و، نامەیەکی هاودەم بەوان نارد بۆ خەڵکەکەو، تیایدا نووسیبووی: من دوانم لە کەسە ناوازەکانی ناو هاوەڵان بۆ ناردون، کە بەشداربووی (بەدر) بوون، گوێڕایەڵیان بن و پێشەنگییان پێوە بکەن، من لەبەر ئێوە، خۆم بێبەش کردووە لە نزیکی ئەو دوانە.[١]

کاتێك خەڵکی بەصرە هێرشیان برد بۆ نەهاوەند و بۆیان فەتح نەکرا، عەممار بە خەڵکی کوفەوە چوو بۆ یارمەتییان، خوا فەتحی بەخشی، دواتر کە ویستیان دەستکەوتەکان دابەش بکەن، خەڵکی بەصرە ویستیان بەشی خەڵکی کوفە نەدەن!

جا یەکێك لە بەصراییەکان بەعەمماری وت: ئەی گوێ قرتاو! دەتەوێت تۆیش لە دەستکەوتەکانماندا بەشدار بیت؟

عەممار وتی: قسەت بە گوێ، چاکەکەمت وت، ئەم گوێیەم لە غەزای هاودەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)وای لێهات، دواتر نامەی نووسی بۆ خەلیفە عومەر و مەسەلەکەی بۆ خستەڕوو، خەلیفەش وەڵامی نوسی: هەرکەس بەشداری جەنگەکە بوویێت دەستەکەوتی: بۆ هەیە.[٢]

---

(١) سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٤٢٢.

(٢) سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٤٢٢.

دواتر خه‌لیفه عومه‌ر، عه‌مماری له پۆسته‌كه‌ی لابرد، چه‌ند هۆكارێك باسكراوه، له‌وانه: خه‌ڵكێك لای خه‌لیفه قسه‌ی زۆریان له‌سه‌ر كردووه‌و، ئه‌ویش بێ عاجزبوون لایبردووه، یان ده‌وترێت: عومه‌ر، كه پرسیاری له جه‌ریر كرد: عه‌ممار چۆنه؟

وتی: شاره‌زایی سیاسه‌تی نییه.

بۆیه بڕیاریدا لایببات، عومه‌ر به عه‌مماری وت: پێت ناخۆش نه‌بوو لامانبردیت؟

عه‌ممار وتی: كه ئه‌و ئه‌ركه‌ت پێ سپاردم پێم ناخۆش بوو، كه لاشت بردم پێم ناخۆش بوو.[1]

## ٣- لابـردنـی شـوره‌حبیـل

كاتێك عومه‌ر ویستی شوره‌حبیلی كوڕی حه‌سه‌نه له پۆسته‌كه‌ی لاببات، شوره‌حبیل وتی: ئه‌ی عومه‌ر! بڵێ: له‌سه‌رچی لامده‌به‌یت؟!

چی تووڕه‌ی كردویت؟

عومه‌ر وه‌ڵامی دایه‌وه: نا له تووڕه‌ییه‌وه نییه، به‌ڵكو كه‌سی له تۆبه‌هێزترمان به‌دیكرد، بۆیه نه‌مانویست لای خوا تاوانبار بین.

شوره‌حبیل وتی: ده‌ی لای خه‌ڵك ڕوونی بكه‌ره‌وه.

عومه‌ریش چووه سه‌ر مینبه‌ر و وتی: ئێمه شوره‌حبیلی كوڕی حه‌سه‌نه‌مان كرد به به‌رپرس، دواتریش بێئه‌وه‌ی لێی تووڕه‌و بێزار بین، لامانبرد، ته‌نها له‌به‌رئه‌وه‌ی،كه كه‌سی له‌و به‌هێزترمان بینی، بۆیه لامانبرد، تا لای خوا تاوانبار نه‌بین.[2]

---

(١) سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص ٤٢٣.

(٢) مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٢٩٩٥٦.

## ٤- لابردنی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، لەلایەن خەلیفە (عومەری کوڕی خەططاب)ەوە کرابوو بە والی کوفە، دەوترێت: (سەعد) بناغەدانەری کوفە بووەو کردوویەتی بەشار،[1] بەڵام خەلیفە لە ساڵی بیستی کۆچیدا، سەعدی لە والیەتی کوفە لابرد.[2]

بەهۆی سکاڵای خەڵکەوە، (سەعد) لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا، لەلایەن خەلیفە (عومەری کوڕی خەططاب)ەوە لە ئەمیرایەتی کوفە لابرا.[3]

عومەر بڕیاریدا: وردەکاریی دارایی والییەکانی بزانێت، بۆیە نامەی نارد بۆیان، تا هەموویان ڕێژەی سامانی خۆیان بنووسن، ئەوەبوو نامەی نارد بۆ (سەعد)یش، کە سەعد ڕێژەی سامانەکەی خۆی نووسی، عومەر سامانەکەی کرد بە دوو بەشەوە: بەشێکی بۆ هێشتەوەو،نیوەکەی تری خستە بەیتول مالەوە.[4]

بەڵام ئەو لابردنەی (سەعد) لەلایەن عومەرەوە، لەبەر کەمتەرخەمی (سەعد نەبوو)، وەك عومەر خۆی دەڵێت: من (سەعد)م لەبەر لاوازیی، یان ناپاکبوونی لانەبردووە.

هەر بۆیە دەبینین: پێش شەهیدبوونی عومەر، شەش کەس کاندید دەکات بۆ خیلافەت، یەکێکیان: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصە.[5]

---

(١) الكامل في التأريخ، ج٢، ص٣٣٧-٣٣٨.

(٢) الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٤٠٩.

(٣) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١١٨.

(٤) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٠٧.

(٥) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١١٨.

## ٥- لابردنی ئەبوهورەیرە

ئەبوهورەیرە، لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەططاب)دا، لەلایەن خەلیفەوە کرا بە بەرپرسی بەحرەین، دواتر پاش ماوەیەك خەلیفە لەو پۆستەی لایبرد، دواتر خەلیفە ویستی ئەرکی تری پێ بسپێرێت، بەڵام ئەبوهورەیرە ئامادە نەبوو پۆست وەربگرێت، بۆیە لە مەدینە مایەوەو، سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی زانست بوو.[١]

ئەبوهورەیرە دەڵێت: کە لە بەحرەینەوە هاتمەوە، عومەر وتی: ئەبوهورەیرە! دەسەڵات چۆن بوو؟

وتم: کە منت نارد حەزم پێ نەبوو، کە لاتبردم حەزم پێی بوو!

ئینجا ئەبوهورەیرە، چوارسەد هەزار درهەمی لە بەحرەینەوە هێنا.

خەلیفە وتی: هیچت بە ناحەق وەرنەگرتووە؟

وتی: نا.

وتی: ئەی خۆت چەندت هەیە؟

وتی: بیست هەزار.

عومەر وتی: لەکوێت بوو؟

ئەبوهورەیرە وتی: بازرگانیم دەکرد.

عومەر وتی: سەرمایە و بەشەکەی خۆت هەڵبگرەوە، ئەوی تری بخەرە بەیتول مالەوە.[٢]

---

(١) أسد الغابة، ج٦، ص ٣٣٩.

(٢) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج، ص ٣٣٦.

# ئایا عومەر
# سکەکەی فاتیمەی لەبارچواندووە؟

مەسەلەیەکی تر، کە باسکراوە لە دەقە شیعیەکاندا هاتووە: کەوا عومەری کوڕی خەططاب بۆ ئەوەی بە زۆر بەیعەت لە عەلی و فاتیمە وەربگرێت، چووە تا ماڵیان بەسەردا بسووتێنێت و گورزی لە فاتیمە وەشاندووەو سکەکەی لەبارچواندووە، بەو هۆیەشەوە فاتیمە وەفاتی کردووە!

**جا ئەمانە قسەی زۆر بێ بنەما و پڕوپووچن بەم بەڵگانە:**

١- ئەوان دەڵێن: عەلی شێری خوایە، کەچی نەیوێراوە ڕاستی خۆی نیشان بدات و، بە ناچاریی توقیەی بەکارهێناوەو بەیعەتی داوە بە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان.

٢- دەڵێن: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئیمامەتی بۆ عەلی دیاریکردووە، بەڵام هەموو هاوەڵان هەڵگەڕاونەتەوەو، کودەتایان بەسەر عەلیدا کردووە، تەنها چەند هاوەڵێك نەبێت، وەك ئەوەی ئەو هەموو خوێندکارەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لەسەر ناپاکیی پەروەردە کرابن - پەنا بەخوا -.

٣- دەڵێن: عەلی شێری خوا و مەردی مەیدان بووە، بەڵام عومەر بەبەرچاویەوە هاتووە ماڵەکەی بسووتێنێت و، شەقی داوە لە سکی فاتیمەو سکەکەی لەبارچواندووە بەو هۆیەشەوە مردووە، کەچی عەلی هیچی نەکردووەو، دواتریش بەیعەتی داوە بە ئەبوبەکر و عومەریش!

٤- دەڵێن: عەلی زانیویەتی،کە خاتوعائیشە ناپاك بووەو بە دوژمنی ئیسلامی زانیوە، کەچی، کە خاتو عائیشەی کەوتووەتە دەست، نەیکوشتووە و خزمەتی کردووەوە!

٥- دەڵێن: عەلی دوژمنی سەرسەختی عوسمان بووە، چونکە عوسمان مافی داگیرکردووە، کەچی حەسەن و حوسەینی کوڕانی خۆی ناردووە بۆ ماڵی عوسمان، تا بەرگری لێبکەن!

ئەمەو دەیان نموونەی تر، وا وێنای عەلی دەکەن - دوور بێت لەو هاوەڵە گەورە موژدەپێدراوەی بەهەشت - کەسێکی دووفاقی ترسنۆکی بێنازی بێدەسەڵات بوویێت، لەکاتێکدا سەدان بەڵگە هەن، وەڵامی ئەو ناڕاستییانە دەدەنەوە.

## ئاوات خواستنی عومەر بە مەرگ

عومەری کوڕی خەططاب لە کۆتا حەجیدا - لەساڵی ٢٣ کۆچی - نزایەکی کرد، کە تاسەی مەرگی تێدا بوو، دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو وتی: خوایە! تەمەنم زۆرەو توانام کەمی کردووەو ناوچەی دەسەڵاتم فراوان بووە، دەی خوایە! تا نەفەوتاوم بمبەرەوە بۆ لای خۆت.[1]

هەروەها عومەر نزای دەکرد:(خوایە! شەهیدییەکم پێ ببەخشە، کە لەرێی تۆدا بێت، مەرگیشم بخەرە ناو شارەکەی پێغەمبەرەکەتەوە).[2]

ئەم کارەی عومەر شتێکی نامۆ نەبووە لەناو هاوەڵاندا، بەڵکو هاوەڵانێك، کە ترساون لەوەی تووشی فیتنە بن، نزای مەرگیان کردووە.

بۆ نموونە: حەسەنی کوڕی ئەبیلحەسەنی بەصری دەڵێت: حەکەمی کوڕی عەمر - کە هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بوو - کە نزای مەرگی کرد، وتی: ئەی تاعون! وەرە بمبە بۆ لای خۆت.

کەسێك پێی وت: باشە تۆ چۆن وا دەڵێیت، لەکاتێکدا بیستووتە لە پێغەمبەر، کە دەیفەرموو : (کەستان لەبەر خراپەو زیانێك، کە تووشی دەبێت، ئاوات بە مەرگ نەخوازێت).

---

(١) موطأ مالك، الرقم ١٥٠٢، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٤٦٢.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ١٨٠٠.

حەکەم وتی: بەڵێ من ئەو فەرموودەم بیستووە، بەڵام دەمەوێت پێش شەش شت بکەوم و، نەگەم بەوانەو پێش ئەوانە بمرم: فرۆشتنی دادوەریی...[1]

هەرچەندە (ذەهەبی) بێدەنگ بووە لە حوکمی صەحیحی ئەم فەرموودەیە، بەڵام لەو دەقەی (ئیبن حەجەر)ەوە دەزانین صەحیحە، کە دەڵێت: ڕای ڕاستتر ئەوەیە: حەکەم نزای مەرگی بۆ خۆی کردووە.

سەبارەت بە حوکمی داواکردنی مەرگ لە شەرحی ئەو فەرموودەدا، کە پێغەمبەر دەفەرموێت: ( کەستان لەبەر خراپەو زیانێك، کە تووشی دەبێت ئاوات بە مەرگ نەخوازێت).

(ئیبن حەجەر) دەڵێت: ئەم گوتارە بۆ هاوەڵان و موسڵمانانی دواتریشە، سەبارەت بەوەی فەرموویەتی: لەبەر زیانێك داوای مەرگ نەکرێت، دەستەیەك لە زانایانی پێشین، پێیان وایە: مەبەستی زیان و ناڕەحەتی دنیاییە، ئەگەرنا، ئەگەر بینی زیانەکە بۆ ئاخیرەتی بوو و، ترسا دینەکەی تووشی فیتنە بێت، ئەوە ڕێگری نەکراوە لە داوای مەرگ، دەستەیەك لە هاوەڵانیش ئەوەیان کردووەو - لە ترسی زیانی ئاخیرەت - داوای مەرگیان کردووە، وەك لە (الموطأ)دا هاتووە: عومەر داوای مەرگی کردووەو وتوویەتی: خوایە! تەمەنم زۆر بووەو توانام کەمی کردووەو، هاوڵاتیانیشم بڵاوبوونەتەوە، دەی بمبەرەوە بۆ لای خۆت،... سەبارەت بەوەش کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (ئەگەر هەرکامتان هەر ناچار بوو - ئاوات بە مەرگ بخوازێت- با بڵێت: خوایە! بممرێنە ئەگەر مەرگ خێرە بۆم)، ئەوە ئاماژەیە بەوەی، ئەو شێوە داواکردنە ڕێگری لێنەکراوەو ڕاستەوخۆ داواکردنی مەرگ، نیشاندانی جۆرێك لە ناڕەزایەتیە.[2]

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٨٦٩، سكت عنه الذهبي.

(٢) فتح الباري، ج١٠، ص ١٢٨.

## ئەو ڕەخنانەی
## لە عوسمانی کوڕی عەففان دەگیران

ئیبنولعەرەبی، کۆی ئەو ڕەخنانەی کۆکردۆتەوە، کە لە خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان دەگیران و، وەڵامی هەریەك لەوانەشی خستوەتەڕوو، ئێمەش هاودەم بە زیادەیەك بۆ وتەکانی ئیبنولعەرەبی، هەم ڕەخنەو هەم وەڵامەکان دەخەینەڕوو:

هێندەی لە عەممار دا، تا ناوسکی تەقی !

هێندەی لە ئیبن مەسعود دا، تا ئێسك و پروسکی شکاند و مووچەشی لێ بڕی!

ئیبنولعەرەبی دەڵێت: سەبارەت بە لێدانی ئیبن مەسعود و مووچەپێنەدانی، ئەوەدرۆو ساختەیە، سەبارەت بە لێدانی عەمماریش، هەروەك ئەوی پێشوو درۆو ساختەیە، ئەگەر ناوسکی بتەقیایە، هەرگیز نەدەژیا.

زانایان لەو بارەیەوە برێ پۆزشیان هێناوەتەوە، کە هی ئەوە نییە باسیان بکەین، چونکە خودی باسەکە لەسەر پووچی و نادروستی وەستاوە، ئیتر هیچ حەقێك لەسەر پووچیی بنیادنانرێت، بەشوێن پێی نەفاماندا ڕێ نابڕین، چونکە ئەو ڕێی ئەوان، کۆتایی نییە.[1]

ئیبن مەسعود لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا، کە بەرپرسی بەیتولمالی موسڵمانان بوو لە کوفە، لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص،

---

(١) العواصم من القواصم.

کێشەیەکی بۆ دروست بوو، عوسمانی کوڕی عەففان پاش ماوەیەکی زۆر، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی لە والیەتی کوفە لابرد، ئەویش لەبەر کێشەیەك، کە لەگەڵ ئیبن مەسعود هەیبوو، چونکە قەرزی لە بەیتولمال کردبوو، کە ئیبن مەسعود بەرپرسی بوو.

کاتێك ئیبن مەسعود داوای قەرزەکەی لە سەعد کردەوە، سەعدیش توانای نەبوو بیداتەوە، بۆیە کێشە کەوتە نێوانیانەوە، هەواڵەکە گەیشتەوە بەعوسمان و ئەویش سەعدی لابرد و، وەلیدی کوڕی عوقبەی لە شوێنیدا دانا.[١]

کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان نوسخەکانی قورئانی یەکخست و، تەنها یەك جۆری هێشتەوە، ئیبن مەسعود ئامادە نەبوو نوسخەکەی خۆی لاببات، چونکە دەیوت: من خۆم لە پێغەمبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)ئەم قورئانەم بیستووە.[٢]

کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان، داوای لە ئیبن مەسعود کرد بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، خەڵکی کوفە وتیان: لێرە بمێنەوە، ئێمە ناهێڵین هیچ ئازارێکت پێ بگات.

ئەویش وتی: من گوێڕایەڵی خەلیفەم لەسەرە، دەبینم فیتنە بەرێوەیە، نامەوێت من یەکەم کەس بم،ئەو دەرگایە بکاتەوە، بۆیە خەڵکەکەی گێڕایەوەو، بەرەو مەدینە کەوتەڕێ.[٣]

پاش ماوەیەك ئیبن مەسعود نەخۆش کەوت، عوسمانی کوڕی عەففان هات بۆ لای، وتی: ئازاری چیت هەیە؟

ئەویش وتی: ئازاری تاوانەکانم.

---

(١) الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٤٧٧.

(٢) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٨٧-٤٨٨.

(٣) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٨٩.

وتی: ئەی حەز بە چی دەکەیت؟

وتی: ڕەحمەتی پەروەردگارم.

وتی: ئەی فەرمان نەکەم پزیشکێك بێت بۆ لات؟

ئەویش وتی: پزیشك دەوای کردووم.

عوسمان وتی: فەرمان نەکەم بەخششت بکەن؟

وتی: هیچ پێویستم پێی نییە![1]

دواجار ئیبن مەسعود لە مەدینەو لە ساڵی سی و دووی کۆچیدا وەفاتی کرد،[2] کاتێك وەفاتی کرد، نوێژی لەسەر کرا، ڕایەك دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففان نوێژی لەسەر کرد، ڕایەکیش دەڵێت: عەمماری کوڕی یاسر نوێژی لەسەر کرد، ڕایەکیش دەڵێت: زوبەیری کوڕی عەووام نوێژی لەسەر کرد، دواتر وەستان تا شەو، چونکە خۆی وەسیەتی کردبوو، شەو ئەسپەردەی بکەن، ئینجا لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەیان کرد.[3]

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩٨.

(٢) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤٩٩.

(٣) أسد الغابة، ج٣، ص ٤٠٠.

## لە کۆکردنەوەی قورئاندا لایداوە و بیدعەی نواندووە لە سووتاندنی موصحەفەکانی قورئاندا:

ئیبنلوعەرەبی لەم بارەیەوە دەڵێت:(سەبارەت بە کۆکردنەوەی قورئان، ئەوە کارێکی زۆر چاکی عوسمان بوو، کە ئەنجامیدا، هەرچەندە هەموو قورئان لەبەردەست بوو، بەڵام خەڵکی ڕاجیابوون - لە خوێندنەوەی- بۆیە چی ڕاجیایی لەسەربوو نەیهێشت و، مەسەلەکەی یەکلاکردەوە، بەوەش بەڵێنی خوا هاتەدی بە پاراستنی قورئان، کە ئەمەش لەسەردەستی عوسمان هاتەدی، وەك چۆن لە نووسینەکانی تایبەت بە قورئانو، چەند نوسینی تردا ئەوەمان ڕوونکردۆتەوە.

هەموو پێشەوایان ئەوەیان گێڕاوەتەوە، کە زەیدی کوڕی ثابت وتی: لەکاتی جەنگی خەڵکی (یەمامە)دا، ئەبوبەکر ناردی بە شوێنمدا، بینیم عومەری کوڕی خەططاب لەلای بوو، ئەبوبەکر وتی: عومەر هاتووە بۆ لامان و دەڵێت: کوژراوەکانی ڕۆژی (یەمامە) خەریکە ئەوانە نەهێڵێت، کە قورئانیان لەبەرە، من دەترسم ئەم بارە وا بڕوات، بەشێکی قورئان لەدەست بچێت! بۆیە پێم باشە قورئان کۆبکرێتەوە.

منیش بە عومەرم وت: چۆن شتێك بکەین، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)نەیکردووە؟!

عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەم کارە باشترە، بۆیە بەردەوام لێی دووبارە دەکردمەوە، تا خوای گەورە دەروونی واڵا کردم بۆ ئەو کارەو، ڕام چوویە سەر ڕایەکەی عومەر.

ئیتر دەستنووسەکە لای ئەبوبەکر بوو، تا وەفاتی کرد، دواتر لای عومەر بوو، تا وەفاتی کرد، دواتر لای حەفصەی کچی عومەر بوو، تا حوزەیفەی کوڕی یەمان هات بۆ لای عوسمان، ئەوەش کاتێك لە غەزای شام لە فەتحی

(ئەرمینیا) و (ئازەربایجان) لەگەڵ خەڵکی عێراق بوو، کە گەڕایەوە بۆ لای عوسمان، باسی جیاوازی خوێندنەوەی قورئانی لای ئەو خەڵکە بۆ عوسمان گێڕایەوە.

بۆیە حوژەیفە بە عوسمانی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران! فریای ئەم ئوممەتە بکەوە، پێش ئەوەی وەك ناکۆکی جوولەکەو مەسیحییەکان، موسڵمانانیش سەبارەت بە قورئان ناکۆکییان تێبکەوێت، بۆیە عوسمان کەسی نارد بۆ لای حەفصە و، پێی وت: نوسخەی موصحەفەکەمان بۆ بنێرە، تا لەبەری بنووسینەوە و، دواتر دەیگێڕینەوە بۆت.

حەفصەش موصحەفەکەی نارد بۆ عوسمان، ئینجا عوسمان فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی ثابت و عبداللەی کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی عاص و عبدالرحمنی کوڕی حارثی کوڕی هیشام، تا لەبەری ئەو موصحەفە، چەند نوسخەیەك بگرنەوە، ئەوانیش ئەو کارەیان بەئەنجام گەیاند.

عوسمان بە سێ کەسە قورەیشییەکانی وت: ئەگەر ئێوە لە شتێکدا ڕاجیابوون لەگەڵ زەیدی کوڕی ثابت، ئەوا بە زمانی قورەیشی بینووسن، چونکە قورئان بە زمانی قورەیشی دابەزیوە، ئەوانیش وایان کرد.

کاتێك ئیشەکەیان تەواو کرد، عوسمان موصحەفەکەی گێڕایەوە بۆ حەفصە، عوسمان بۆ هەر ناوچەیەك، موصحەفێکی لەو موصحەفانە نارد کە - دەستەکە - نووسیبوویانەوە و فەرمانیکرد - لە ناوچەکاندا - چی نووسینەوەی تری بەشێکی قورئان و، چی موصحەفی تر هەیە بسووتێنرێت.

سەبارەت بەوەی دەوترێت: عوسمان موصحەفەکانی تری سووتاندووە، یان دڕاندووە، ئەوا هەردووکیان جائیزە، ئەگەر مانەوەی ئەو موصحەفانە خراپەی لێ بکەوێتەوە، یان شتێکی تێدا بێت، کە - لە بنەڕەتدا - لە قورئاندا نەبێت، یان لەسەر بنەمای قورئان خۆی نەبێت، لەوەشدا هەموو هاوەڵان یەدەنگ بوون و کێشەیان نەبوو.

بەڵام لە ئیبن مەسعودەوە گێڕدراوەتەوە، کە لە کوفە وتاری داوەو وتوویەتی: پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: (ومن يغلل يأت بما غل يوم القيامة) جا من بۆ موصحەفەکەی خۆم وادەکەم، هەرکەسیش لە ئێوە ئەوەی پێ دەکرێت، با وابکات، بۆیە ئیبن مەسعود دەیویست موصحەفەکەی خۆی بهێڵێتەوەو، ئەوەی تیایدا دەیزانی بهێڵێتەوە، کاتێك ئەوەی بۆ نەکرا، ئەوەی وت، کە وتی، بۆیە عوسمان ناچاری کرد موصحەفەکەی لابەرێت و ڕسومەکانی سڕیەوە، بۆیە قیرائەکەی چەسپاو نەمایەوەو، خوای گەورە بەو سڕینەوەیە،عوسمان و حەقی سەرخست). [1]

## ئەبو ذەری دوورخستەوە بۆ ناوچەی رەبزە:

یەکێك لەو مەسەلانەی، کە کراوە بە ڕەخنە لەسەر عوسمانی کوڕی عەففان و، تانەدان لە خیلافەتەکەی: مەسەلەی چوونی ئەبوذەر بوو بۆ ناوچەی (رەبزە)، چونکە ئەو تۆمەتەی ئاڕاستە کراوە، کە ئەو، بە زۆر و بە فەرمان، ئەبوذەری دوورخستۆتەوە بۆ ناوچەی (رەبزە)، سەبارەت بەم مەسەلەش وردەکارییەکی پێویست دەخەینە ڕوو:

ئیبنولعەرەبی لە کتێبەکەیدا : (العواصم من القواصم) سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێت:

سەبارەت بەوەی گوایە: ئەبوذەری دوورخستبێتەوە بۆ ناوچەی (رەبزە)، ئەوە ڕاست نییەو وای نەکردووە.

ئەبوذەر، کابرایەکی دنیانەویست و زاهید بوو، سەرکۆنەی کاربەدەستەکانی عوسمانی دەکرد و، ئەم ئایەتەی بەسەریاندا دەخوێندەوە: (والذين يكنزون الذهب و الفضة و لا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم).

---

(١) العواصم من القواصم لابن العربي.

ئەبوذەر، پێی وابوو: ئەوان لە سواریی و جلوبەرگدا، زێدەڕۆیی دەکەن، بۆیە لەسەر ئەوە، ناڕەزایی بەرامبەریان دەردەبڕی و سەرکۆنەی دەکردن، دەیویست، چی لەو ماڵ و سامانەی بەردەستیان هەیە، دابەش بکرێت، ئەوەش شتێکی پێویست نەبوو.

ئیبن عومەر و هاوەڵانێکی تریش دەیانوت: هەرچیەك زەکاتەکەی بدەیت، ئیتر بریتی نییە لە کۆکردنەوەی - زێڕ و زیو -، ئەوەبوو لە شام، دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبوذەر و موعاویەدا ڕوویدا، ئیتر ئەبوذەر هات بۆ مەدینە، خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەویش هەمان ڕێی خۆی دەگرتەبەر -دنیانەویستی و ویستی ئەوەی هەموان بەوجۆرە بن- .

عوسمان پێی وت: خۆزگە کەنارت بگرتایە، مەبەستی ئەوەبوو، تۆ لەسەر ڕێبازێکیت، کە بۆ تێکەڵی خەڵك نابێت، چونکە تێکەڵی مەرجی خۆی هەیە، کەنارگرتنیش مەرجی خۆی هەیە، هەرکەسیش بیەوێت وەك ئەبوذەر بژی، دەبێت بە تەنها بژی، یان تێکەڵی خەڵك بکات، بەڵام وازبهێنێت خەڵکی لەو بارەدا بژین، کە لە شەریعەتدا حەڕام نەکراوە.

ئەوەبوو بۆ پشتگوێخستنی دنیا، ئەبوذەر بە سەربەرزی چوو بەرەو ناوچەی (ڕەبزە)، حاڵی ئەبوذەر باشتر بوو، بەڵام ئەو حاڵە بۆ هەموو خەڵك نابێت، چونکە ئەگەر لەسەر ئەو ڕێبازە بچوونایە، بەدڵنیاییەوە لەناودەچوون، سوپاس و ستایش بۆ خوا، کە هەموو حاڵەکانی ڕێکخستووە.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە! ڕەخنە لە عوسمان دەگیرێت لەسەر کارێك، کە عومەر - پێشتر - کردبووی، دەگێڕدرێتەوە، کە عومەری کوڕی خەططاب، ماوەی یەك ساڵ، ئیبن مەسعودو چەند هاوەڵێکی تری لە مەدینە بەند کرد، تا ئەو کاتەی شەهید بوو، ئەوکات عوسمان ئازادی کردن، عومەر لەبەرئەوە بەندی کردن چونکە ئەوانە فەرموودەی زۆریان لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕایەوە.

دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبوذەرو موعاویەدا ڕوویدا، ئاخۆ ئەبوذەر برێ قسەی دەکرد، کە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططاب دا ئەوانەی نەدەوت، بۆیە

موعاویە ئەم مەسەلەی باس کرد بۆ عوسمان و، ترسا ئاشوبێك لەنێو خەڵکیدا دروست بێت، چونکە ئەبوذەر هانیان دەدات بۆ دنیانەویستی و بڕێ حاڵ، کە هەموو خەڵکی بەرگەی ناگرن، بەڵکو بە تایبەت بۆ هەندێ کەس دەبێت و کەمینەیەك دەتوانن بەرگەی بگرن.

بۆیە وەك پێشتر باسمان کرد: عوسمان نامەی بۆ نووسی، تا ئەبوذەر بێت بۆ مەدینە، کاتێك هاتە مەدینە، خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە، ئەبوذەر بە عوسمانی وت: بەنیازم بچم بۆ ناوچەی (رەبزە)، عوسمانیش وتی: وابکە، ئەبوذەریش وایکرد، تەنها ئەو هەنگاوەش بۆ ئەو گونجاو بوو.[١]

ئیبنو تەیمییەش پێی وایە: چوونی ئەبوذەر بۆ (رەبزە)، لەبەر نەگونجانی ئەو ئیجتیهادەی بوو، کە کردبووی، لەو بارەوە دەڵێت:

ئەبوذەر لە (رەبزە) نیشتەجێ بوو و لەوێش مرد، ئەمەش لەبەر هۆکارێك، کە کێشە کەوتە نێوان ئەو و خەڵکەوە، چونکە ئەبوذەر، کەسێکی صالحی دنیانەویست بوو، پەیامیشی وابوو، کە دنیانەویستی واجبە و مرۆڤ چی لێ زیادە، پێویستی خۆی هەڵبگرێت، ئەوە کەنز و سامانێکە، کە لە ڕۆژی دواییدا پێی داخ دەکرێت.

هەروەها پشتی دەبەست بە شتێك، کە لە قورئان و سوننەتدا بەڵگەی لەسەر نییە، ئەو پشتی دەبەست بە فەرمایشتی خوا: (والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله...)، بۆیە چی زیاد لە پێویست بوایە، بە کەنزی دادەنا، بۆ ئەوەش پشتی دەبەست بەوەی لە پێغەمبەری خوای بیستبوو، کە فەرمووبووی: (يا أبا ذر ما أحب أن لي مثل أحد ذهبا يمضي عليه ثالثة وعندي منه دينار إلا دينارا أرصده لدين. واتە: ئەی ئەبوذەر! حەز ناکەم هێندە کێوی ئوحود زێڕم هەبێت و سیانەی بەسەردا تێپەڕ بێت و، دیناری لەو زێڕە لای من مابێت، مەگەر بۆ قەرزم دانابێت)....

---

(١) العوصم من القواصم، تحقيق محب الدين الخطيب و محمود مهدي الأستانبولي، ط٢، دار الجيل(بيروت-١٩٨٧)، ص ٨٥- ٨٨.

کاتێك عبدالرحمن ی کوڕی عەوف مرد و سامانێکی جێهێشت، ئەبوذەر ئەوەی بەو کەنزە دانا، کە لەسەری سزا دەدرێت، عوسمانیش سەبارەت بەو مەسەلە دانوستان و مشتومڕی لەگەڵ ئەبوذەر دەکرد، تا ئەوەی (کەعب) هاتەژوورەوەو هاوڕای عوسمان بوو، ئەبوذەر لێیدا، هەر لەسەر ئەوەش، ئەبوذەر لە شام کێشەی لەگەڵ موعاویە هەبوو، دەستەیەکیش هەبوون هاوڕای ئەبوذەر بوون...

خۆ خوای گەورە لە قورئاندا، میراتی دیاری کردووەو دابەشی کردووە، دەی میراتیش بۆ کەسێك دەبێت، کە دوای خۆی سامانێك جێبهێڵێت، چەندین هاوەڵ لە پشتیوانان و بگرە لە کۆچەرانیش هەبون، کە لەسەردەمی پێغەمبەر سامانیان هەبووە، چەندین پێغەمبەریش هەبون، کە سامانیان هەبووە.

ئەبوذەر، دەیویست شتێك لەسەر خەڵك واجب بکات، کە خوا واجبی نەکردبوو لەسەریان، لەسەر شتێك سەرکۆنەیان بکات، کە خوا لەسەر ئەوە سەرکۆنەی نەدەکردن، ئەو لەو ڕایەیدا موجتەهید بوو، وەك هەموو موجتەهیدانی تر، لەسەر گوێڕایەڵییەکەی پاداشت وەردەگرێت...

لە سەردەمی خیلافەتی عوسماندا - ماڵ و سامان زۆر بوو -، دەوڵەمەندان خوویان دایە زۆر بواری دنیا، کە هەیانبوو لە ڕووی ڕێژە و جۆرەوە، دەچوونە مەیدانی مویاحەوە، ئەبوذەریش هێندە نکووڵی دەکرد لێیان، تا ئەوەی ڕێی مویاحیشی لێ دادەخستن، ئەمەش هۆکارێکی کێشەی نێوان دوو تاقمەکە بوو!

بۆیە کەنارگرتنی ئەبوذەر لەبەر ئەو هۆکارە بوو، ئەگەرنا عوسمان، هیچ کێشە و مەرامێکی بەرامبەر بە ئەبوذەر نەبوو، ئەوەش،، کە دەڵێت: ئەبوذەر ڕاستگۆترین کەسە واتای ئەوە نییە لە هەموویان باشتر بێت، بەڵکو کەسێکی باوەڕداری لاواز بوو، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ( يا أباذر إني أراك ضعيفا، وإني أحب لك ما أحب لنفسي، لا تأمرن على إثنين ولا تولين مال يتيم. واتە: ئەی ئەبوذەر! من تۆ بە لاوازی دەبینم، ئەوەشی بۆ خۆم خۆشم دەوێت، بۆ تۆیش حەزم پێیە، دەی بەرپرسیارێتی

دوو کەسیش مەگرە ئەستۆ و، ماڵ و سامانی هەتیویش مەگرە ئەستۆ)، یان لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف و في كل الخير).

ئەهلی شوراِیش باوەڕدارانی بەهێز بوون، ئەبوذەرو هاوڕێنەکانیشی باوەڕدارانی لاواز بوون، باوەڕدارانی چاکی نێو خیلافەت، وەك: عوسمان و عەلی و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف، باشتر بوون لە ئەبوذەر و هاوڕێنەکانی.[١]

(عەسکەری) دەڵێت: ئەبوذەر خۆی لەبەر زوهد و دوورگرتنی لەو سامانەی لە دەستی خەڵکدایە، چوون بۆ ناوچەی (رەبزەی) هەڵبژارد.[٢]

ئیبن خەلدون دەڵێت: ئەبوذەر، داوای مۆڵەتی لە عوسمان کرد، تا لە مەدینە بچێتە دەرەوە، عوسمانیش مۆڵەتیدا، ئەبوذەریش چوو لە (رەبزە) دابەزی و لەوێ مزگەوتێکی بنیادنا، عوسمانیش وشتری پێدا و دوو خزمەتکاری بۆ دانا و مووچەشی بۆ بڕیەوە.[٣]

هەروەها عوسمان پەیامی نارد بۆ ئەبوذەر و پێی وت: جارجارە سەردانی مەدینە، بکە تا نەریتی دەشتەکی وەرنەگریت، ئەویش وایدەکرد.[٤]

بێگومان ئەبوذەری غیفاری لە ئاشووبخوازەکان نەبوو، بەڵکو موجتەهیدێك بوو کە لە بوارێکی ئیجتیهادەکانیدا نەپێکا، بەڵام ئەوەی کە کێشە بوو ئەوەبوو ئاشووبخوازان ئەو بانگەوازەی ئەبوذەریان قۆستەوە بۆ مەرامی پیسی خۆیان و توانییان بیکەنە چەکێك بۆ دژایەتی خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەففان و دواجار ڕەواکردنی خوێنی، هیچکام لە هاوەڵان و تابعیەکان و زانایانی ئەهلی

---

(١) منهاج السنة النبوية لابن تيمية، تحقيق د.محمد رشاد سالم، ط١، مؤسسة قرطبة، ج٦، ص ١٧٣- ١٧٤.

(٢) الأوائل للعسكري، ج١، ص ٥٥.

(٣) تاريخ ابن خلدون، ط٥، دار القلم (بيروت-١٩٨٤)، ج٢، ص ٥٨٨.

(٤) تأريخ الطبري، ج٢، ص ٦١٦.

سوننەو جەماعەش گومانیان نییە لەوەی ئەبوذەر هیچ پەیوەندی و هاوکاریەکی نەبووە لەگەڵ ئاشووبخوازان، بەڵکو نیازێکی چاکسازی هەبووەو ئیجتیهادێکی کردووەو ئیجتیهادەکەی نەپێکاوەو پشت بەخوا یەك پاداشتی دەست کەوتووە.

## ئەبودەرداش لە شام دەرکرد:

ئیبنولعەرەبی دەڵێت: هەروەها دەمەقاڵەیەك لەنێوان ئەبودەرداو موعاویەدا ڕوویدا، چونکە ئەبودەرداییش کەسێکی زاهید و دنیانەویست بوو، دادوەری خەڵکیش بوو - لە دیمەشق -، کاتێك لە مەسەلەی حەقدا زۆر مەسەلەکەی قووڵ دەکردەوە و، ئەو ڕێبازەی عومەری لەناو خەڵکدا پەیڕەو دەکرا، ئەویش پەیڕەوی دەکرد، خەڵکی بەرگەی ئەوەیان نەگرت و لایان برد، ئەویش چوو بەرەو مەدینە.

ئەوانە هەموو برێ بەرژەوەندین، کە زیان بە ئایینداری ناگەیەنن و کار ناکەنە سەر پێگەی هیچ موسڵمانێك، ئەبوذەر و ئەبودەرداییش، دووربوون لە عەیبەو کەموکورتی، عوسمانیش زۆر دوور و بێگەرد بوو، هەر کەسێکیش بڵێت: عوسمان بەو هۆکارە دوورخستنەوەی بەکارهێناوە، ئەوە هەموو ئەو قسانە پووچ و بێبنەمان).[١]

(حەکەم) ی گێڕایەوە، پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دووری خستبوویەوە:

حەکەمی کوڕی ئەبیلعاصی کوڕی ئومەییەی ئومەویە، مامی عوسمانی کوڕی عەففانە، باوکی مەڕوانی کوڕی حەکەمە، دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوو و، چوو لە مەدینە نیشتەجێ بوو.[٢]

---

(١) العواصم من القواصم لابن العربي.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٥.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (حەکەم)ی دوورخستەوە بۆ ناوچەی طائیف، ئیتر لەوێ مایەوە، ئینجا کە ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە، داوا کرا،کە(حەکەم) بگێڕێتەوە، ئەویش وتی: گرێیەك ناکەمەوە، کە پێغەمبەر گرێی داوە، تا لە سەردەمی خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا، گەڕێنراپەوە بۆ مەدینە.[١]

(حەکەم) لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر لە مەککەدا، ئازاری زۆری پێغەمبەری خوای دەدا،[٢] تەنانەت ئەو شەوەی کۆبوونەوە، تا بچن پێغەمبەر لە ماڵەکەی خۆیدا بکوژن، یەکێك لەوانە (حەکەم) بوو.[٣]

(حەکەم) تەنانەت بەرامبەر بە موسڵمانانیش خراپەی زۆری نواند، ئەوەبوو کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان موسڵمان بوو، (حەکەم)، کە مامی بوو، عوسمانی گرت و بە گوریس بەستیەوەو وتی: سوێند بەخوا، تا نەگەڕێیتەوە سەر ئاینی باوباپیرانت، ناتکەمەوە.

عوسمانیش وتی: سوێند بەخوا، هەرگیز وازی لێ ناهێنم!

کاتێك (حەکەم) بینی عوسمان زۆر سوورە لەسەر ئایینەکەی، وازی لێهێناو بەریدا.[٤]

(ئیبن حەجەر) چەند فەرموودەیەکی هێناوە، کە باس لەوە دەکەن، کە پێغەمبەری خوا، نزای خراپەی لە (حەکەم) کردووە، بەڵام صەحیح بوونی هیچکام لەو فەرموودانە، ناسەلمێنێت.

سەبارەت بە هۆکاری دوورخستنەوەکەی دەوترێت: نهێنی پێغەمبەری خوای ئاشکرا کردووەو باسی کردووە، بۆیە دوورخراوەتەوە.[٥]

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٤.

(٢) البداية و النهاية لابن كثير، ج٣، ص ١٣٤.

(٣) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٢٨.

(٤) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٥.

(٥) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٠٨.

(حەکەم) لە سەردەمی خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا وەفاتی کرد، ئەوەش لە ساڵی سی و یەکی کۆچیدا بوو.[1]

هەرچۆنێك بێت نەفی کردنی (حەکەم) و نەگێڕانەوەی، تا وەفاتی و بەردەوامی هەر دوو خەلیفەی دواتریش، لەسەر ئەو بنەمایە، بەڵگەیە لەسەر ئاستی لاساریەك، کە (حەکەم) نواندوویەتی، بەڵام ئەوە نابێتە تۆمەت بۆ خەلیفەی سێیەمی باوەڕداران، چونکە گێڕانەوەیەك هەیە دەڵێت: پێغەمبەر پێش مردنی، لەسەر داوای عوسمان ڕازی بووە،کە (حەکەم) بگەڕێتەوە، بەڵام پێش گەڕانەوەی، وەفاتی کردووە و دواتریش هەردوو خەلیفەی دواتر، بۆ پەیڕەوی ئەو فەرمانە، داوای شاهیدێکیان کردووە لە عوسمان، ئەویش شایەتێکی تری نەبووە.[2]

بۆیە چەند خاڵێك دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** ئەوەی عوسمان چووەو سکاڵای بۆ کردووە لای پێغەمبەر، شتێکی هەڵەو تاوان نەبووە، چونکە هێشتنەوەی خزمایەتی و هەوڵی چاکەکردن لەگەڵ خزمان، شتێکی ڕێپێدراوە لە ئیسلامدا، مادەم نەبێتە زیان بۆ باوەڕداران بە گشتی.

ئەوەش، کە عوسمان چووە داوای لێخۆشبوونی بۆ موسڵمانێکی هەڵەکار کردووە، نەك بۆ بێباوەڕێك،[3] هەروەها تکای بۆ کردووە لای پێغەمبەر، کە پێغەمبەری خوایش ڕازی بووە، نیشانەی ئەو هەموو ڕێز و خۆشەویستیەیە، کە پێغەمبەری خوا بۆ عوسمانی کوڕی عەففان هەیبووە.

**دووەم:** پابەندی بێشوماری هاوەڵانی پێغەمبەر بە گشتی و، خەلیفە ڕاشیدینەکان بە تایبەتی و، ئەبوبەکر و عومەر بە تایبەتی تر، لەم نمونەدا دەردەکەوێت، کە

---

(١) نفس المصدر.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٠٥.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ١٣٤.

چەندە ورد و وریا بون لە هەڵسوکەوت لەگەڵ بنەماکانی شەریعەتدا، کاتێك زانیویانە شەرع داوای شایەت دەکات بۆ هەر سکاڵا و پرسێك، ئامادە نەبون، تەنانەت قسەو سکاڵای موژدەپێدراوی بەهەشتیش وەربگرن، کە عوسمانە، خۆ ئەوان دەیانزانی، کە عوسمان چەندە ڕاستگۆ و دڵسۆز بە ئیسلام بووە، ئەگەر هەرچیەك بچووکترین لادانی دژ بە پێغەمبەری خوای تێدا بوویێت، هەرگیز قبووڵی نەکردووە، عوسمان موژدەپێدراوی بەهەشت و دوو جار زاوای پێغەمبەر بووە، عوسمان هۆکاری بەیعەتی (رچوان) بووە، کەچی هەر فەرمانی شەریعەتیان بۆ شایەتیەکی ئەو، پشتگوێ نەخستووە، جا ئەگەر بۆ مەسەلەیەکی کاتی لاوەکی وا ورد بووبن، دەبێت لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئاندا، چ وریایی و دڵنیاییەکیان گرتبێتەبەر؟

**سێیەم:** گەورەیی عوسمان و، ڕێزگرتنی لە فەرمانی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی ئیسلامی نیشان دەدات، ئەو هەرچەندە خۆی چووبوویە خزمەت پێغەمبەر و ڕەزامەندی پێغەمبەری خوای وەرگرتبوو، بەڵام کاتێك زانی بەڵگەی تەواوی بەدەستەوە نییە بۆ سەلماندنی ڕاستیەکەی، ئامادە بوو ملکەچی فەرمانێك بێت، کە لەپێناو هێشتنەوەی ڕاستییەکاندا، ڕاستییەکی ئەوی پەك دەخست، ئەمەش تەنها لە هاوەڵانی پێغەمبەر دەوەشێتەوە هێندە وریا و کارامە بن.

**چوارەم:** عوسمان هەرگیز ئامادە نەبووە لە فەرمانی پێغەمبەر دەربچێت، خۆ کاتێك ئەبو سوفیان هاتە مەدینەوەو، تکای کرد لە چەند کەسێك و لەوانەش: عوسمان، تا بیبەن بۆ لای پێغەمبەر و سکاڵای بۆ بکەن، تا لەسەر ڕێککەوتنی قورەیش و پێغەمبەر قسەی لەگەڵ بکات، عوسمان ئامادەیی نەبوو سکاڵای بۆ بکات، هەرچەندە لە هەمان هۆز بوون، چونکە دەیزانی ئەمە ڕەوا نییە.

بەڵام سکاڵا کردنی بۆ (حەکەم) لەبەرئەوەی پێ ڕەوابوو، چونکە هەم (حەکەم) شایەتومانی بە زار دەربڕیبوو و خۆی بە موسڵمان ناساندبوو، خواش زاناترە بە موسڵمانێتیەکەی، هەم هاتنەوەی ئەو، هیچ پەیوەندیەکی نەبوو بەزیان گەیاندن بەموسڵمانان، چونکە تاکێك بوو و هیچی تر، هەروەها ئەو، کەزانی

پێغەمبەر ڕازی بووە، ئینجا چوو داوای لە ئەبوبەکر و عومەریش کرد، تا ئەو ڕەزامەندییە جێبەجێ بکەن، کاتێکیش بەڵگەی تەواوی بۆ ئەوە دەست نەکەوت، بێدەنگی هەڵبژارد، نەك نانەوەی ئاژاوەو ناڕەزایی.

سەبارەت بەوەی بۆچی عوسمانی کوڕی عەففان حەکەمی گێڕایەوە؟

ئیبنولعەرەبی لە کتێبەکەیدا: (العواصم من القواصم) دەڵێت:

سەبارەت بە تۆمەتی گێڕانەوەی (حەکەم) ئەمەش ڕاستی نییە، زانایانمان لە وەڵامی ئەو گومانەدا دەڵێن: پێغەمبەر مۆڵەتی دابوو بە (حەکەم)، تا بچێتەوە مەدینە، عوسمان ئەمەی بە ئەبوبەکر و عومەر وت، ئەوانیش وتیان: ئەگەر شاهیدێکت هەیە بۆ ئەوە، ئەوا دەیگێڕینەوە، بۆیە کاتێك خۆی بوو بە خەلیفە ئیشی کرد بەو زانیاریەی هەیبوو - کە پێغەمبەر مۆڵەتی داوە بە حەکەم بچێتەوە مەدینە -، عوسمان ئامادە نەبوو پەیوەندی لەگەڵ کەسێك هەبێت، کە پێغەمبەر پەیوەندی لەگەڵ بپچڕاندبایە، با تەنانەت باوکیشی بوایە، ئەو هەرگیز ئامادە نەبوو حوکمی پێغەمبەر هەڵبوەشێنێتەوە.[١]

## سوننەتی کورتکردنەوەی نوێژی لە سەفەردا لەکارخست:

ئیبنولعەرەبی دەڵێت: سەبارەت بە کورت نەکردنەوەی نوێژەکان لە سەفەردا، ئیجتیهادێکی عوسمان بوو، چونکە بیستبووی خەڵکی، لە مەسەلەی کورتکردنەوەی نوێژەکاندا، تێکەوتون و وایان لێهاتووە، تەنانەت لە ماڵەوەش کورتکردنەوەی نوێژەکان دەکەن، بۆیە گومانی ئەوەی برد: ئەنجامدانی سوننەتێك، ببێتە هۆی لەکارخستنی فەرز، بۆیە لەترسی نەکەوتنە ئەو داوو هەڵەوە، کورتکردنەوەی نوێژەکانی لە سەفەردا تەرك کرد.

---

(١) العواصم من القواصم، ص ٨٩.

هەرچەندە دەستەیەك لە زانایان دەڵێن: کەسی گەشتیار سەربەستە لەوەی، ئایا بە کورتکردنەوە نوێژەکانی بکات، یان بێ کورتکردنەوە نوێژەکانی بکات، هاوەڵانیش لەو بارەوە ڕاجیا بوون.[١]

## موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانی کرد بە والی، کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نییە:

سەبارەت بە موعاویە ئەوا - یەکەم جار - عومەر کردی بە والی و، هەموو ناوچەکانی شامی دایەدەست، دواتریش عوسمان لەو پۆستەیدا هێشتیەوە، بەڵکو با بڵێین: ئەبوبەکر - یەکەمجار - بەرپرسیارێتی پێدا، چونکە زیادی برای موعاویەی کرد بە والی و، زیادیش ئەوی کرد بە جێگرەوەی خۆی، ئەوەبوو عوسمانیش هێشتیەوە،چونکە پەیوەندی هەبوو بەویلایەتی ئەبوبەکرەوە، جا عوسمانیش وەك عومەری کردو هێشتیەوە، دەی بڕواننە ئەو زنجیرەیە چەندە پەیوەست و پتەو بووە، هەرگیز نموونەی وا نابینرێتەوە.[٢]

عبداللەی کوڕی عامری کوڕی کورەیزی کرد بە والی، کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نییە:

عبداللەی کوڕی عامری کوڕی کورەیز، کردی بە بەرپرس - وەك دەوترێت - چونکە پوورەکانی زۆر

ئەویان وەرگرتووە و ملکەچی گێڕانەوەی بون، مێژوونووس و ئەدیبەکانیش لە ئاست خۆیاندا قسەیان کردووە.[٣]

---

(١) العوصم من القواصم.

(٢) العواصم من القواصم.

(٣) العواصم من القواصم.

## وەلیدی کوڕی عوقبەی کرد بە والی، کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نییە:

ئیبنولعەرەبی دەڵێت: (سەبارەت بە دانانی وەلیدی کوڕی عوقبە ئەوا هاودەم بە خراپی نیازەکان - خەڵکی پێش چاکە خراپەیان گرتەبەر، بۆیە درۆسازان کەوتنە باسی ئەوەی عوسمان بۆ نیازی خۆی کردوویەتی بە بەرپرس، عوسمان دەڵێت: من وەلیدم دانەناوە لەبەرئەوەی برام بوویێت، بەڵکو لەبەرئەوە ڕێزدار بوون.[1]

## مەڕوانی کرد بە والی، کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نییە:

ئەو قسەڵۆکانەی سەبارەت بە مەڕوان و وەلید هاتون، زۆر سەختن و ئەوانەی حوکمی فاسق بوونیان داوە لەسەریان، لە فاسقی خۆیانەوە ئەو حوکمەیان بەسەرداداون.

مەڕوان پیاوێکی عەدل بووەو لە گەورە پێشەوایانی لای هاوەڵان و تابعییەکان و فیقهناسانی موسڵمانان بووە، سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی، کە لە هاوەڵان بووە، گێڕانەوەی لێ گێڕاوەتەوە، سەبارەت بە تابیعییەکانیش هاوتەمەنانی خۆی بون...

سەبارەت بە فیقهناسانی ناوچەکانیش، هەموویان بەگەورەیان داناوەو خیلافەتەکەیان بە ڕەوا داناوە و فەتوای داوە، کە کوڕی ئوم حەکیمی بەیچانە،

---

(١) العواصم من القواصم.

ئەو ژنەش پووری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و دوانەش بووە لەگەڵ باوکی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)- واتە: ئوم حەکیم و عبداللەی باوکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)،بە یەك سك لەدایك بون-.

پشت بەخوا، دواتریش ڕوونی دەکەینەوە: دانانی والیش ئیجتیهادە، عومەر، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی لابرد و، کەسی پلەنزمتر لەوی پێش ئەو خست.

بە عوسمان وترا: تۆ (وەلید)ت داناوە، چونکە (وەلید) براتە لە ڕێی دایکتەوە: (ئەروای کچی کورەیزی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حەبیبی کوڕی عەبدشەمس).

ئەویش وتی: بەڵکو بۆیە کردوومە بە والی، چونکە پوورزای پێغەمبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم)،(ئوم حەکیم ) پووری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)بوو و، دایەگەورەی عوسمان و دایەگەورەی وەلید بووە، لەڕووی دایکیانەوە، کە (ئەروا) بووە، (ئوم حەکیم) دوانە بووە لەگەڵ عبداللەی باوکی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، جا چ کێشەیەك هەیە، کەسێك برای خۆی، یان کەسی نزیکی خۆی دابنێت؟![1]

## پێنج یەکی ئەفریقیای دا بە مەڕوان:

سەبارەت بەوەی،کە عوسمان پێنج یەکی ئەفریقیای دابێت بە یەك کەس، ئەوە ڕاست نییە، مالیك و دەستەیەکی تر پێیان وایە: پێشەوا - ئیمام - ڕای خۆی دەبێت لەسەر پێنج یەك و، دواتر بە پێی ئیجتیهادەکەی جێبەجێی دەکات، دەشتوانێت هەمووی ببەخشێت بە یەك کەس.[2]

---

(١) العواصم من القواصم.

(٢) العواصم من القواصم.

## عومەر بە قامچی لێدانی حەددی لێدەدا، کەچی ئەم کردی بە گۆچان:

سەبارەت بەوەی دەڵێن: عوسمان بە گۆچان لە خەڵکی دابێت، لە هیچ یاخی و گوزڕایەڵێك ئەوەم نەبیستووە، بەڵکو گێڕانەوەیەکی پووچ و بێبنەمایەو، هەواڵێکە بازاڕگەرمی بۆ کراوە، پەنابەخوا لە هەر خراپەیەك![1]

## چۆتە سەر پلیکانەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لە کاتێکدا ئەبوبەکر و عومەر لەو پلیکانە خوارتر دەوەستان - بۆ وتاردان -:

سەبارەت بەوەی دەوترێت: عوسمانی کوڕی عەففان چۆتە شوێن مینبەرەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەوا ئەمەم لە هیچ کەس نەبیستووە، کە توقیەی هەبێت، بەڵکو بانگەشەیەکی ناڕەوایە بۆ باس و گێڕانەوە، ئیتر ئەوەی دڵی پێی دەگۆڕێت دڵی دەگۆڕێت.

زانایانمان دەڵێن: ئەگەریش ئەوە ڕاست بێت - وای کردبێت - ئەوە هیچ شتێکی تێدا نییە، کە خوێن ڕشتنی حەڵاڵ بکات، یان لەوانەشە ئەو کارەی حەق بووبێت، هاوەڵانیش لەسەر ئەوە گلەیی و ناڕەزاییان نەبووبێت.

واتە: سەرەتا، یان لەبەر هۆکاری پێویست ئەوەیان بە ڕەوا زانیبێت، ئەگەریش نەبووبێت - واتە: شتی وای نەکردبێت - ئەوە ئیتر مشتومڕێکی لەسەر نامێنێت.[2]

---

(١) العواصم من القواصم.

(٢) العواصم من القواصم.

**ئامادەی غەزای بەدر نەبووبوو، لە ڕۆژی ئوحودیش شکستی خوارد، لە بەیعەتی ریزوانیشدا ئامادە نەبوو:**

جارێك ئیبن عومەر لەگەڵ خەڵكێكی قورەیشیدا دانیشتبوو، کابرایەکی میصری هات بۆ لای، وتی: ئەی ئیبن عومەر پرسیارێکت لێدەکەم وەڵامم بدەرەوە، ئایا دەزانیت عوسمان لە ڕۆژی ئوحوددا رایکرد؟

وتی: بەڵێ.

وتی: دەزانیت لە بەدردا ئامادە نەبو؟

وتی: بەڵێ.

وتی: دەزانیت لە بەیعەتی ریضواندا ئامادە نەبوو؟

وتی: بەڵێ.

کابرا وتی: الله اکبر.

ئیبن عومەر وتی: وەرە با بۆت روون بکەمەوە، راکردنی ئوحودی من شایەتی دەدەم، کە خوا لێی خۆش بوو، بۆ ئامادە نەبوونی بەدریش لەبەرئەوە بوو، کە کچەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاوسەری بوو و نەخۆش بوو، بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو تۆ پاداشت و پشکی یەکێك لە ئامادەبوانی بەدرت هەیە، بۆ ئامادەنەبوونیشی لە بەیعەتی ریضوان، ئەوە ئەگەر لەناو مەککەدا بڵندپایەتر لە عوسمان هەبوایە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوی لەبری عوسمان دەنارد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)عوسمانی نارد و بەیعەتەکە دوای ئەوە بوو، کە عوسمان چوو بۆ مەککە، لە کاتی بەیعەتەکەدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی ڕاستی نیشان دا و فەرمووی ئەوە دەستی عوسمانە، دەستی ڕاستی دا بەسەر دەستەکەی تریدا و فەرمووی (ئەوە بۆ عوسمان)، ئینجا ئیبن عومەر بە کابرای وت دەی ئێستا برۆ.[1]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٥١٦، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٢٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٩٢.

## عبیداللەی کوڕی عومەری لە هورمزان نەکوشت - ئەو کەسەی کە چەقۆکەی دا بە ئەبولوئلوئەو دژ بە عومەر هانیدا، تا عومەری کوشت - :

سەبارەت بە ئامادەنەبوونی عوسمان، بۆ کوشتنی عبیداللەی کوڕی عومەری کوڕی خەططاب لە هورمزان، ئەوە ناڕاست و پووچە، چونکە ئەگەر ئەو ئەوەی نەکرد، خۆ هاوەڵانی تر لەویٛ ئامادە بوون، مەسەلەکەش لەسەرەتادا بوو.

دەوترێت: هورمزان هەوڵیداوە بۆ کوشتنی عومەر و، خەنجەری هەڵگرتووەو لەژێر جلەکانییەوە دەرکەوتووە...لەوانەشە عوسمان حەقێکی بەسەر عبیداللەوە بەدی نەکردبێت، چونکە بارو کاری هورمزانی بۆ دەرکەوت، هەروەها کەس داوا ئەوەی نەدەکرد، لەگەڵ هەموو ئەو ئەگەرانەشدا، چۆن دروستە بڕوانێتە مەسەلەیەك، کە دروست و صەحیح نییە؟[1]

## لەسەر وشترەکەی لەگەڵ کۆیلەکەیدا نامەیەکی بۆ ئیبن ئەبی سەرح نووسی، سەبارەت بە کوشتنی ئەو کەسانەی لە نامەکەدا باسی کردبوون :

ئیبنولعەرەبی دەڵێت: سەبارەت بەوەی دەڵێن: نامەکە لەگەڵ سوارێکدا گیراوە - یان لەگەڵ کۆیلەکەی گیراوە- هیچ کەسیش ناڵێت: کۆیلەکەی بووە! گوایە: نامەی بردووە بۆ عبداللەی کوڕی ئەبوسەرح و تیایدا فەرمانی پێکردووە: هەڵگرانی نامەکە بکوژێت!

---

(١) العواصم من القواصم.

- بەڵام لە ڕاستیدا - عوسمان بە خەڵکەکەی وت: یان دەبنە شایەتی ئەو شتە - کە من وام وتبێت -، یان سوێند دەخۆم من ئەوەم نەنووسیوە و فەرمانم بەشتی وا نەکردووە، جار هەیە بە ناوی کەسێکەوە قسە دەنووسرێت و، ساختەی دەستنووسی دەکرێت و مۆرەکەشی ساختەی لەسەر دەکرێت.

بەڵام ئەوان وتیان: دەبێت تۆ (مەڕوان) بدەیتە دەست ئێمە.

ئەویش وتی: شتی وا ناکەم.

ئەگەر مەڕوانی بدابا بەدەستەوە، ئەوە ستەمکار دەبوو، ئەو خەڵکە دەبوو لای عوسمان داوای حەقی خۆیان لە مەڕوان و، هەر کەسێکی تریش بکەن، ئەگەر بچەسپایە،کە عوسمان شتی وای کردووە، ئینجا حەق بۆ خاوەن حەق دەبێت، بەڵام پێشینەو گەورەیی و پلەوپایەی ئەو، هی ئەوە نەبوو لە دەسەڵاتەکەی لاببرێت، چ جای کوشتنی.[١]

## لێدانی عەممار لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا

لە ساڵی سی و پێنجی کۆچیدا، میصر شڵەژانێکی بەخۆوە دی، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق و موحەممەدی کوڕی ئەبوحوذەیفەو، ژمارەیەکی تر لە نەیارانی عوسمان، نزیکەی شەش سەد سواریان لە میصرەوە ئامادە کرد و، بەرەو مەدینە بەڕێکەوتن و بوون بە چوار بەشەوە، بەسەرکردایەتی: (عەمری کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی و عبدالرحمنی بەلوی و کینانەی کوڕی بیشر و سودانی کوڕی حمران)،کە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکریش لەگەڵیاندا هات.

بەڵام موحەممەدی کوڕی ئەبوحوذەیفە لە میصر مایەوە، تا خەڵکی تر هان بدات و بەرگری لەوانە بکات، کە ڕۆیشتوون، والی میصریش نامەیەکی بۆ

---

(١) العواصم من القواصم.

خەلیفە نووسی و، لەو ڕووداوە ئاگاداری کردەوە و، نووسی: (وەك عومرەکار دێن و وا خۆیان نیشان دەدەن).

کە لە مەدینە نزیك بوونەوە، خەلیفە فەرمانی بەعەلی کوڕی ئەبوتاڵیب کرد، تا پێشهاتنیان بۆ مەدینە، بیانگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆیان، (عەلی)ش داوای لە عەممماری کوڕی یاسر کرد هاودەمی بکات، بەڵام عەممار ڕازی نەبوو، چونکە ئەویش لە عوسمان تووڕە بوو، لەبەرئەوەی پێشتر عوسمانی کوڕی عەففان سزای دابوو، ئەوەبوو عەلی خۆی چوو بۆ لایان.[1]

(ئیبن کەثیر) دەقێکی هێناوە دەڵێت: بەهۆی قسە وتنی بە عەبباسی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبولەهەب، لەلایەن خەلیفەوە، هەم عەممار و هەم عەبباس تەمبێ کران، عەممار ئەوەی لەدڵ گرت و کەوتە هاندانی خەڵك لە دژی عوسمان، هەرچەندە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لەو کارەی ڕێگری لێکرد، بەڵام ئەو وازی نەهێنا.[2]

(ذەهەبی)ش دەقێکی هێناوە، کە تووڕەیی عەممماری نیشانداوە بەرامبەر بەعوسمان.[3]

بەڵام ئەو دەقانە هیچیان صەحیح نین، هاوکاتیش لەگەڵ واقیعی ئەو کاتە ناگونجێن، چونکە سیفەتی عوسمان نەبووە،کە توندیی و زبریی بەرامبەر نەیارەکانیشی بەکاربهێنێت، نەك بەرامبەر بە عەممماری کوڕی یاسر و سزای بدات!

عوسمانێك، کە ناسرابوو بەوپەڕی نەرمیی و شەرم، چۆن لەسەر قسە وتنێکی نێوان دوو کەس، سزای لێدان بەکاردەهێنێت بۆ هەردووکیان؟! هەروەها سەنەدی ئەو گێڕانەوانەش لەو بارەوە هاتون هیچیان صەحیح نین!

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٧٥.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٧١.

(٣) تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٣٤.

لە دەقێکی تردا ذەهەبی دەڵێت: عەممار لە هەندێ مەسەلەدا ڕەخنەی لە عوسمان دەگرت کە ئەگەر وازی لەو کارەی بهێنایە باشتر بوو، ڕەزای خوا لە هەردووکیان.[1]

ئیبنولعەرەبی دەڵێت: سەبارەت بە لێدانی ئیبن مەسعود و مووچەپێنەدانی، ئەوە درۆو ساختەیە، سەبارەت بە لێدانی عەمماریش، هەروەك ئەوی پێشوو درۆ و ساختەیە، ئەگەر ناوسکی بتەقیایە، هەرگیز نەدەژیا.

زانایان لەو بارەیەوە برێ پۆزشیان هێناوەتەوە، کە هی ئەوە نییە باسیان بکەین، چونکە خودی باسەکە لەسەر پووچیی و نادروستیی دامەزراوە، ئیتر هیچ حەقێك لەسەر پووچی بنیادنانرێت، بە شوێن پێی نەفاماندا ڕێ نابڕین، چونکە ڕێی ئەوان کۆتایی نییە.[2]

عوسمانێك، کاتێك خەواریج و ئاشووبگێڕان هاتبوون بیکوژن، ئامادە نەبوو بهێڵێ هاوەڵان بەرگری لێ بکەن، ڕشتنی خوێنی خۆی پێ ڕەواتر بوو لە ئازاری هاوەڵان،ئەو هیچ ناکات بنەوێتە ئازاردانی کەسێك، کە چەندین فەرموودەی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم)لەسەرە، خودی عوسمان لە بارەی فەزڵی عەممارەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

عوسمانی کوڕی عەففان دەڵێت: سەبارەت بە عەممار، با فەرموودەیەکتان بۆ بگێڕمەوە: ڕۆژێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دەستی گرتبووم و بە ڕێدا دەڕۆیشتین، گەیشتینە لای عەممار و دایك و باوکی، کە سزا دەدران.

باوکی عەممار وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ڕۆژگار ئاوایە؟

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)پێی فەرموو: (خۆڕاگر بە)، پاشان فەرمووی: (خوایە! لە بنەماڵەی یاسر خۆش بە).[3]

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٤١٦.

(٢) العواصم من القواصم.

(٣) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٤٢٧، ضعفه أحمد شاكر، كما ضعفه شعيب الأرناؤوط.

## پشکی هاوەڵان
## لە خوێنی ئیمامی عوسماندا

بەهۆی ئەو ڕووداوی شەهیدبوونەی عوسمانی کوڕی عەففانەوە، گومانێك لەسەر هاوەڵان درووست بووە، کە دەبێت لە ئاست کوشتنی عوسمانی کوڕی عەففاندا کەمتەرخەم بووبن؟!

ئەگەرنا، چۆن برێك غەوارەو بێگانە، دەتوانن بێنە ناو شاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و خەلیفەی موسڵمانان بکوژن، بێتەوەیئەو هەموو هاوەڵە بتوانن بەریان پێ بگرن؟!

**ڕاستی ئەم مەسەلە، بۆ سێ هۆکاری سەرەکیی دەگەڕێتەوە:**

**یەکەم:** هەندێ لە کێشەکە لەوەوە بوو، کە ئاشووبگێڕان، ناوبانگ و کەسێتی هاوەڵانیان دەقۆستەوە، لەوانە: یان ئیجتیهادەکانیان بۆ خۆیان دەقۆستنەوە، وەك ئەوەی لە ئیجتیهادەکەی (ئەبوزەر)دا باسمان کرد، یان نامەی ساختەیان بەدەم عائیشەی دایکی باوەڕداران و عەلی و زوبەیر و طەلحەوە دەنووسی!

مەسروق دەڵێت: بە خاتوعائیشەم وت: سەیری ئەو کارەت بکە! نامەت بۆ خەڵك نووسی و داوات لێکردن، تا دژ بەعوسمان ڕاپەڕن.

خاتوعائیشەش وتی: سوێند بەوەی باوەڕداران بڕوایان پێ هێناوە، بێباوەڕان بڕوایان پێ نەهێناوە، من ڕەشییەکم لەسەر پەڕەی سپی بۆ نەنووسیون - واتە:

من هیچم بۆ نەنووسیون- ئەعمەش دەڵێت: ئەو خەڵکە وایان دەزانی ئەو نامەیە لەسەر زاری خاتوعائیشەوە نووسراوە.[1]

یان جار هەبوو، هەڵوێستی تووڕەیی هاوەڵێك دەبوو بە چەکێك بەدەست ئاشووبگێڕانەوە، هەرچەندە هاوەڵەکە هیچ نیازی شکاندنی خەلیفە عوسمانی نەبوایە.

بۆ نموونە: جارێك زوبەیری کوڕی عەووام چووە بازاڕ و تەماشای کرد: هەندێ مەوالی ئومەویەکان قۆرخکاریی دەکەن، ئەویش کەوتە لێدانیان، لەو بارەدا بوو، کە خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان هات و لەسەر هێسترێك بوو، زوبەیریش چوو بۆ لای و جڵەوی هێسترەکەی گرت و، کەوتە تانەدان و تووڕە بوون لە عوسمان، زۆر بە توندی دواندی، خەلیفەش هیچی نەوت، ئینجا زوبەیر وازی هێنا، کە عوسمان دابەزی، جێی بۆ ڕاخرا و دانیشت، ئینجا زوبەیر هاتەوە بۆ لای و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران! سوێند بەخوا دەزانم تۆ مافت بەسەرمەوە هەیە، بەڵام من، کە ناحەقییەکم دەبینم خۆم پێ ڕاناگیرێت.

خەلیفە پێی وت: وەرە دابنیشە، لەپاڵ خۆیدا لەسەر ڕاخەرەکە داینیشاند،[2] یان تووڕەییەکەی عەمماری کوڕی یاسر و تووڕەییەکەی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب پاش قسە زبرەکانی مەڕوان.

**دووەم:** عوسمانی کوڕی عەففان ڕێگریی دەکرد لەو هاوەڵانەش، کە دەهاتن بۆ بەرگری لێکردنی و تکای لێدەکردن،کە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، وەك چۆن پێشتر چەندین نموونەمان لەو بارەوە باسکرد، لەوانە: عبداللەی کوڕی زوبەیر بە عوسمانی وت: ئێمە لە ماڵەوە دەستەیەکی چاولەسەر دەبین و لەگەڵت دەبین، خواش بە کەمتر لەوان سەرخستن دەبەخشێت، دەی مۆڵەتمان بدە! - با بەرگریت لێبکەین - بەڵام عوسمان وتی: داوام لە خوایە، هیچ کەس لەبەر من خوێنی نەڕژێت![3]

---

(١) العواصم من القواصم.

(٢) المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٣٣٤٢،

(٣) العوصم من القواصم.

کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان لە ماڵەکەی خۆیدا گەمارۆ درابوو، زەید چوو بۆ لای.

عوسمان پێی وت: تۆ لە دەرەوەی ئەم ماڵە بیت باشە، کەسی لەتۆ سوودبەخشتر لێرە لەلامە، بۆیە لە دەرەوە خەڵکم لێ دووربخەرەوە!

ئەویش چووە ناو خەڵکەکەو قسەی بۆیان دەکرد، تا ئەوەی ژمارەیەك لە پشتیوانان، کە هاتبوون بۆ گەمارۆدانەکە گەڕانەوە.

زەید بەپشتیوانانی دەوت: ئێوە دووجار ببنە پشتیوانی خواو، عوسمان سەربخەن، خوێنی ئەو زۆر حەرامە بۆ ڕشتن.(١)

کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان شەهید کرا، زوبەیر یەکێك بوو لەوانەی، داوای تۆڵەی خوێنی عوسمانی دەکرد، جا لێیان دەپرسی: ئەی زوبەیر! بۆچی هاتون وازتان هێنا، تا خەلیفە کوژرا و، ئێستا هاتون داوای خوێنەکەی دەکەن؟

ئەویش وتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانیشدا ئەم ئایەتەمان دەخوێندەوە: (واتقوا فتنة لا تصيبن الذين ظلموا منكم خاصة)، بەڵام وامان نەدەزانی ئێمەش دەگرێتەوە، تا ئەوەی لە ئێمەشدا ڕوویدا! (٢)

ئیبنولعەرەبی دەڵێت: عوسمان داوای یارمەتی و پاڵپشتی بکردایە، ئەوا هەرگیز هەزار، یان چوار هەزار غەوارەو بێگانە زاڵ نەدەبوون بەسەر بیست هەزار کەسی ناو شارەکە، یان زیاتر لەو ژمارەشدا، بەڵام ئەو، خۆی موصیبەتەکەی بۆ خۆی هێشتەوە.(٣)

**سێیەم:** لە پێشبینی هاوەڵاندا نەبوو، بارەکە بگاتە کوشتنی عوسمانی کوڕی عەففان، بەڵام، کە بارەکە گەیشتە ئەوە، ئینجا هاوەڵان هەستیان بە کەمتەرخەمییان

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٣٥.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٣٦٣، قال شعيب الأرناؤوط إسناده جيد.

(٣) العواصم من القواصم.

کرد، لەبەمەترسی گرتنی ئەو بارەوە، هەندێ لۆمەی خۆیان دەکرد، هەندێ لۆمەی ئەوانی تریان دەکرد، کە بۆچی کەمتەرخەم بون؟ هەندێکیش بڕیاری تۆڵەسەندنەوەیان دا.

طەلحە لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان و، لەکاتی سەرهەڵدانی فیتنەی نەیارانی عوسماندا، بە وتەی خۆی، ڕۆڵی پێویست و باشی نەگێڕا، بەجۆرێك کاتێك عوسمان شەهید کرا، ئینجا راچڵەکی و زۆر خەم وپەژارەی بۆ خوارد و، وتی: تەنها ڕژانی خوێنم قەرەبووی ئەو هەڵوێستەم دەکاتەوە.(١)

جا ئەم بابەتە، مشتومڕێکی زۆری لێکەوتۆتەوە، هەندێ پێیان وایە: طەلحە کەمتەرخەم بووە لەئاست عوسماندا، هەندێکی تر پێیان وابووە: طەلحە هاندەر بووە دژ بە عوسمان، هەندێکیش دەڵێن: طەلحە یەکێك بووە لە بکوژانی عوسمان!

(ئیبن ئەثیر) دەڵێت: طەلحە زۆر توند بوو بەرامبەر بە عوسمان.(٢)

(ذهەبی) دەڵێت: هەڵوێستی طەلحە بەرامبەر بە عوسمان، خۆ لێبێناگاکردن و هاندانی خەڵك بوو لە ڕوویدا و، ئەوەی بە ئیجتیهادێك کرد، دواتر کە لەناوچوونی عوسمانی بینی، ڕای گۆڕا و پەشیمان بوویەوە، کە بۆچی پشتیوانی عوسمانی نەکردووە؟! (٣)

(ئبن کەثیر) دەڵێت: لە سەردەمی فیتنەی نەیارانی عوسماندا، طەلحە کەناری گرت لێی، هەندێ کەسیش دەیانوت: یەکێك بووە لەوانەی هێرشیان بردوەتە سەری!(٤)

کاتێك خەڵکێك هاتن بۆ مەدینەو سکاڵایان بوو لە کاربەدەستانی عوسمان، طەلحە چوو بۆ لای عوسمان و زۆر بە توندی قسەی لەگەڵ کرد، واتە:

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٤.

(٢) أسد الغابة، ج٣، ص ٨٥.

(٣) سير أعلام النبلاء،ج١، ص ٣٥.

(٤) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٤٨.

هاندەرەکان خەڵکێك بوون، کە وایان نیشان دەدا دەسەڵاتەکەی عوسمان ستەمی تێدایە.[(١)]

چەندین گێڕانەوەی تر بە سەنەدی لاواز(چعیف) هاتون، کە باس لەوە دەکەن: طەلحە هاندەر بووە دژ بە عوسمانی کوڕی عەففان، بەڵام بە کۆی گشتی گێڕانەوەکان دەردەکەوێت، کە طەلحە کەمتەرخەم بووە لە هەڵوێست نواندن بەرامبەر نەیارانی عوسمان و، هیچ بەرهەڵستیەکی نەبووە بەرامبەریان.

ئەوەی لەهەڵوێستی طەلحەدا بەرچاو دەکەوێت، ئەوەبووە: جۆرێك لە کەنارگرتنی بەکارهێناوە لە مەسەلەکەدا، پێدەچێت کاریگەر بوبێت بەو هەموو نامە ساختەی، کە ئاشووبگێڕان کردیان، بەڵام دواتر، کە بینی بارەکە گەیشتە شەهیدبوونی عوسمان، ئینجا زانی کەنارگرتنەکەی، چ زیانێکی هەبوو؟

بۆیە بڕیاریدا تۆڵەی خوێنی بکاتەوە، تا ئیدی نەبێتە دیاردەو، کەی بڕێك ئاشووبگێڕ ویستیان، بێن خەلیفەی موسڵمانان بکوژن.

جەبەلەی کوڕی عەمریش یەکێك بوو لەو هاوەڵانەی، کە کەوتەداوی ئاشوبخوازانەوەو، بەرامبەر عوسمانی کوڕی عەففان ناڕەزایی دەردەبڕی، ئەوەبوو جارێك، عوسمان ئەو کۆمەڵەی دەدواند، کە ناڕەزاییان دەردەبڕی، وتی: چیتان دەوێت؟

وتیان: یان دەتکوژین، یان لاتدەبەین!

ئەویش وتی: ئەی بۆچی خەڵکێ نەنێرین بۆ ئاسۆکان، تا لە هەر ناوچەیەك دەستەیەك لە چاکترینیان بێن و دادوەری نێوان من و ئێوە بکەن؟

ئەگەر مافێکم لێ زەوت کردون، با بتاندەمەوە، پاشان وتی: ئایا جەبەلەی کوڕی عەمری ساعیدیتان تێدایە؟

---

(١) الثقات لابن حبان، ج٢، ص ٢٥٦.

جەبەلە وتی: بەڵێ.

عوسمان وتی: داوای چ مافێك لە من دەكەیت ؟

ئەویش وتی: تۆ چل قامچیت لێداوم.

عوسمان وتی: ئەرێ، مەگەر نەهاتم بۆ ماڵەوە بۆ لات، تا مافت بدەمەوە، كەچی ڕازی نەبوویت؟!! ئەویش وتی: با.

عوسمان وتی: ئێستا تۆ لەوە زیاترت لە من دەوێت، داوای خوێنم دەكەیت؟[1]

هەروەها دواتریش بۆ ئەسپەردەكردنی تەرمی عوسمانی كوڕی عەففان، ڕێگریی دەكرد لەوەی،كە تەرمی لە گۆڕستانی( بەقیع ) ئەسپەردە بكرێت.[2]

كاتێك خەلیفە عوسمانی كوڕی عەففان كۆتا وتاری دەدا، جەهجاهی كوڕی سەعید، هەستا و دارەكەی دەستی لەدەست سەندو، بە ئەژنۆی دارەكەی شكاند، خەڵكی هاواریان لێكرد و، عوسمانیش لە مینبەر دابەزیە خوارەوە و چوویەوە ماڵەوە، دواتر شەهید كرا، ئەوەبوو ئەژنۆی جەهجاهی غیفاری تووشی نەخۆشی بوو، ساڵێك بەسەر شەهیدبوونی عوسماندا تێپەڕ نەبوو، كە جەهجاهی غیفاری بەو نەخۆشیەوە مرد.[3]

(ئیبن كەثیر) دەقێكی هێناوە، دەڵێت: بەهۆی قسەوتنی بەعەبباسی كوڕی عوتبەی كوڕی ئەبولەهەب لەلایەن خەلیفەوە، هەم عەممار و هەم عەبباس تەمبێ كران، عەممار ئەوەی لەدڵ گرت و كەوتە هاندانی خەڵك لە دژی عوسمان، هەرچەندە سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص ڕێگری لەو كارەی لێكرد، بەڵام ئەو وازی نەهێنا.[4]

---

(١) تاريخ المدينة، رقم الحديث، ١٩٣٦.

(٢) تاريخ المدينة، رقم الحديث، ٣٢٢.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥١٩.

(٤) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٧١.

(ذەهەبی)ش دەقێکی هێناوە، کە توورِەیی عەمماری نیشانداوە بەرامبەر بەعوسمان،[1] بەڵام ئەو دەقانە هیچیان صەحیح نین و هاوکاتیش لەگەڵ واقیعی ئەو کاتە ناگونجێن، چونکە سیفەتی عوسمان نەبووە توندیی و زبریی بەرامبەر نەیارەکانیشی بەکاربهێنێت، نەك بەرامبەر بە عەمماری کورِی یاسر و سزای بدات، عوسمان کە ناسرابوو بەوپەڕی نەرمی و شەرم، چۆن لەسەر قسەوتنێکی نێوان دوو کەس، سزای لێدان بەکاردەهێنێت بۆ هەردووکیان؟ هەروەها سەنەدی ئەو گێڕانەوانەش لەو بارەوە هاتون، هیچیان صەحیح نین.

---

(١) تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٤٣٤.

## ناکۆکی نێوان
## عەلی و عوسمان (ڕەزای خوایان لێبێت)

عومەری کوڕی خەططاب، پاش ئەوەی پێکرا، شەش کەسی ڕاسپارد، تا لەنێو خۆیاندا کەسێك بۆ خیلافەت دیاری بکەن، ئەوانیش بریتی بوون لە: (عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، عوسمانی کوڕی عەففان، طەلحەی کوڕی عبیداللە، زوبەیری کوڕی عەووام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، عبدالرحمنی کوڕی عەوف).[1]

عومەری کوڕی خەططاب ئەگەری دانا، بۆ درووستبونی ڕاجیایی لەسەر دیاریکردنی کەسێك و چارەسەری بۆ داناو وتی: ئەگەر سێ کەس سێ کەس کەوتن (واتە: بوون بە دوو بەشەوە)، ئەوە عبداللەی کوڕی عومەر بکەن بەدادوەری نێوانیان، ئەگەریش بە دادوەری ئەو ڕازی نەبوون، ئەوە لەگەڵ ئەو دەستەیە بن، کە عبدالرحمنی کوڕی عەوفی تێدایە.[2]

ئەوەبوو دواجار سیانیان بۆ ئەوانی تر وازیان لە مافەکەیان هێنا، مانەوە سەر عبدالرحمن و عەلی و عوسمان، عبدالرحمن وتی: منیش لەپێناو خوادا واز لە مافەکەم دێنم، ئێوەش یەکێکتان وازبهێنن، تا بەیعەت بدەین بەوی تر.

دواجار ئەهلی شوورا بڕیاری کۆتاییان دایە دەست عبدالرحمن، ئەویش کەوتە وەرگرتنی ڕای خەڵکی و، تەنانەت ڕای ژن و منداڵیشی وەرگرت، ڕای سوارەو پیادەکانیشی وەرگرت، سێ شەو و ڕۆژ بەردەوام بوو لەو ڕا وەرگرتنەی.

---

(١) المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٤٠٧٤.

(٢) الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٣، ص ٤٦١.

ڕای زۆرینەی هەرەزۆر، لەسەر عوسمانی کوڕی عەففان بوو، دواجار لەبەری بەیاندا مێزەرەکەی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم)کردە سەر و، ناردی بە شوێن ناودارانی ناو کۆچەران و پشتیوانان و خەڵکی تردا، مزگەوت پڕ بوو لە خەڵك، چووە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ماوەیەکی زۆر وەستا، بە دەنگی نزم نزایەکی زۆری کرد، دواتر خەڵکەکەی دواند.

ئینجا عەلی بانگ کرد و دەستی گرت و وتی: لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیو کرداری ئەبوبەکر و عومەر بەیعەتم پێدەدەیت؟

وتی: ناوەڵا، بەڵکو هێندەی توانام هەبێت، عبدالرحمن دەستی بەردا و عوسمانی بانگ کرد و دەستی گرت و هەمان شتی بەویش وت، عوسمان وتی: بەڵێ بەخوا، ئەوەبوو عبدالرحمن لە شوێنەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دانیشت و، عوسمانیش لە پلیکانەی خوارترەوە، خەڵکەکە هاتن بەیعەتیان دا بە عوسمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبیش بەیعەتی پێدا.(١)

جا بڕێك دەق هاتون، کە عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب بەو بڕیارە ناڕازی بوویت و ئەوەی بە فێڵ دانابێت، ئیبن کەثیر دەڵێت: (ئەوەی زۆرێك لە مێژوونووسانی وەك: ئیبن جەریر و کەسانێکی تر لە بڕێك کەسی نەناسراوەوە تۆماریان کردووە، گوایە: عەلی، بە عبدالرحمنی وتووە: تۆ منت خەڵەتاند و تۆ لەبەر خزمایەتی و لەپێناو ئەوە عوسمانت دانا، تا لە هەموو شتێکدا ڕای تۆ وەربگرێت و...... بەڵام هەموو ئەمانە پێچەوانەی تۆماری صەحیح و دروستن و، دەدرێنەوە بە ڕووی خاوەنەکانیاندا).(٢)

کاتێك عومەری کوڕی خەططاب وەفاتی کرد، خەڵکێ نزایان دەکرد بۆ عومەر، عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبیش وتی: ڕەحمەتی خوات لێبێت، هیوام وایە خوای گەورە لەگەڵ دوو هاوڕێکەت کۆت بکاتەوە - پێغەمبەر (صلی الله علیه

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٤٧.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٤٧.

وسلم) و ئەبوبەکر - چونکە من زۆر جار لە پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) دەبیست دەیفەرموو: من و ئەبوبەکر و عومەر بووین، من و ئەبوبەکر و عومەر وامانکرد، من و ئەبوبەکر و عومەر چووین.[١]

پاش ئەوەی بەیعەت درا بە عوسمان، عەلی، کەسی نزیکی عوسمان بوو، لە زۆر کاتدا هاودەمی بوو، عوسمانیش ڕای ئەوی زۆر لا پەسەند بوو، لە مەسەلەکاندا ڕای وەردەگرت، بۆ نموونە: کاتێك حەببانی کوڕی مونقیژ ژنەکەی تەڵاق دا، ئەوکات ژنەکەی شیری دەدا، ماوەی حەڤدە مانگ تێپەڕ بوو، ئەو ژنە لەبەر شیردانەکە نەدەکەوتە حەیزەوە، دوای چەند مانگێك لەو تەڵاقدانە، حەببان نەخۆش کەوت.

پێی وترا: ئەگەر بمریت، ژنەکەت میراتی بەردەکەوێت.

ئەویش وتی: بمبەن بۆ لای عوسمان، بردرا بۆ لای عوسمان و، هەریەك لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و زەیدی کوڕی ثابت لای عوسمان بوون، کاتێك مەسەلەکەی باسکرد، عوسمان بەو دوو هاوەڵەی لای خۆی وت: ڕاتان چییە؟

ئەوانیش وتیان: ڕامان وایە: ئەگەر بمرێت، ژنەکەی میراتی بەردەکەوێت، ئەگەریش ژنەکە بمرێت، ئەوا حەببان میراتی بەردەکەوێت، چونکە لەو ئافرەتانە نییە، کە ئیتر قەت تووشی حەیز نەبن، لەو ئافرەتانەش نییە، کە هەرگیز تووشی حەیز نابن، ئەوەبوو حەببان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کچە شیرەخۆرەکەی لای ژنەکەی بردەوە، ئیتر ژنەکە کە شیردانی نەما، کەوتە حەیزەوە.

بەڵام دوو جار کەوتە حەیزەوە، تا ئەوەی حەببان مرد، هێشتا ژنەکەی حەیزی نەبوو، بۆیە ژنە تەڵاقدراوەکەی حەببان، میراتی بەرکەوت.[٢]

---

(١) صحیح البخاري، الرقم ٣٤٩٥، صحیح مسلم، الرقم ٤٥٠٦، سنن ابن ماجة، الرقم ٩٧، السنن الکبری للنسائي، الرقم ٧٨٤٧، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٨٧٢.

(٢) السنن الکبری للبیهقي، الرقم ١٤٣٦٣، مصنف عبدالرزاق الصنعاني، الرقم ١٠٧٥٤، مسند الشافعي، الرقم ١٣٢٥.

حەببان دوو ژنی هەبوو، یەکێکیان: قورەیشی بوو، ئەوی تریان پشتیوانی بوو، ئەوەی کە حەببان تەڵاقیدابوو، ژنە پشتیوانییەکە بوو.[١]

لە ساڵی سی و چواری کۆچییەوە، سەرەتاکانی فیتنە دەرکەوتن، کاتێك دەستەیەك کەوتنە ڕەخنەگرتن لە عوسمانی کوڕی عەففان، سەرەتای ڕەخنەکەیان ئەوەبوو وتیان ئەو هاوەڵانێکی زۆری لە پۆستەکاندا لابردووەو کەسانی ئومەوی لە شوێنیاندا داناوە، ئەویش ئەو قسەی زۆر لا سەخت بوو و ناردی بە شوێن والی ناوچەکاندا و هەموو هاتن بۆ لای، لەوانە:( موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان و عەمری کوڕی عاص و عبداللەی کوڕی سەعد و سەعیدی کوڕی عاص و عبداللەی کوڕی عامیر).

لەو بارەوە ڕای ئەوانی وەرگرت، هەریەکەو ڕایەکی دەربڕی، عوسمانیش والییەکانی هێشتەوەو هەوڵیدا کەسە ناڕەزاکانیش بە جیهادەوە سەرقاڵ بکات.

هۆکاری سەرەکی ئەم بەزمانەش، کابرایەکی جوولەکە بوو بە ناوی:( عبداللەی کوڕی سەبە )،کە وای نیشان دابوو موسڵمان بووە، ئینجا چووە میصر و لەوێ فیتنەیەکی نایەوەو، گومانی بۆ خەڵکەکە دروست دەکرد.

کورتەی وتەکەی ئەوەبوو: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەسیەتی کردووە بۆ عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، بۆیە عەلی لە عوسمان شیاوترە بەدەسەڵات،[٢] وەك ئەوەی، ئەو هەموو هاوەڵەی دەوری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)،ئاگایان لە شتی وانەبوویێت و، ئێستا کابرایەکی جوولەکەی تازە موسڵمان بوو، کە ساتێکیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)نەبووە، ئەم مەسەلە گرنگەی زانیبێت، ئیتر تەنها ئەم لەسەر حەق و هەموو هاوەڵان، یان نەزان، یان فێڵباز بووبن!

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ١٥٤٣٠.

(٢) البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٦٧-١٦٨.

ئیبن سەبەئی جوولەکە کەوتە تانەدان لە عوسمان و، خۆی بە دڵسۆزی ئیسلام نیشان دا، خەڵکێکی زۆر بە قسەکانی هەڵخەڵەتان و کەوتنە شوێن ڕایەکانی و، ئەو هەوڵەی خۆیان بە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە دەزانی، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو بیرەی ئیبن سەبەئی بڵاو دەبۆوە، تا دوای ساڵێك، خەڵکەکە داوایان لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب کرد بڕوات لەگەڵ عوسمان قسە بکات.

(عەلی)ش چوو و پێی وت: خەڵکێك لە دەرەوە سەبارەت بە تۆ منیان دواندووە، نازانم چی بڵێم؟

چی هەیە تۆ نەیزانیت، ئەوەی ئێمە دەیزانین، تۆیش دەیزانیت، پێش تۆ نەکەوتوین، تا شتێکت پێ بڵێین تۆ نەیزانیت، بە تەنیا لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)نەبوین، تا شتیکی تایبەت بزانین و پێت بڵێین، شتێکی تایبەتمان بۆ نەبووە، کە لە تۆشاراوە بێت.

تۆ هاوەڵ و زاوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)بوویت و فەرموودەت لێوە بیستووەو بینیوتە، کوڕی ئەبوقوحافە و کوڕی خەططابیش لە تۆ لەپێشتر نەبون بە شتێك،تۆ لە خزمایەتیدا نزیکترینیت بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و، ئەوەی تۆ هەتبوو لە زاوایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەو دوانە نەیانبوو.

لە هیچدا پێش تۆ نەکەوتن، دەی بۆ خاتری خوا وریای خۆت بە، نابینات پێ بینا ناکرێت و نەفامت پێ زانا ناکرێت، ڕێگەکە ڕوونەو پایەکانی دین وەستاون، تۆ دەزانیت ئەی عوسمان! چاکترین بەندەی خوا لای خوا، پێشەوایەکی دادپەروەرە،کە ڕێنموونی کرابێت و سوننەتێکی ڕوون پەیڕەو بکات و، دوور لە بیدعەی دیار بگرێت.

بەخوا، هەردووکیان ڕوونن و سوننەتەکان وەستاو و بەرچاون، بیدعەکانیش هەروا، خراپترین کەس لای خوا پێشەوایەکی ستەمکاری گومڕایە، کە خەڵکی بەهۆیەوە گومڕا ببن، ئیتر سوننەتی ڕوون لەناوبەرێت و بیدعەی کەنارخراو زیندوو بکاتەوە، ...

عوسمانیش وەڵامی دایەوەو وتی: بەخوا، دەمزانی ئەوە دەڵێیت، بەخوا ئەگەر تۆ لە شوێنی من بویتایە، نە لێت تووڕە دەبووم و نەتانەم لێدەدایت و نەخراپەیەکم دەکرد، من خزمایەتیم گەیاندووەو درزەکانم گرتووەو، پەنای فەوتاوم داوەو لەسەر هەمان شێوەی عومەر کەسەکانم داناوە.

ئەی عەلی! سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا دەزانیت موغیرەی کوڕی شوعبە لێرە نەبوو؟

وتی: بەڵێ.

وتی: دەشزانیت عومەر داینا؟

وتی: بەڵێ.

عوسمان وتی: دەی ئیدی بۆ سەرکۆنەی من دەکەن، ئەگەر ئیبن عامیرم لەبەر خزمایەتی دانابێت؟

عەلی پێی وت: عومەر، کە کەسێکی دادەنا، دواتر لارییەکی لێ بەدی بکردبایە، ئەوپەڕی سزای دەدا، بەڵام تۆ ئەوە ناکەیت، بەرامبەر بە خزمانت، نەرمی و لاوازیت نواندووە ز

عوسمان وتی: ئەوانە خزمانی تۆیشن، پاش بڕێك قسەکردن پێکەوە، عەلی لای عوسمان چووە دەرەوە، عوسمانیش بە دوایدا چووە دەرەوەو چووە سەر مینبەر، وتارێکی پێشکەش کرد.[١]

لە ساڵی سی و پێنجی کۆچیدا، میصر شڵەژانێکی بەخۆوە دی، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق و موحەممەدی کوڕی ئەبوحوذەیفەو، ژمارەیەکی تر لە نەیارانی عوسمان، نزیکەی شەش سەد سواریان لە میصرەوە ئامادە کرد و، بەرەو مەدینە بەڕێکەوتن و بوون بەچوار بەشەوە، بەسەرکردایەتی: (عەمری کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی و عبدالرحمنی بەلوی و کینانەی کوڕی بیشر

---

(١) البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٦٨-١٦٩.

و سودانی کوڕی حمران)، موحەمەدی کوڕی ئەبوبەکریش لەگەڵیاندا هات، بەڵام موحەممەدی کوڕی ئەبوحوذەیفە لە میصر مایەوە، تا خەڵکی تر هان بدات و بەرگری لەوانە بکات، کە ڕۆیشتوون.

والی میصریش نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و، ئاگاداری کردەوە لەو ڕووداوە و وتی: وەك عومرەکار دێن و وا خۆیان نیشان دەدەن، جا کە لە مەدینە نزیك بوونەوە، خەلیفە فەرمانی بە عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب کرد، تا پێشهاتنیان بۆ مەدینە بیانگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆیان.

(عەلی)ش داوای لە عەمماری کوڕی یاسر کرد، هاودەمی بکات، بەڵام عەممار ڕازی نەبوو، چونکە ئەویش لە عوسمان تووڕە بوو، لەبەرئەوەی پێشتر عوسمانی کوڕی عەففان سزای دابوو، عەلی خۆی چوو بۆ لایان و لە ناوچەی (جوحفە) بوون، ئەوانە بەچاوی گەورەییەوە تەماشای عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبیان دەکرد.

عەلی لێیان تووڕە بوو، تەنانەت کەوتە قسە پێ وتنیان، ئەوانیش کەوتنە سەرکۆنەی خۆیان و وتیان: لەسەر ئەمە جەنگی خەلیفە دەکەن؟

عەلی وتی: بۆچی نەیاری عوسمانن؟

ئەوانیش چەند ڕەخنەیەکیان ژمارد، (عەلی)ش یەك یەك وەڵامی ڕەخنەکانی ئەوانی دایەوە، دەستەیەکیشیان چوون گوێیان لە وتەکانی عوسمان گرت، کە هیچ ڕەخنەیەکیان نەما، دەستەیەك لە خەڵکی مەدینە داوایان لە عوسمان کرد سزای ئەوانە بدات.

بەڵام عوسمان لێبوردەیی نیشاندا، ئەوانیش گەڕانەوە و (عەلی)ش گەڕایەوە بۆ لای عوسمان و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد، داوایشی لێکرد وتارێك پێشکەش بکات و، پۆزش بهێنێتەوە بۆ ئەوەی خزمانی خۆی پێشخستووەو تەوبە نیشان بدات.

عوسمانیش ڕایەکەی وەرگرت و لە وتاری هەینیدا ئەوەی کرد و، نزایەکی تەوبەی کرد و چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك،بەمەش هەموو موسڵمانان گریان، ئینجا مەڕوانی کوڕی حەکەم، وتەیەکی زبری پێشکەش کردو دڵی عەلی ڕەنجاند.

دواتر عوسمان بەڕاوێژی ژنەکەی، ناردی بە شوێن (عەلی)دا، تا بێت بۆ لای و ویستی دڵی بداتەوە، بەڵام عەلی ڕازی نەبوو، کە خەڵکی میصر بەم ڕووداوەیان زانی، لەگەڵ خەڵکی کوفەو بەصرە کەوتنە نامە گۆڕینەوەو، ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی، جەنگی عوسمان بکەن.

لەو نێوەندەدا بڕێك نامە بەدەم هاوەڵانەوە ساختە کران، ئەوەبوو هەمدی شەش سەد سوار لە میصرەوە بە چوار بەش هاتن وئیبن سەبەئیشیان لەگەڵ بوو، لەو لاشەوە خەڵکی کوفە بە چوار بەش هاتن، خەڵکی بەصرەش بە چوار بەش هاتن، هەریەکەو نیازێکیان هەبوو.

میصرییەکان دەیانوت: دەبێت عەلی ببێت بە خەلیفە، کوفییەکان دەیانوت: با زوبەیر ببێت بە خەلیفە، بەصراییەکان دەیانوت: با طەلحە ببێت بە خەلیفە، هەموو لە مانگی شەووالدا لە دەوری مەدینە خڕ بوونەوە، میصرییەکان چوون بۆ لای عەلی، ئەویش حەسەنی کوڕی ناردبوو بۆ لای عوسمان، خۆیشی کەناری گرتبوو، کە هاتن بۆ لای عەلی، لێیان تووڕە بوو و دەری کردن.

زوبەیر و طەلحەش، بەهەمان شێوەی عەلی، بانگەشەکەرانی خۆیانیان دەرکردو نەفرەتیان لێکردن، ئینجا هەموویان نیازی خۆیان ڕاگەیاند و وتیان: داوای ئێمە ئەوەیە: عوسمان واز لە خیلافەت بهێنێت، جا میصرییەکان دەیانوت: جاری پێشوو، کە چووینەتەوە، نێردراوی عوسمانمان بەدیل گرتووە، کە نامەی پێ بووەو نامەکە مۆری عوسمانی لەسەر بووەو، تیایدا فەرمانی کردووە: هەمووومان بکوژن و دەست و پێمان ببڕن! ئەو نامەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

که عوسمان ئەوەی بیست، سوێندی خوارد: شتی وای نەوتووەو نەنووسیوە، ئەمەش نامەیەکی ساختە بوو ئامادە کرابوو! هەروەك نامەبە دەم عەلی و زوبەیر و طەلحەوە نووسرابوو، کە بێن بۆ لەناوبردنی عوسمان، وەزعەکە بەو جۆرە بوو، تا ڕۆژی هەینی هات و عوسمان وەك جاران وتاری خۆی پێشکەش کرد، هێندێ دوای ئەمە گەمارۆ درا.[1]

لە مانگی ذیلقەعدەی ساڵی سی و پێنجدا هاتنە ناو مەدینە، عوسمان چاوی پێیان کەوت، ئەوانیش وتیان: قورئانێك داوا بکە، ئەویش داوای کرد قورئانێك بهێنن، - کە قورئانەکەی بۆ هێنرا - پێیان وت: - سورەتی - نۆیەم بکەرەوە، واتە: سورەتی (یونس).

ئینجا وتیان: بیخوێنەرەوە، تا گەیشتە ئەم ئایەتە: :(ءآالله أذن لكم أم على الله تفترون).

ئینجا پێیان وت: بوەستە، (أرأيت ما حميت من الحمى)، ئایا خوا مۆڵەتی ئەوەی پێداویت، یان بەدەم خواوە هەڵت بەستووە؟ عوسمان وتی: تێیپەڕێنە، ئەو ئایەتە لەسەر فلانە مەسەلە دابەزیوە، عومەریش ئەوەی منی کرد و لە وشترەکانی زیادکرد و منیش وام کردووە.

بەردەوام ڕەخنەیان لێدەگرت و ئەویش وەڵامی دەدانەوە، تا دواتر عوسمان بەوانی وت: چیتان دەوێت؟ ئەوانیش بەڵێننامەکەیان هێنا و شەش، یان پێنج مەرجیان بۆ نووسی، کە هەرکەس دوورخراوەتەوە بگەڕێنرێتەوەو ئەوەی - مووچەی لێ بڕاوە - بۆی بگێڕدرێتەوە و، فەیئیش هەبێت و لە دابەشکردندا دادپەروەر بێت و، کەسانی بەهێز و جێمتمانە بکاتە بەرپرس، ئەوەیان لە نامەیەکدا نووسی، ئەویش بەڵێنی لەوان وەرگرت،کەیەکرێزی تێکنەدەن، ئینجا بە ڕەزامەندییەوە گەڕانەوە.

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٧٥.

دەوترێت: بەڵکو عەلی ناردووە بۆ لایان و، لەسەر ئەو پێنج شتە باسکراوە رێککەوتن و بەرەزامەندی گەڕانەوە، لەو وەزعەدا بوون، کە سوارێك هات و رێی پێیان گرتو،چەند جارێك بڵاوەی بە کۆبوونەوەیان دەکرد و دەهاتەوە بەنێویاندا!

وتیان: ئەوە تۆ چیتە ؟ - بۆ وادەکەیت؟ -

ئەویش وتی: من نێردراوی ئەمیری باوەڕدارانم بۆ لای کاربەدەستی خۆی لە میصر.

ئەوانیش پشکنیان، سەیریان کرد نامەیەکی پێیە، کە لەسەر زمانی عوسمان نووسراوە و مۆری ئەوی لێدراوە،کە ناردوویەتی بۆ کاربەدەستی میصر و فەرمانی پێکردووە: - ئەو کۆمەڵە کە گەڕانەوە - لە خاچیان بدات و دەست و پێیان ببڕێت.

ئەوانیش گەڕانەوە بەرەو مەدینەو چوون بۆ لای عەلی و پێیان وت: سەیرکە دوژمنی خوا چی کردووە؟!! چی لە بارەمانەوە نووسیوە؟ خوا خوێنی ئەوی حەڵاڵ کردووە، ئینجا بە عەلییان وت: لەگەڵ ئێمە وەرە بچین بۆ لای - عوسمان، ئەویش وتی: بەخوا نایەم لەگەڵتان، وتیان: ئەی بۆچی - پێشتر - بەڵێننامەت بۆ نووسین؟

ئەویش وتی: بەخوا من بۆم نەنووسیون، ئەوانیش لەنێو خۆیاندا سەیری یەکتریان دەکرد، ئینجا عەلی لە مەدینە چوویەدەرەوە.

ئەوانیش چوون بۆ لای عوسمان و پێیان وت: تۆ شتی وات لە بارەی ئێمەوە نووسیوە!

ئەویش وتی: یان دەبێت دوو موسڵمان بهێنن - کە شایەتیم لەدژ بدەن - یان من سوێند دەخۆم - شتی وام نەنووسیوە -، بەڵام ئەوان بەوە ڕازی نەبوون و بەڵێنەکەیان هەڵوەشاندەوەو گەمارۆیان دا!

چەند قسەو ڕاگۆڕینەوەیەك لەنێوان عوسمان و یاخیبواندا ڕوویدا، دەوترێت: (ئەشتەر) هێنراوە بۆ لای عوسمان،( ئەشتەر)یش بە عوسمانی وت: ئەو خەڵکە دەیانەوێت، یان واز لە دەسەڵات بهێنیت،یان قیصاصیان بدەیتەوە، یان بتکوژن!

ئەویش وتی: سەبارەت بەوازهێنانم، ئەوا من ئوممەتی موحەممەد بە پەرتی و ناکۆکی جێناهێڵم، سەبارەت بە قیصاصیش، ئەوا دوو هاوەڵەکەی پێش من قیصاصیان لەخۆیان وەرنەگرتووە، جەستەی منیش بەرگەی ئەوە ناگرێت.[1]

عوسمان پاش کۆتا وتاری لە هەینیدا، تووشی ژانەسەرێك بوو،کە لە هۆش خۆی چوو، خێرا بردیانەوە بۆ ماڵەوە، خێرا نەیارەکانی، کە لەو شوێنە جیاوازانەوە هاتبوون، هاتن و گەمارۆی ماڵەکەیان دا، بەرامبەر بەوە، خێرا دەستەیەك لە منداڵانی هاوەڵان بە فەرمانی باوکیان چوون بۆ ماڵی عوسمان، تا بەرگری لە خەلیفە بکەن، لەوانە:( حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، عبداللەی کوڕی زوبەیر و عبداللەی کوڕی عەمر).[2]

کاتێك هەواڵی شەهیدبوونی عوسمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوسمان و بینییان کوژراوە، عەلی لە حەسەن و حوسەین تووڕە بوو، وتی: ئێوە لەبەر دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟!

ئەوانیش وتیان: ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو بۆکسێکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی بەموحەممەدی کوڕی طەلحەو عبداللەی کوڕی زوبەیر وت.[3]

عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب بەشداری ئەسپەردەکردنی تەرمی عوسمانی کوڕی عەففان بوو، ئەسپەردەکردنەکەش لەنێوان نوێژی ئێوارەو عیشادا بوو، هاودەم

---

(١) العواصم من القواصم.

(٢) البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٧٦.

(٣) الثقات لابن حبان، ج٢، ص ٢٦٥.

بەژمارەیەکی کەمی هاوەڵان، کە حەکیمی کوڕی حیزام و زەیدی کوڕی ثابت و عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب و زوبەیری کوڕی عەوام و کەعبی کوڕی مالیك و طەلحەی کوڕی عبیداللە و ژنەکانی عوسمانی تێدا بوو.

عوسمان شۆردرا و کفن کرا و نوێژی لەسەر کرا، هەندێ لە خەواریجەکان ڕێیان پێدەگرتن ودەیانویست تەرمەکەی بەردباران بکەن، دواتر لە گۆڕستانی جوولەکەکان ئەسپەردە بکرێت، عەلی کەسێکی نارد بۆ لایان و ڕێگری لێیان کرد، چەند جار هەوڵ درا ڕێ نەدەن لە گۆڕستانی (بەقیع)یش ئەسپەردە بکرێت، بۆیە لە دەرەوەی (بەقیع) ئەسپەردە کرا، تا کاتێك موعاویە بوو بە خەلیفە، ئەو دیوارەی نێوانی لابرد، دواتر تەرمی دوو خزمەتکارەکەی عوسمانیشیان هێنا کە کوژرابوون و لەپاڵ عوسماندا ئەسپەردە کران.[1]

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ١٩٠-١٩١.

## فیتنەی سەردەمی
## عەلی کوڕی ئەبوتالیب

کاتێك عوسمان شەهید کرا، دوای ئەوە بەیعەتی خیلافەت درا بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو: بەیعەتەکە هەموو موسڵمانانی لەخۆنەگرت، بەڵکو بەهۆی ڕاجیایی سەبارەت بە خوێنی عوسمان فیتنەیەك لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویدا، ئەویش بووە هۆی ڕوودانی هەردوو جەنگی: (جەمەل و صفین)، دواجاریش کێشەکە هەر بەو بارەیەوە مایەوە، تا لەسەر دەستی حەسەنی کوڕی عەلی فیتنەکە کوژایەوە.

بەو بەیعەتدانە، موعاویە لە شام و خەڵکی شام مانەوە بەیعەتیان بەعەلی نەدا، جگە لەوەی طەلحەو زوبەیروعائیشەی دایکی باوەڕدارانیش ئیجتیهادیان وابوو: دەبێت بکوژانی عوسمان یەکسەر بکوژرێنەوە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب ڕای وابوو: پەلە نەکرێت لە کوشتنەوەیان، چونکە ئەوان لەناو مەدینەدان و سەربازانی دەوڵەتی ئیسلامیش لە دەرەوەن، ئەگەر خێرا بکرێت لە لێدانیان، لەوانەیە بتوانن مەدینە بگرن.

بەهەرحاڵ ئەمە بووە هۆی کەوتنەوەی فیتنەیەکی گەورە، کە ئەنجامێکی دڵتەزێنی هەبوو بۆ موسڵمانان و،تا ئەمڕۆش ئاهی داخی ئەو فیتنەیە لای موسڵمانان گەرمەو، هێشتا خەفەتیان بەو فیتنەیە دانەمرکاوەتەوەو، بووە بەچەکێك بەدەست دوژمنانی ئیسلام و مێژووی ئیسلامی و هاوەڵانەوە، تا داخی دڵی خۆیان بڕێژن.

کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان کوژرا، دایکانی باوەڕداران (هاوسەرەکانی پێغەمبەر) چووبوون بۆ حەج بۆ مەککە، تا لەدەست ئەو فیتنەیەی مەدینەی گرتۆتەوە ڕزگار بن، کاتێك ویستیان بگەڕێنەوە مەککە، هەواڵیان پێگەیشت، کە عوسمان کوژراوە، بۆیە لە مەککە مانەوە، تا بزانن بارەکە بە چی دەگات.

ئەوەبوو بێ پێشنیازی خۆی، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بەیعەتی پێدرا، بەتایبەت، کە خەواریجەکان زۆریان لە عەلی کرد، هەرچەندە عەلی خۆی ڕقی لێیان بوو، بەڵام هیوای وابوو دەرفەتێکی بۆ بگونجێت، تا لەناویان بەرێت، ئەوەبوو، کە ئەو فشارە بینرا، ژمارەیەك لە خزمانی عوسمان لە بەنوئومەییە دەرچوون بۆ مەککە.

هەریەك لە زوبەیر و طەلحەش داوای مۆڵەتیان کرد، تا بچن بۆ مەککە، (عەلی)ش مۆڵەتی پێدان، ئەوانیش چوون بۆ مەککە، خەڵکێکی زۆریش شوێنیان کەوت، لە بەصرەو مەدینەو یەمەن و چەند شوێنی ترەوە، خەڵکێکی زۆر ڕوویکردە مەککەو، لەوێ ژمارەیەکی زۆری هاوەڵان و دایکانی باوەڕداران و جەماوەرێك کۆبوونەوەو، داوای خوێنی عوسمانیان دەکرد، عائیشەی دایکی باوەڕدارانیش جڵەوی مەسەلەکەی گرتبوویەدەست.[1]

**وەستانێك:**

سەبارەت بە بەیعەتدانی طەلحە و زوبەیر بە عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب، مشتومڕێك هەیە، کە ئایا بە ویستی خۆیان بەیعەتیان داوە، یان بە ناچاریی.

کاتێك بەیعەت بە عەلی درا، عەلی داوای هەریەك لە طەلحەو زوبەیری کرد، ئەوانیش هاتن، طەلحە دەیویست بەیعەت نەدات، بەڵام مالیکی ئەشتەر شمشێری هەڵکرد و وتی: بەیعەت نەدەیت لە گەردنت دەدەم، ئەویش بە ناچاریی بەیعەتی دا، زوبەیریش بە دوایدا بەیعەتی دا!

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٠ – ٢٣١.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: عەلی بەوانی وت: یان ئێوە بەیعەتم پێ بدەن، یان من بەیعەتتان پێ دەدەم!

ئەوانیش وتیان: ئێمە بەیعەتت پێدەدەین.(١)

طەلحە وتی: من کاتێك بەیعەتم داوە، کە شمشێر لە گەردنم بووە، هەریەك لە سەعد(٢) و ئوسامەی کوڕی زەید شایەتییان داوە، کە بەیعەتەکەی طەلحەو زوبەیر، ناچاریی بووە.(٣)

لێرەدا پێم خۆشە پوختەیەکی نووسینەکەی ئیبنولعەرەبی بەش بەش، بەهەمان دەقی خۆی دابنێم:

کاتێك قەدەری خوا هات و ئەوەی لە قەدەردا هەبوو ڕوویدا و، حەق هەروا خەڵك وێڵ ناکات و خەڵکی دوای عوسمان سەبارەت بەخەلیفەیەك، کە بەسەریاندا دابنرێ ڕاجیادەبوون، هیچ کەسیش نەبوو دوای ئەو سێ خەلیفەیە، هێندەی چوارەم خەلیفە - واتە: عەلی - بەڕێزتر و زاناتر و لەخواترستر و ئاییندارتر بێت، بۆیە بەیعەتی پێدرا، ئەگەریش بەو خێراییە بەیعەت نەدرایە بە عەلی، ئەوا وێڵ و لاسارەکان بارەکەیان زۆر خراپتر دەکرد، بەڵام کۆچەران و پشتیوانان بڕیاری خیلافەتیان بۆ عەلی دا، ئەویش ئەوەی لەسەر خۆی بە فەرز زانی، بۆیە ملکەچی بوو.

طەلحە بەیعەتی بە عەلی دا، خەڵکیش وتیان: دەستێکی ناتەبا بەیعەتی بە عەلی داوە، سوێند بەخوا، ئەم مەسەلەیە ناگاتە جێی مەبەست، جا ئەگەر بوترێت: ئەو دوانە - طەلحەو زوبەیر - بە ناڕەزایی بەیعەتیان داوە - بە عەلی -.

لە وەڵامدا دەڵێین: هەرگیز شتی وا نەبووە،کە بە ناحەزیی بەیعەتیان دابێ و زۆریان لێکرابێت، ئەگەریش تەنانەت بە ناڕەزایی بەیعەتیان دابێت، ئەوە کار ناکاتە

---

(١) تاريخ الطبري، ج٢، ص ٦٩٧.

(٢) تاريخ الطبري، ج٢، ص ٦٩٩.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

سەر بەیعەتەکەی عەلی، چونکە بەیەك کەس، یان دوان، بەیعەت دەبەسترێت و سەردەگرێت، ئیتر هەرکەس دوای ئەوە بەیعەت بدات پەیوەستی ئەو بەیعەتە دەبێت.

بەپێی شەرعیش، پێویستە لەسەری ئەو بەیعەتە بدات، ئەگەریش ئەو دوانە بەیعەتیان نەدایە، ئەوا ئەو کارە کاریگەری نەدەبوو بۆیان و، کاریگەریشی نەدەبوو بۆ بەیعەتی پێشەوا - ی موسڵمانان -.

ئەوەش، کە دەڵێت: دەستێکی ناتەباو کارێکی بەئەنجام نەگەیشتووە، ئەوە گومانی کەسێکە، کە دەڵێت: طەلحە یەکەم کەس بووە بەیعەتی داوە، مەسەلەکەش وا نەبووە - طەلحە یەکەم کەس نەبووە بەیعەتی بە عەلی دابێت -.

ئەگەریش بوترێت: موسڵمانان لەسەر ئەوە بەیعەتیان بە عەلی داوە، کە بکوژانی عوسمان بکوژێتەوە، ئەوا دەڵێین: ئەو مەرجە بۆ بەیعەت ڕاست نییە، بەڵکو لەسەر ئەوە بەیعەتی پێدەدەن، کە حوکم بە حەق بکات، ئەویش ئەوەیە: کەسی داواکاری خوێنی عوسمان ئامادە بێت و، کەسی داواکراویش ئامادە بێت و، سکاڵا بکرێت و وەڵام بدرێتەوەو بەڵگە بەردەست بێت و حوکم بدرێت، بەڵام ئەوەی هەر بە قسەیەکی ڕەها، یان کارێکی بەدواداچوون بۆ نەکراو، یان بیستنی قسەیەك هێرش ببات، ئەوە لە ئایینی ئیسلامدا شتی وا نییە.

عوسمانییەکان دەڵێن: دەستەیەك لە هاوەڵان، لە بەیعەتدانی دواکەوتن، لەوانە: (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و مەحەممەدی کوڕی مەسلەمەو ئیبن عومەر و ئوسامەی کوڕی زەید) و چەند هاوشێوەیەکی تری ئەوان.

ئێمەش دەڵێین: سەبارەت بە بەیعەت پێدانی دوانەکەوتون، بەڵام سەبارەت بەسەرخستنی دەستەیەك لەوانەی، کە باسکران دواکەوتن، چونکە ئەو مەسەلەیە، مەسەلەیەکی ئیجتیهادی بوو، هەر کام ئیجتیهادێکیان هەبوو و، بەپێی ڕوانینی خۆی هەنگاوی دەنا و قەدەری خۆی دەهاتە ڕێ.

دەستەیەك دەگێڕنەوە: کاتێك بەیعەت بە عەلی درا، طەلحە و زوبەیر، داوای مۆڵەتیان لە عەلی کرد، تا بچن بۆ مەککە، عەلی بەوانی وت: لەوانەیە بتانەوێت بچن بۆ بەصرەو شام، ئەوانیش سوێندیان خوارد وا ناکەن.[1]

---

(١) العواصم من القواصم لابن العربي.

## ڕێککەوتن لە مەککە

لە مەککە سێ ڕای جیاواز دروست بوو، دەستەیەك وتیان: با بچین بۆ لای موعاویە بۆ شام و لەوێوە بێین تۆڵە بکەینەوە.

دەستەی دووەم وتیان: بەڵکو با بچین بۆ مەدینە بۆ لای عەلی و داوای تۆڵەی عوسمان بکەینەوە، دەستەی سێیەم وتیان: بەڵکو دەچین بۆ بەصرە و لەوێ خۆمان بەهێز دەکەین و، هەر لەوێوە دەکەوینە لەناوبردنی بکوژانی عوسمان، ئەوەبوو لەسەر ئەم ڕایە ڕێککەوتن.[1]

(سەبارەت بەچوونی - هاوەڵانی عائیشەو طەلحەو زوبەیر - بەرەو بەصرە ڕاستەو، هیچ کێشەیەکی لەسەر نییە، بەڵام بۆچی دەرچوون؟

لەمەدا گێڕانەوەیەکی لەسەر نییەو، متمانە بەهیچ گێڕانەوەیەکیان ناکرێت، چونکە کەسی جێمتمانە نەیگێڕاوەنەتەوە، قسەی کەسی هەوادار وەرناگیرێت، حەزی تانەدان لە ئیسلام و بەکەمدانانی هاوەڵان، چووەتە ناخی کەسی هەوادار و دەمارگیر.

لەوانەیە بۆ ئەوە دەرچووبن، تا لەبەر شتێك، کە بۆیان دەرکەوتووە ویستبێتیان عەلی - لە خیلافەت - لاببەن، بۆیەش بەیعەتیان دابێت، تا شۆڕشگێڕەکان هێور ببنەوە، دواتر کەوتبنە داوای حەق.

لەوانەشە بۆیە چووبنە دەرەوە، تا بکوژانی عوسمان لەناوبەرن.

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣١.

لەوانەشە بەچەند دەستەیەکی موسڵمانانەوە دەرچووبن، تا بیانگێڕنەوە بۆ یەك قانوون، تا بەریەك نەکەون و دژ بەیەك نەجەنگن، ئەمەش دروستە، نەك شتی تر، هەواڵی ڕاستیش بەم جۆرە هاتووە.

سەبارەت بە گێڕانەوەکانی بەشەکانی یەکەم، هەموویان پووچ و لاوازن.

سەبارەت بەوەی ئەوان بە زۆر و ناچاریی بەیعەتیان دابێت، ئەوە بێ بنەما و پووچەو، پێشتریش وونمان کردۆتەوە.

سەبارەت بەوەی ویستبێتیان عەلی لە خیلافەت لاببەن، ئەمەش بێ بنەما و پووچە، چونکە لابردن بە ڕاو ڕوانینی هەموان دەبێت، دەکرێت یەك، یان دوو کەس لە دەسەڵاتدا بن، بەڵام لابردن، تەنها دوای سەلماندن و ڕوونکردنەوە دەبێت.

سەبارەت بەوەش، کە لەوانەیە بۆ کوشتنی بکوژانی عوسمان دەرچووبن، پێش ئەمە کارەکە، بنەڕەتەکەی بۆ یەکدەنگی بووە، دەشکرێت هەردوو مەسەلەکە پێکەوە بن.

دەگێڕدرێتەوە: لە کاتی ئامادەنەبوونی - طەلحە و زوبەیر و عائیشە لە مەدینەدا - ئاژاوەی نێوان خەڵك نەما، طەلحە و زوبەیر و عائیشەی دایکی باوەڕدارانیش بەو هیوایە چوونەدەرەوە، تا خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای دایکیانو،ڕەچاوی حورمەتی پێغەمبەرەکەیان بکەن).[1]

کە گەیشتنە بەصرە، بەرپرسی ئەوێ نوێنەری نارد، تا بزانێت بۆچی هاتون؟

چوونە لای عائیشە وتیان بۆچی هاتویت؟

وتی: بۆ داوای خوێنی عوسمان هاتوین.

چوونە لای طەلحە، ئەویش هەمان شتی وت.

چوونە لای زوبەیریش، ئەویش هەمان شتی وت.[2]

---

(١) العواصم من القواصم لابن العربي.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٢.

بەڵام سوپاکەی عوسمانی کوڕی حنیف، بەوە ڕازی نەبوون و هەوڵیاندەدا لەگەڵ سوپای عائیشە بجەنگن، خاتوعائیشەش فەرمانی کرد، کەس جەنگ نەکات، یەك ڕۆژ خۆیان پاراست، بەڵام لەڕۆژی دووەمدا، جەنگ ڕوویدا و ژمارەیەك لە هاوەڵان و کەسانی تر کوژران.[١]

دواتر بڕیارياندا: هەواڵ وەربگرن، ئەگەر طەلحەو زوبەیر بە ناچاریی بەیعەتیان دابوو، ئەوە عوسمانی کوڕی حنیف، بەصرەیان بۆ چۆڵ بکات، ئەگەریش بە ویستی خۆیان بوویێت، ئەوە ئەو دوانە، دەبێت بەصرە چۆڵ بکەن.

جا نوێنەریان نارده مەدینەو، نوێنەر هەواڵی پرسی، کەس وەڵامی نەدەدایەوە، جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید، کە وتی: بەخوا بە ناچاریی بەیعەتیاندا، کەچی خەڵکانێك هەڵمەتیان بۆ برد، چەند هاوەڵێك ڕزگاریان کرد، بارەکە نەگەیشتە ئەنجام![٢]

لە بەصرە جەنگ ڕوویداو، ژمارەیەکی تر کوژران و، عوسمان بەدیل گیرا و بردرا بۆ لای خاتوعائیشە، ئەویش داوایکرد ئازاد بکرێت، شاریش کەوتە دەست سوپای خاتوعائیشە.[٣]

عەلی کوڕی ئەبو تالیب، کە ئەمەی بیست، بڕیاریدا بچێت بەرەو بەصرە، خەڵکێکی کەمی مەدینەی لەگەڵ بوو، ژمارەیەك لە هاوەڵانی بەشداربووی غەزای (بەدر)ی لەگەڵدا بوو، ژمارەی سوپاکەی عەلی، تەنها نۆسەد کەس بوو، حەسەنی کوڕی، داوای لێکرد نەچێت، عبداللەی کوڕی سەلامیش هەمان داوای لێکرد، بەڵام عەلی ڕازی نەبوو، ئینجا هەواڵی نارد بۆ کوفە، تا بدەنە پاڵی، بەرەبەرە سوپاکەی عەلی ڕووی لە زیاد بوون بوو.[٤]

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٣.

(٤) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٤ — ٢٣٥.

عەلی، کە عوسمانی کوڕی حنیفی بینی و، هەواڵی کارەکانی طەلحە و زوبەیری بیست، نزای کرد: خوایە! طەلحەو زوبەیر بەرامبەر بەو هەڵەی کردوویانە، بێدار بکەیتەوە.[1]

کاتێك زوبەیر لە بەصرە بوو، کەسێك هات بۆ لای و وتی: ئەریێ بچم عەلی بکوژم؟

ئەویش وتی: چۆن دەیکوژیت، لەکاتێکدا سەربازی زۆری لەگەڵدایە؟

ئەویش وتی: دەچمە ناو سوپاکەی و خۆمی لێ نزیك دەکەمەوە، دواتر دەرفەتی لێ دێنم.

زوبەیر وتی: پێغەمبەر دەیفەرموو: (الإيمان قيد الفتك، لا يفتك مؤمن[2]. ئیمان، نامەردکوژی کۆت کردووە، باوەڕدار نامەردکوژی ناکات).

دواجار ( قەعقاع) کەوتە نێوانەوە، چووە بەصرە، طەلحەو زوبەیری بانگهێشت کرد بۆ یەکڕیزی و دوورگرتن لە دووبەرەکیی، سەرەتا لەگەڵ خاتوعائیشە قسەی کرد و وتی: دایە گیان! بۆچی هاتوویتەئێرە؟

ئەویش وتی: کوڕی شیرینم! بۆ ڕێککردنی باری نێوان خەڵك، ئینجا (قەعقاع) داوایکرد، طەلحەو زوبەیریش بانگ بکات، ئەوانیش هاتن، (قەعقاع) وتی: دایکی باوەڕداران دەڵێت: بۆ صولح هاتوم، ئەوانیش وتیان: ئێمەش بەس بۆ ئەوە هاتوین.

ئەویش وتی: دەی پێم بڵێن: ئەو صولحەتان لە چ ڕوانگەیەکەوەیە؟ ئەگەر بە ڕەوامان زانی، شوێنتان دەکەوین، ئەگەریش بە ڕەوامان نەزانی، ئیتر هیچ.

ئەوانیش وتیان: بکوژانی عوسمانمان دەوێن لەناوببرێن.

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٥.

(٢) مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦٧٥٢، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٣٧٥، صححه شعيب الأرناؤوط.

( قەعقاع ) وتی: خۆ ئێوە بکوژانی ئەوتان لە بەصرە کوشت، شەش سەد کەستان کوشت، شەش هەزار کەس چوونە ڕیزی ئەوانەوەو دژتان وەستان، داوای تەنها کەسێکتان کرد، کە (حرقوص) بوو، شەش هەزار کەس بوونە پارێزەری.

ئەمەی ئێوە داوای دەکەن بۆ چاکەیە، بەڵام خراپەیەکی زۆر گەورەی لێدەکەوێتەوە.

خاتوعائیشە وتی: ئەی تۆ چ چارەسەرێکت پێیە؟

( قەعقاع ) وتی: من پێم وایە: دەرمانی ئەم دەردە نارامگرتنە، تا بارەکە هێور دەبێتەوە، ئەمە بکەن خێر و ڕەحمەت دێت، ئەگەریش ڕازی نەبن، باری خراپە زیاتر دەبێت بۆ هەردوو لامان.

ئەوانیش وتیان: دەی بۆچوونەکەت زۆر دروستە، بڕۆ ئەگەر (عەلی)ش هەمان ڕای هەبوو، ڕازی دەبین، ئەویش چوویەوە، بینی (عەلی) هەمان ڕای هەیە، ئیتر هەردوولا ڕێککەوتن.

خاتوعائیشەش نوێنەری نارد بۆ لای (عەلی)، تا پێی بڵێت: ئەو تەنها بۆ صولح هاتووە، هەردوولا دڵخۆش بوون و، عەلیش وتارێکی پێشکەش کرد بۆ خەڵکەکە، کە تیایدا باسی خراپەی دووبەرەکیی کرد و نیازی ڕێککەوتنەکەی خستەڕوو.[1]

لە وتارەکەی (عەلی)یەوە، دەستەی ئاژاوەگێڕان زانییان خەریکە ڕێکدەکەون، کەوتنە خۆ، لەوانە: (ئەشتەری نەخەعی و عبداللەی کوڕی سەبە و شریح و سالم) و چەندکەسێکی تر، کە هیچ هاوەڵێکیان تێدا نەبوو، نزیکەی دوو هەزار و پێنج سەد کەسێك دەبوون، کەوتنەخۆ و وتیان: ئەم ڕێککەوتنە دژ بە ئێمەیەو ژمارەشمان کەمە،ڕ ێککەوتنی ئەوان، تەنها لەسەر خوێنی ئێمەیە، بۆیە دەبێت (عەلی)ش وەك عوسمان لێبکەین، خەڵکەکەش ڕازی بوون، بەڵام عبداللەی

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٧.

کوڕی سەبە وتی: ڕایەکەتان زۆر خراپە، چونکە ئەوکات هەردوولا دەبنە دوژمن و لێتان دەدەن، بەڵکو دەبێت جەنگ لەنێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەڵگیرسێنین.

کاتێك زوبەیر و طەلحە چوون بۆ لای (عەلی) تا ڕێکبکەون، دەستەی سەبەئییەکان خۆیان بەشکرد بەسەر هەردوولاداو جەنگیان هەڵگیرساند، هەردوولا وایانزانی: بەرامبەر ناپاکی نواندووە! بۆیە کەوتنە هێرش، سوپای (عەلی) نزیکەی بیست هەزار کەس و، سوپای خاتوعائیشەش نزیکەی سی هەزار کەس دەبوون، جەنگێکی قوڕس ڕوویدا، (عەلی) هاواری دەکرد: دەست هەڵگرن! بەڵام کەس نەیدەبیست، لەولاشەوە خاتوعائیشە بە سواری وشترێکەوە بۆ هەمان نیاز هات.

(عەلی) هێندە بێزار بوو، بە حەسەنی کوڕی دەوت: کوڕم خۆزگە باوکت بیستساڵ لەمەوبەر دەمرد! (عەلی) چوو، تا زوبەیر و طەلحە بدوێنێت، وتی: ئەم سوپایەتان ئامادە کردووە، بیانووشتان بۆ قیامەتتان ئامادە کردووە؟ دەی لەخوا بترسن، من خوێنی ئێوەم حەڵاڵ نەکردووە، ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان پێیە بۆ ڕەوایی خوێنی من؟[1]

---

(١) البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣٨ — ٢٤١.

## کوژرانی تەلحەی کوڕی عبیداللە

دواتر، کە جەنگی (جەمەل) ڕوویدا، عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب، طەلحەی دواند و هەندێ لەو قسانەی پێ وت، کە بە زوبەیری وتبوو، طەلحەش کەناری گرت لە جەنگەکەو، دواتر تیرێکی بەرکەوت و کوژرا،[1] مەڕوانی کوڕی حەکەم، طەلحەی بە بکوژی عوسمانی کوڕی عەففان دەزانی و دەیوت: ئەمە پشتیوانی نەیارانی عوسمان بوو، بۆیە تیرێکی تێگرت و دای لە ئەژنۆی، بەردەوام خوێنی لێدەچوو، تا کوشتی،[2] ئەمەش لە ڕۆژی پێنج شەممە و دەی (جمادالاولی) ساڵی سی و شەشی کۆچیدا بوو، ئەو کات تەمەنی، نزیکەی شەست و چوار ساڵ دەبوو.[3]

کاتێك عەلی تەرمەکەی طەلحەی بینی، خۆڵی سەر دەموچاوی دەتەکاند و ڕەحمەتی بۆ دەنارد و دەیوت: خۆزگە بیست ساڵ لەمەوبەر بمردمایە، جاخۆی و هاوەڵانی لەسەر تەرمی طەلحە دەگریان.[4]

---

(١) أسد الغابة، ج٣، ص ٨٥.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٥٣٢، قال ابن حجر إسناده صحيح.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٥٣٢.

(٤) أسد الغابة، ج٣،ص ٨٦.

## کوژرانی زوبەیری کوڕی عەووام

عەلی بە زوبەیری وت: سوێندت دەدەم بە خوا، تۆ گوێت لە پێغەمبەر نەبوو، کە پێی دەفەرموویت: تۆ لەگەڵ عەلی دەجەنگێیت و تۆیش ستەمی لێدەکەیت؟

ئەویش وتی: بەڵێ، بەڵام ئەوە ئێستا ئەو فەرموودەیەم بیردەکەوێتەوە، بۆیە کەناری گرت.(١)

ئینجا بە سوارەکەیەوە بە ناو ڕیزەکاندا دەگەڕایەوە، عبداللەی کوڕی وتی: باوکە چیتە؟

زوبەیر وتی: عەلی فەرموودەیەکی بۆ باسکردم، کە من خۆم لە پێغەمبەرم بیستبوو پێی فەرمووم: (تۆ لەگەڵ عەلی دەجەنگیت و ستەمیشی لێ دەکەیت)، بۆیە لەگەڵی ناجەنگم.

عبدالله وتی: بۆچی بۆ جەنگ هاتبوویت؟

تۆ هاتبوویت، تا نێوانی خەڵکەکە ڕێکبخەیت و خوا بە هۆی تۆوە ئەم بارە ڕێکبخات.

زوبەیر وتی: سوێندم خواردووە، جەنگ نەکەم.

عبدالله وتی: دەی جیرجیسی کۆیلەت ئازاد بکەو بوەستە، تا نێوانی خەڵک ڕێکبخەت، ئەویش کۆیلەکەی ئازاد کرد و ڕاوەستا، بەڵام خەڵکەکە جیاوازی زیاتری تێکەوت، بۆیە بە ئەسپەکەیەوە چوو.(٢)

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٥٥٣.

(٢) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٥٥٢، حسنه الألباني بل صححه للوجه الثاني للسند في

زوبەیر، کە چوو دای بەلای سەربازگەکەی ئەحنەفدا، ئەویش وتی: کێ دەچێت هەواڵێکی ئەمەم بۆ وەربگرێت؟

ئیبن جرمووز وتی: من.

ئەوەبوو کەوتە شوێن زوبەیر، کە گەیشت بە زوبەیر، زوبەیر زۆر تووڕە بوو، وتی: چیتە؟

ئیشت چیە؟

وتی: هاتوم تا پرسیارێکت لێ بکەم، عەگیە، کە خزمەتکارێکی زوبەیر بوو، لەگەڵ زوبەیر بوو وتی: ئەو چەکی پێیە، بەڵام زوبەیر گوێی پێ نەدا.

ئیبن جرمووز وتی: کاتی نوێژە، ئەوەبوو دابەزین، تا نوێژ بکەن، کەچی ئیبن جرمووز خۆی خستە پشتی زوبەیر و لە پشتەوە کەلەبەری زرێپۆشەکەی کردە ئامانج و، دای لە زوبەیر و کوشتی و ئەسپ و چەکەکەشی برد، دواتریش وازی لە خزمەتکارەکەی هێنا، خزمەتکارەکەشی تەرمی زوبەیری ئەسپەردە کرد، دواتر چوو هەواڵەکەی بردەوە بۆ خەڵکەکە.[1]

ئیبن عەبباس دەڵێت: لە جەنگی (جەمەل)دا بە زوبەیرم وت: ئەرێ هاتویت لەگەڵ کوڕی عەبدولموتەڵیبدا بجەنگیت؟ ئیتر زوبەیر گەڕایەوە، کەچی ئەوەبوو، ئیبن جرمووز خۆی گەیاند پێی و کوشتی، دواترئیبن عەبباس هات و پرسیاری لە عەلی کرد، ئەرێ بکوژەکەی زوبەیر سەرەنجامی بەرەو کوێیە؟

عەلی وتی: دۆزەخ.

---

سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٢٦٥٩.

(١) تاريخ الطبري، ج٣، ص ٥٥.

# جەنگی صفین

لە ساڵی سی و حەوتی کۆچیدا، پاش ئەوەی موعاویە ئامادە نەبوو بەیعەت بە عەلی بدات و، نەگەیشتە ئەنجام، هەردوو لا لە سوپای عەلی و موعاویە لە ناوچەیەك بەرامبەر یەك وەستانەوە، کە پێی دەوترا: (صفین)، ماوەی چەند ڕۆژێك، ڕۆژانە دەجەنگان، جار هەبوو کەمێك و جاریش هەبوو دوو جار، لە ڕۆژێکدا سووکە جەنگێك دەکرا، هەرچەندە هەوڵ درا بگەنە ئەنجامێك، بەڵام دواجار جەنگێکی سەخت لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا و، تیایدا ژمارەیەکی بەرچاو لە هەردوولا کوژران، کاتێك خەریك بوو دەستەی عەلی سەرکەون، خەڵکی شام قورئانیان بەرز کردەوەو داوایان کرد، هەردوو لا بگەڕێنەوە بۆ بڕیاری قورئان، ئەوانیش ڕازی بوون و بەوە جەنگەکە کۆتایی هات.[1]

---

(١) البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٥٨-٢٨٤.

## هەڵوێستی هاوەڵان

## بەرامبەر بە ئیجتیهادەکەی عەلی

هەڵوێستی هاوەڵان سەبارەت بە ئیجتیهادی عەلی، بۆ چارەسەری پرسی شەهیدکردنی، عوسمان خۆی لە سێ دەستەدا دەبینییەوە:

**دەستەی یەکەم:** بڕوایان وابوو،کە دەبێت خێرا تۆڵەی خوێنی عوسمان بکرێتەوە، تا نەبێتە مۆدێل و هەرکات دەستەیەك ویستیان هەستن خەلیفە بکوژن، بەتایبەت کوشتنی کەسێکی وەك عوسمانی کوڕی عەففان، بۆ ئەمەش، پێشتر نموونەی طەلحە و زوبەیر و خاتوعائیشە و موعاویە و عەمر و چەندێکی ترمان خستەڕوو، کە تەنانەت، تا ڕوودانی جەنگی نێوان دوو دەستەی موسڵمانانیش لەسەر مەسەلەکە ڕۆیشتن و، ئەو فیتنە گەورەی لێکەوتەوە، کە ڕوویدا.

**دەستەی دووەم:** ئەوانەی هاوڕای عەلی بوون و دەیانوت: با جارێك بارەکە هێور بێتەوە، ئینجا تۆڵە لە بکوژانی عوسمان بکرێتەوەو، ئەوانەش بەشێکی دیاری ناو هاوەڵان بوون، کە لە زنجیرەی ژیانی هاوەڵاندا لە باسی هەرکامیاندا، ئاماژەمان بەوانە داوە، کە هاوڕای عەلی بوون و لەناو سوپاکەیدا بەشداری (جەمەل) و (صفین) بوون.

**دەستەی سێیەم:** ئەوانە بوون، کە بەریەککەوتنی ئەو دوو ئیجتیهادەیان بینی، زانییان چ فیتنەیەکی لێدەکەوێتەوە، بۆیە خۆیان دوور گرت لە هەردوو ئیجتیهادەکەو، هیچ بەشداریەکیان نەبوو، بۆ نموونە:

ئیبن عومەر لە سەردەمی عەلی كوڕی ئەبوتاڵیبدا، بەشداری هیچ جەنگێكی نەكرد و خۆی دوور گرت، بەڵام دواتر لە دواییەكانی تەمەنیدا پەشیمانی دەردەبڕی، كە چۆن لەو جەنگانەدا، پشتیوانی عەلی كوڕی ئەبوتاڵیبی نەكرد؟![١]

كاتێك عەلی كوڕی ئەبوتاڵیب ویستی جەنگی شام بكات، چوو بۆ لای ئیبن عومەر و هانیدا، تا لەگەڵیدا بەشداری بكات.

ئیبن عومەر وتی: منیش وەك ئەو خەڵكەی ترم، بەڵام بۆ جەنگ ئەمساڵ ئامادە نیم بەشداری بكەم، دواتر ئیبن عومەر خۆی ئامادە كرد و چوو بەرەو مەككە.[٢]

جا پێش ئەوەی بچێت بۆ مەككە، عەلی كوڕی ئەبوتاڵیب بوو بەكەفیلی ئیبن عومەر، كەدژی ناوەستێت، دواتر ئیبن عومەر چوو بۆ لای ئومموكەلسومی كچی عەلی، كە هاوسەری عومەری كوڕی خەططاب بوو،پێی وت: كە دەچێت بۆ عومرە، هەروەها وتی: من تەواو گوێڕایەڵی (عەلی)م، جگە لە فەرمان كردنی بە جەنگ و ڕاپەڕین، دواتر وا هەواڵ بردرا بۆ عەلی، وتیان: ئەمشەو بارێكی سەختتر لەوەی خاتوعائیشەو طەلحەو زوبەیرو موعاویە ڕوویداوە!

وتی چی بووە؟!

وتیان: ئیبن عومەر چووە بۆشام، ئیتر بار شڵەژا.

كە ئوممو كەلسوم ئەوەی بیست، هات بۆ لای عەلی و بەسەرهاتەكەی بۆ باسكرد، عەلیش دەروونی ئارام بوویەوەو وتی: بڕۆن! بەخوا، نە من بەدرۆ كەوتمەوەو نەئەو درۆی كرد، بەخوا، من متمانەم زۆرە پێی.[٣]

حەكەمی كوڕی عەمری غیفاری، بڕیاریدا لەو فیتنەی پەیدا بووە، كەنار بگرێت، ئەوەبوو كاتێك عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب نێردراوێكی نارد بۆ لای.

---

(١) أسد الغابة، ج٣، ص ٣٤٩.

(٢) البداية و النهاية لابن كثير، ج٧، ص ٢٣١.

(٣) الكامل في التأريخ لابن أثير، ج٣، ص ١٠٠.

نێردراوەکە وتی: ئەمیری باوەڕداران پێت دەڵێت: تۆ لە هەموان شیاوتری، تا لەسەر ئەم مەسەلە هاوکارمان بیت.

حەکەمیش لە وەڵامی خەلیفەدا وتی: دەی ئەی ئەمیری باوەڕداران! من لە خۆشەویستم بیستووە، کە ئامۆزای تۆیە دەیفەرموو: (ئەگەر باری وا هات، شمشێرێکی تەختە دروست بکە).[١]

خوزەیمەی کوڕی ثابت لە فیتنەی نێوان هاوەڵاندا بەشداری نەکرد، بەڵکو شمشێرەکەی لە کالان نابوو، ئەوەبوو لە (جەمەل) دا هەرچەندە ئامادە بوو، بەڵام شمشێری لە کالان دەرنەکرد،[٢] بەڵام کاتێك لە جەنگی (صفین)دا بینی عەمماری کوڕی یاسر کوژرا، ئەو دەیوت: جەنگ ناکەم، تا بزانم کێ عەممار دەکوژێت، هەرکەس کوشتی، ئەوکات دەجەنگم، چونکە لە پێغەمبەرم بیستووە، دەیفەرموو: دەستەی باغی و سەرکەش عەممار دەکوژن، ئیتر کە عەممار کوژرا، خوزەیمە وتی: وا گومڕایی و نەپێکانم بۆ ڕوون بوویەوە، شمشێری لە کالان دەرکردو جەنگا تا کوژرا،[٣] واتە: خوزەیمە حوکمی عەلی پێ ڕەوا و دروست بوو و، لەناو ڕیزی سوپای ئەودا مایەوەو کوژرا.[٤]

ڕایەکی تری جیاواز و تایبەت، ڕای حەسەنی کوڕی بوو، کە لەلایەکەوە هەوڵی ڕاگرتنی جەنگەکانی باوکی دەدا و، لەلایەکی تریشەوە لە مەیدانەکەدا، تەنها جێی نەدەهێشت.

حەسەنی کوڕی عەلی بەیعەتی دا بە عەلی باوکی و لەگەڵیدا مایەوە، کاتێك سەربازگەکەی عەلی لە (ڕەبزە) بوو، تا بچن بۆ جەنگی دژ بە طەلحەو زوبەیر، پاش ئەوەی نوێژیان کرد، حەسەن چوو بۆ لای عەلی باوکی و لەلای

---

(١) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣٠٨٧، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٨٦٥، سكت عنه الذهبي في التلخيص.

(٢) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٥٩.

(٣) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٦٤١.

(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٧٨.

دانیشت، وتووێژێکی لەگەڵ باوکیدا کرد.

حەسەن وتی: باوکە! من شتێکم پێ وتیت و تۆیش بە قسەی منت نەکرد، سبەی بێ کەس دەکوژرێیت و کەس پشتت ناگرێ.

(عەلی)ش پێی وت: تۆ هێشتا لوشکەلوشکی کچانت هەیە، چیت پێ وتم و من بەگوێم نەکردیت؟

حەسەن وتی: ئەو ڕۆژەی گەمارۆی ماڵی عوسمان درا، داوام لێکردیت لە مەدینە بچیتە دەرەوە، تا کاتێك عوسمان کوژرا، تۆ لەناو مەدینەدا نەبیت، پاشان ئەو ڕۆژەی عوسمان کوژرا، پێم وتیت: بەیعەت لەکەس وەرنەگریت، تا وەفدی خەڵکی ناوچەکان و عەرەب و بەیعەتی هەموو میصرت بۆ بێت.

پاشان کاتێك ئەو دوانە بەزمی خۆیان کرد، پێم وتیت: لە ماڵی خۆتدا بمێنیتەوە، تا ڕێکدەکەون، ئەگەر خراپەی لێکەوتەوە ئەوە تۆی بەرنەدەکەوت، کەچی لە هەموو ئەمانەدا تۆ پێچەوانەی من جووڵایتەوە. (عەلی)ش وتی: کوڕی ئازیزم! سەبارەت بە دەرچوونم لە مەدینە کاتێك عوسمان گەمارۆ درابوو، دەی سوێند بەخوا، وەك چۆن ئەو گەمارۆ درابوو، منیش گەمارۆ درابووم، سەبارەت بەوەی بەیعەت وەرنەگرم، تا هەموو ناوچەکان بێن و بەیعەت بدەن، دەسەڵاتەکە هی مەدینە بوو، پێمان باش نەبوو ئەو دەسەڵاتە بفەوتێت، سەبارەت بەدەرچوونی طەلحەو زوبەیریش، ئەوە کەموکورتی و ترسنۆکی بوو بۆ موسڵمانان.

سوێند بەخوا، لەو کاتەوەی دەسەڵاتم وەرگرتووە، پشتم بەردراوە و ئەوەی پێویست بووە نەهاتۆتە ڕێم، سەبارەت بەوەی لە ماڵەوە دابنیشتایەم، ئەی چیم بکردایە بەوەی دەهات بۆ لام؟

تۆ ئەتویست من چۆن بم؟

دەتویست وەك ئەو جورجە بوومایە، کە گەمارۆ دەدرێت دباب دبابیەتی - بانگکردنی نێوان جورجەکان -.[1]

---

(١) تاریخ الطبري، ج٣، ص ١١.

بەڵام حەسەن، کە ئەمانەی بەباوکی دەوت، هاوکات ئامادەیی هەبوو، هەموو پشتگیریەکی باوکی بکات وەك خەلیفەیەك، کە بەیعەتی پێدابوو، بۆیە کاتێك عەلی داوای کرد، خەڵکی کوفە بێنە ناو ڕیزی سوپاکەی و ئەبوموسای ئەشعەریش خەڵکەکەی سارد دەکردەوە، تا نەچن، چونکە ئەوەی بە فیتنەیەك دەزانی، عەلی چەند کەسێکی نارد، تا خەڵکەکە ڕازی بکەن بێنە ناو سوپاکەی، بەڵام هیچکام ئەوەیان پێ نەکرا.

دواجار عەلی، حەسەنی کوڕی لەگەڵ عەممار‌دا نارد، ئەوەبوو حەسەن و عەلی چوونە مزگەوتی کوفەو، لەوێ ئەبو موسا، کە حەسەنی بینی، باوەشی پێداکرد.

حەسەن وتی: ئەی ئەبو موسا! بۆچی خەڵکمان لێدەتەکێنیتەوە؟ سوێند بەخوا، ئێمە تەنها خێرمان دەوێت و، کەسی وەك ئەمیری باوەڕدارانیش لەهیچ ناترسێت.

ئەبوموسا وتی: بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت، بم ڕاست دەکەیت، بەڵام ڕاوێژپێکراو دەبێت سپاردەکار بێت، من لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو :( فیتنەیەك ڕوودەدات، کە ئەوەی تیایدا دانیشتووە زۆر باشترە لەوەی تیایدا ڕاوەستاوە، ئەوەی تیایدا ڕاوەستاوە، زۆر باشترە لەوەی تیایدا ڕێ دەکات، ئەوەی تیایدا ڕێ دەکات، زۆر باشترە لەوەی تیایدا سوارە).

خوا ئێمەی کردۆتە برای یەك و ماڵ و خوێنی لەیەك حەڕام کردوین، ئینجا چەند ئایەتێکی خوێندەوە، عەممار، کە لەگەڵ حەسەن بوو، تووڕە بوو و هەستاو کەوتە قسەکردن لەناو خەڵکەکەدا، هەندێکیش وەڵامیان دایەوە..

دواتر حەسەن قسەی بۆ خەڵکەکە کرد و وتی: ئەی خەڵکینە! بێن بەدەم بانگەوازی ئەمیرەکەتانەوە بچن بۆ لای براکانتان، چونکە هەموو کەسێ دەبێت بچێت بەدەم ئەم بانگەوازەوە، سوێند بەخوا، ئەگەر کەسانی ژیر ئەم بارە بگرنە دەست، زۆر لەپێشتروباشترەبۆ داهاتووش،دەی وەرن بەدەم بانگەوازەکەمانەوەو لەو بارەدا، کە ئێمەو ئێوەش پێی تاقی دەکرێینەوە هاریکارمان بن، بەوە خەڵکەکە ڕازی بوون.[1]

---

(١) تاريخ الطبري، ج٣، ص ٢٦-٢٧.

## مەسەلەی دادوەریی

کاتێك عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب و موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، لەسەر دانانی دوو دادوەر ڕێککەوتن بۆ چارەسەری کێشەی نێوانیان و، پێدانی دەسەڵاتی تەواو پێیان، تا بڕیاری کۆتایی بدەن، موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، عەمری کوڕی عاصی ڕاسپارد، عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبیش ئەبو موسای ئەشعەری ڕاسپارد، هەرچەندە داوای لێکرا، کە ئیبن عەبباس بکات بە دادوەر، بەڵام لەلایەکەوە لەبەر فشاری یەمانییەکان و، لە لایەکی تریشەوە، لەبەر زانینی پلەوپایەی ئەبو موسا، خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب، ئەبو موسای بۆ ئەو ئەرکە ڕاسپارد، خەلیفە بەئەبو موسا و عەمری کوڕی عاصیشی وت: لەسەر بنەمای قورئان حوکم بدەن، قورئانیش پشتیوانی منە، ئەگەر بەپێی قورئان حوکم، نەدەن بڕیارتان بۆ نییە.[1]

لێرەدا گێڕانەوەیەکی باو و بڵاو سەبارەت بە دادوەرییەکە هەیە، کە زۆرێك لە سەرچاوەکان هێناویانەو کردوویانەبەبەڵگەیەك بۆ تانەدان لە هەریەك لە: ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص، دەستەیەکیش وەڵامی ئەو گێڕانەوەیان داوەتەوە، بە کورتی هەردوو ڕایەکە دەخەینەڕوو :

ئەبو موخنەف دەڵێت: ئەبوجونابی کەلبی بۆی گێڕامەوە: کاتێك عەمر و ئەبو موسا لە (دومەتولجەندەل) کۆبوونەوە، عەمر پێش ئەبو موسا قسەی کرد و وتی: تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوایت و لە من بەتەمەنتریت، تۆ قسە بکە، منیش

---

(١) أسد الغابة، ج٣، ص ٣٧٧.

دواتر قسە دەکەم، لە هەموو شتێکدا، عەمر ئەبو موسای پێشدەخست و بەوە خەڵەتاندی، تا پێشتر ئەو عەلی کەنار بخات.

دواتر عەمر ویستی موعاویە بهێڵێتەوە، بەڵام ئەبو موسا ڕازی نەبوو، ئینجا ویستی کوڕەکەی خۆی دابنێت، بەڵام ڕازی نەبوو، ئەبو موسایش ویستی عبداللەی کوڕی عومەر دابنێن، بەڵام عەمر ڕازی نەبوو.

عەمر وتی: ڕای خۆتم پێ بڵێ!

ئەبو موسا وتی: ڕام وایە: ئەم دوو پیاوە: (عەلی و موعاویە) لا ببەین و، مەسەلەکە بکەین بە شووڕای نێوان موسڵمانان و، موسڵمانان خۆیان بە حەزی خۆیان کەسێك هەڵبژێرن.

عەمر وتی: منیش هاوڕای تۆم، ئەوەبوو چوون بۆ لای خەڵکەکەو، ئەبو موسا پێشتر قسەی کرد و وتی: ڕای من و عەمر لەسەر یەك شتە، کە هیوامان وایە خوای گەورە بەو هۆیەوە، باری ئەم ئوممەتە ڕێك بخات. عەمر وتی: ئەبو موسا ڕاست دەڵێت، ئەبوموسای پێشخست.

ئیبن عەبباس بەئەبوموسای وت: ماڵوێران! وا دەزانم لەخشتەت دەبات، ئەگەر ئێوە لەسەر شتێك ڕێککەوتون، دەی تۆ ئەو پێش بخە، با ئەو قسەکەی بکات، ئینجا تۆ قسە بکە، چونکە عەمر کەسێکی ناپاکە...

ئەبوموسا سادە بوو پێی وت: ئێمە ڕێککەوتوین، بۆیە پێشکەوت و سوپاس و ستایشی خوای کرد، دواتر وتی: ئەی خەڵکینە! ئێمە تەماشای باری ئەم ئوممەتەمان کرد و باشترین شت بۆ ئەوە، کە ڕای من و عەمری لەسەرە ئەوەیە: عەلی و موعاویە لابەرین و، ئەم ئوممەتە ڕوویکەنە مەسەلەکەو خۆیان بە حەزی خۆیان کەسێك بکەنە ئەمیر.

وا من عەلی و موعاویەشم لابرد و، ئێوە خۆتان کەسێك بکەن بە ئەمیر، کە بە باشی دەزانن، دواتر ئەبو موسا کەناری گرت و عەمری کوڕی عاص هەستا و هاتە شوێنەکەی و، سوپاس و ستایشی خوای کرد و وتی: قسەکانی ئەوتان

بیست، کە هاوەڵەکەی خۆی لابرد، منیش وەك ئەو هاوەڵەکەی خۆی لادەبەم و، موعاویەی هاوەڵم دەهێڵمەوە، چونکە ئەو وەلی عوسمانی کوڕی عەففانەو، داواکاری خوێنی ئەوە و شیاوترین کەسە بە شوێنەکەی.

ئەبو موسا وتی: ئەوەچیتە؟ خوا مۆفەقت نەکات! ناپاکیت نواند و لاتدا، نموونەی تۆ، وەك سەگ وایە، عەمریش وتی: نموونەی تۆیش وەك کەر وایە، جا شورەیحی کوڕی هانی، هەڵیکوتایە سەر عەمر و بە قامچی لێیدا، کوڕێکی عەمریش هەڵیکوتایە سەر شورەیح و بە قامچی لێیدا، خەڵکی هەستان و جیایان کردنەوە.

جا شورەیح دواتر دەیوت: پەشیمانم لەوەی لە بری قامچیەکەم بە شمشێر نەمدا لە عەمر... ئیبن عەبباسیش دەیوت: خوا ئەبو موسا بێزراو بکات، خۆ من هۆشیارم کردەوە، کەچی وەرینەگرت.. جا عەمر و شامییەکان گەڕانەوە بۆ لای موعاویەو خیلافەتیان پێ سپارد و، ئیبن عەبباس و شورەیحیش گەڕانەوە بۆ لای عەلی، جا کە نوێژی بەیانی دەکرد، لە قنووتدا نزای دەکرد: خوایە نەفرینت بنێرە بۆ موعاویەو عەمر و ئەبولئەعوەری سولەمی و حەبیب و عبدالرحمنی کوڕی خالید و چەححاکی کوڕی قەیس و وەلید!

موعاویەش کە ئەوەی بیست لە هەموو قنوتێکدا دەستی دەکرد بە نەفرین کردنی عەلی و ئیبن عەبباس و ئەشتەر و حەسەن و حوسەین![1]

ئەم گێڕانەوەیە هی ئەبو موخنەفە، کە یەکێکە لەو شیعانەی،کە زۆرترین گێڕانەوەی دژ بە هاوەڵان و ئەهلی سوننە تۆمار کردووە، ناوەڕۆکی گێڕانەوەکەشی زۆر جێی گومانە و ئەم تۆمەتانەی لێدەکەوێتەوە:

**یەکەم:** بە گەمژەو نەفام دانانی ئەبو موسای ئەشعەری، لە کاتێکدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوی نارد بۆ یەمەن و بەرپرسیارێتی پێ سپارد.

---

(١) تأريخ الطبري، ج٣، ص ١١٣.

هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) یەکێك بوو لەو چوار کەسەی، کە فتوای دەدا، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططاب و عوسمانی کوڕی عەففانیشدا، والی و بەرپرس بوو.

**دووەم:** بە ناپاك دانانی عەمری کوڕی عاص، کە هاوەڵێکی ناسراوی پێغەمبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم)و پێدانی سیفەتی ناپاکیی پێی.

**سێیەم:** زمانی ئەبو موسا، هی قسەوتنی وا ناشیرین نەبوو، زمانی عەمریش هەروا، هاوکات زمانی عەلی کوڕی ئەبوتالیب، زمانی ئەو هەموو نەفرینە نییە لەو هەموو کەسە، ئەویش لەکاتی نوێژی بەیانیدا، هەروەك زمانی موعاویەش ئەو زمانە نەبوو.

**چوارەم:** ئەگەریش وابێت، خۆ مەرجی ڕازیبوون ئەوەیە: هەردوولا لەسەر یەك وتە ڕێککەوتبن، خۆ ئەبو موسا وتی: وا ڕێککەوتوین: هەردووکیان لابەرین، وا من عەلی و موعاویەشم لابرد، بۆیە ئەگەریش عەمر وایکردبێت، ئەوە کارەکەی سەرکەوتوو نەبووە.

بۆیە ئەم گێڕانەوەیە، زیاتر دەمارگیریی توندی مەزهەبی شیعەی پێوە دیارەو، زۆر دووبارەبوونەوەشی لە سەرچاوەکاندا، تەنها لەم بنەڕەتەوەیە، کە گێڕەرەوەکەی: ئەبو موخنەفی شیعەیە، خواش زاناترە بە ڕاستییەکان.

سەبارەت بە گێڕانەوەی دووەم، دەقی نووسینەکەی ئیبنولعەرەبی لە کتێبی (العواصم من القواصم) دادەنێین سەبارەت بە مەسەلەی تەحکیم (دادوەریی):

خەڵکی سەبارەت بە (تەحکیم)، حوکمیان داوەو شتانێکیان وتووە، کە خوا پێی ڕازی نییە، ئەگەر جیا لە ئاییندارێش بەچاوی پیاوەتییەوە تەماشای بکەیت، تێدەگەیت،کە لە نووسینەکاندا، بێماناییەك هەیە، کە زیاتر بێدینییەو کەمترین شت بیڵێین، دەڵێین: نەفامییەکی ڕوونە، ئەوەی لەو بارەوە ڕاستە ئەوەیە، کە پێشەوایانی وەك خەلیفە ئیبن خەییاگ و دارەقوگنی گێڕاویانەتەوە: کە کاتێك دەستەی عێراقی بە سەد هەزار و دەستەی شامی بە حەفتا، یان نەوەد هەزارەوە

دەرچوون و، لە (صفین) لای فورات دابەزین و لە ڕۆژی سێ شەممەو لە بەرەبەیانەوە جەنگان،کە خەڵکی عێراق بەسەریاندا سەرکەوتن.

دواتر ڕۆژی چوارشەممە لە حەوتی صەفەری ساڵی سی و حەوت، هەمدی جەنگان، تا ئەو کاتەی دوو کەس لە هەردوولا،بڕیاری دادوەرییان پێدرا، لە بەرەی (عەلی)یەوە پێنج شەممەو ڕۆژی هەینی و شەوی شەممە بوو، خەڵکی شام قورئانەکانیان بەرز کردنەوەو، داوای ڕێککەوتنیان کرد و هەموان بڵاوەیان لێکرد و لەسەر ئەوە ڕێککەوتن: هەر دەستەیەك باری خۆی بداتە دەست کەسێك، ئەبو موسا لە بەرەی عەلی و عەمری کوڕی عاص لە بەرەی موعاویەوە، ئەبو موسا کەسێکی زۆر خواناس و زانا و فیقهناس بوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاودەم بەموعاذ، ناردبووی بۆ یەمەن، عومەر پایەی پێدابوو و وەسفی تێگەیشتوویی کردووە، ئەو دەستە زیرە مێژوویيە وتەی ناڕاستە، کە ئەبو موسا بە گەمژەو ڕا لاواز و هەڵخەڵەتاو لە قسەدا وەسف دەکات، ئیبنولعاصیش بە زیرەك و لێزانی وا وەسف دەکات، کە بە نموونە باسکراوە و جەخت دەکەنەوە لەو ویستی خراپەی هەیبووەو، هەندێ نەفامیش شوێن ئەو ڕایە کەوتوون و چیرۆك و شتانێکی وایان سەبارەت بە ئەو و هاوەڵانی تریش نووسیوە. دەڵێن: کاتێك ئەوان لە (ئەژرەح) لە (دەومەتولجەندەل) کۆبوونەوە و دانوستانیان کرد و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی: هەردوو لا بەرپرسانیان لاببەن، عەمر بە ئەبوموسای وتووە: تۆ پێشتر قسە بکە، ئەویش پێشکەوت و وتی: من لە مەسەلەکە ورد بوومەوەو (عەلی)م لە پۆستەکەی لابرد، با موسڵمانان لەنێو خۆیاندا بڕیار بدەن، وەك چۆن شمشێرەکەشم لە گەردنم لابرد.

ئەوەبوو لایبرد و لەسەر زەوی دانا، عەمریش هەستا و شمشێرەکەی خستە سەر زەوی و وتی: من لە مەسەلەکە ڕامام و موعاویەم لە مەسەلەکەدا هێشتەوە و، ئەم شمشێرەشم لە گەرنمدا دەهێڵمەوە.

ئەبو موسا بەوە ناڕازی بوو و سەرکۆنەی کرد .

عەمریش وتی: وا ڕێککەوتین، خەڵکەکە بەو باری ناکۆکییە بڵاوەیان لێکرد، ئەمە درۆیەکی ڕاشکاوەو یەك پیتیشی لە ڕاستیدا ڕوونەداوەو داهێنەران و مێژوونووسانی پاشایان ئەمەیان داناوەو خەڵکیٚ، کە بە ئاشکرا لە فەرمانی خوا دەردەچن و بیدعە دەنوێنن، بە میراتی ئەو وتانەیان وەرگرتووە، ئەوەی چەسپاوەو زانایانی ڕاستبێژ گێڕاویانەتەوە ئەوەیە کاتێك ئەو دوانە کۆبوونەوە، تا لە مەسەلەکە ڕامێنن و دەستەیەکی ڕێزداری خەڵکیش ئامادە بوون لەوانە: ئیبن عومەر و هاوچەشنانی.

عەمریش موعاویەی کەنار خستووە، دارەقوگنی بەسەنەدی خۆی لە حوصەینی کوڕی مونژیرەوە هێناویەتی: کاتێك عەمر، موعاویەی کەنارخست، حوصەین چوو لە نزیك چادرەکەی موعاویەوە چادری هەڵدا، موعاویە، کە هەواڵی بیست ناردی بە شوێنیدا و وتی: بیستوومە عەمر ئاواو ئاوای وتووەو کردووە، جا بڕۆ بزانە ئەوە چییە من لە بارەیەوە بیستوومە؟

حوصەین دەڵیٚ: منیش چووم بۆ لای و وتم: باسی ئەو کارەم بۆ بکە، کە تۆو ئەبوموسا بۆی ڕاسپێردراون چیتان کرد؟

ئەویش وتی: خەڵکی قسەی خۆیان لەو بارەوە کرد، بەخوا، بارەکە وەك ئەوەی ئەوان نەبوو، بەڵکو من بە ئەبو موسام وت: ڕات لەم بارەیەوە چییە؟

ئەویش وتی: من پێم وایە دەسەڵات بۆ یەکێك لەو کەسانە بێت، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)وەفاتی کرد و لێیان ڕازی بوو.

منیش وتم: ئەدی من و موعاویە چی لێدەکەیت؟

وتی: پشتتان پیٚ ببەستێت، چونکە ئێوە پشتیوانیتان لەدەست دێت، حوصەین چوویەوە بۆ لای موعاویەو بەسەرهاتەکەی وەك خۆی بۆ گێڕایەوە، ئەویش ناردی بۆ لای ئەبیلئەعوەری ژەکوانی و بە سوارەکانییەوە ناردی، ئەویش چوو سواری ئەسپەکەی بوو، غاری دەدا و دەیوت: کوا دوژمنی خوا؟

کوا ئەو فاسقە؟

عەمر چوو بۆ لای ئەسپێکی لەژێر چادرەکەیدا و بێ زین هێنایە دەرەوە بەرەو لای چادرەکەی موعاویە غاری دەدا و دەیوت: ( إن الضجور قد تحتلب العلبة يا معاوية إن الضجور قد تحتلب العلبة. واتە: ئەی موعاویە! جار هەیە وشتری شیردەر سەتڵی شیرەکە پڕ دەکات، جار هەیە وشتری شیردەر سەتڵی شیرەکە پڕ دەکات.[1]

---

(١) العواصم من القواصم لابن العربي، ١٧٨-١٨١.

## موسڵمانبوونی موعاویە

سەبارەت بەکاتی موسڵمانبوونییەوە، ڕاجیایی هەیە، واقیدی دەڵێت: دواى ڕێککەوتنی حودەیبیە، موعاویە موسڵمان بوو، بەڵام موسڵمانبوونەکەی خۆی شاردەوە، تا لە فەتحی مەککەدا ئاشکرای کرد.[1]

ئیبن سەعد گێڕانەوەیەکی هێناوە، کە موعاویە دەڵێت: لە دوای ڕێککەوتنی حودەیبیە، ئیسلام لە دڵمدا چەسپاو ئەوەم بۆ دایکم باس کرد.

دایکم وتی: وریابە پێچەوانەی باوکت نەکەیت!

بۆیە موسڵمانبوونی خۆمم شاردەوە، سوێند بەخوا، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە حودەیبیە دەرچوو، من بڕوام پێ هێنابوو، کە بۆ عومرەی دوای حودەیبیە هاتە مەککە، من موسڵمان بووم و باوکیشم بە موسڵمانبوونی منی زانیبوو، ڕۆژێك پێی وتم: براکەت لە تۆ باشترە، چونکە لەسەر ئایینی منە، ئەوەبوو لە فەتحی مەککەدا موسڵمانبوونی خۆمم ئاشکرا کرد، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پێشوازی لێکردم و بووم بە نووسەری بەردەستی.[2]

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٥١.

(٢) سير أعلام النبلاء، ج ٣، ص ١٢٢.

بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا، کە لە موسلیمدا هاتووە: سەعد باس لە عومرەی پاش حودەیبیە دەکات و، دەڵێت: ئەوکات موعاویە بێباوەڕ بوو.[1]

جا (ئیبن حەجەر) دەڵێت: ئەگەر گێڕانەوەی یەکەم ڕاست بێت - کە دوای حودەیبیە موسڵمان بووە - لەوانەیە سەعد لەبەرئەوە وای وتبێت، کە ئاگادار نەبووە بەموسڵمانبوونی موعاویە، لەبەرئەوەی موعاویە موسڵمانبوونی خۆی - لەو ماوەدا - شاردبۆوە.[2]

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٢٢٢٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٩٨٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٠٨.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص ١٥١.

## پلەبەرزیی نێوان عەلی و موعاویە

سەبارەت بەوەی ئایا پلەوپایەی عەلی بەرزترە، یان پلەوپایەی موعاویە؟

ئەوا دەڵێین: بە دڵنیاییەوە پلەی عەلی بەرزترە، هەرچەندە هەردووکیان خوا بەڵێنی خێری پێداون، بەڵگەش بۆ ئەم بڕیارە بریتییە لە:

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب لە یەکەمین موسڵمانبووەکانە، لەکاتێکدا موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان، زۆر زوویش موسڵمان بووبێت، پاش ڕێککەوتنی حودەیبیە موسڵمان بووە.

عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب بەشداری کۆچی کردووەو، پاداشتی کۆچەرانی هەیە، بەڵام موعاویە لەوە بێبەش بوو.

عەلی بەشداری غەزای: (بەدر و ئوحود و خەندەق و بەیعەتی ریضوان و فەتحی مەککە) بوو، بەڵام موعاویە لە هەموو ئەوانە بێبەش بوو.

عەلی موژدەپێدراوی بەهەشتەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شایەتی بەهەشتی بۆ داوە، بەڵام موعاویە موژدەی بەهەشتی پێ نەدراوە.

جا پاش ئەم بەرچاو ڕوونیانە، فەرمایشتی خوا دەخەینەڕوو، تا بزانین خوا چ حوکمێك دەدات:

﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ ﴾. الحديد: ١٠.

واتە: (یەكسان نین لە ئێوە ئەوانەتان، كە پێش فەتحی مەككە بەخشیتان و جەنگتان كرد، ئەوانە پاداشتیان زۆر گەورەترە لەوانەی دوای فەتحی مەككە بەخشییان و جەنگیان كرد، هەمووشیان - هەموو هاوەڵان

- خوا بەڵێنی چاكەی پێداون، خواش زانا و ئاگادارە بەوەی دەیكەن).

بەمجۆرە دڵنیا دەبینەوە، پلەوپایەی عەلی بە چەندین جار لە موعاویە زیاترە، هاوكات موعاویەش پلەوپایەی تایبەتی خۆی هەیە.

## ڕێککەوتنی حەسەن و موعاویە

حەسەنی کوڕی عەلی، بڕیاریدا لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا ڕێکبکەوێت، جا هەر دەستەیەك و باس لە هۆکارێك دەکەن بۆ ئەو ڕێککەوتنە.

ئەمەشی لە ناچاریی و لاوازیدا نەکرد، بەڵکو تەنها لەپێناو کوژاندنەوەی فیتنەو ڕێکخستنی نێوان دوو دەستەی موسڵمانانندا بوو، وەك چۆن پێغەمبەر لە فەرموودەیەکدا ئاماژەی بەوە دابوو: حەسەن کارێکی وا دەکات، ئەبی بەکرە دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەر حەسەنی هێنا و لەگەڵ خۆی بردیە سەر مینبەر و فەرمووی: (ابني هذا سيد و لعل الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين[1]. واتە: ئەم کوڕەم سەییدەو هیوام وایە خوای گەورە بەهۆیەوە، نێوانی دوو دەستەی موسڵمانان ڕێکبخات).

عبداللەی کوڕی جەعفەر دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلی وتی: ڕایەکم هەیە حەز دەکەم تۆیش شوێنم بکەویت، وتم چییە؟

وتی: دەمەوێت بچمەوە مەدینەو لەوێ دابنیشم و دەسەڵات جێبهێڵم بۆ موعاویە، چونکە فیتنە هەر ناکوژێتەوەو خوێن زۆر ڕژاوە و ڕێ بڕاوە.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٥٠ و اللفظ له، سنن أبي داود، الرقم ٤٠٦٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٦٩٩، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١١١٤٠، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٩٨٩١.

هاوکات سەری حوسەینیش نێردرا بۆ یەزید،[1] ئەویش بە دارێکی دەستی سەری دەجووڵاند و دارەکەی دەدا لە دەمی حوسەین، ئەبو بورزە لەوێ بوو وتی: ئەو دارەت لابەرە، من پێغەمبەری خوام بینی دەمی لە سەر دەمی حوسەین دانابوو،[2] بەڵام ئیبن کەثیر دەڵێت: ڕا و بەڵگەی دروست ئەوەیە، کە سەری حوسەین نەنێردرا بۆ شام.[3]

ڕاستی ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێت، کە ئیبنو تەیمییە باسی دەکات و دەڵێت: ئەو ڕووداوە بۆ یەزید ڕاستی نییە، چونکە ئەو کاتە ئەبو بورزە لە عێراق بووە، نەك لە شام.[4]

ئیبنو تەیمییە دەڵێت: ئەوەی سەری براوە بۆ لای ئیبن زیاد دروستە، بەڵام ئەوەی سەری برابێت بۆ لای یەزید ئەوە درۆی تێدایە و سەنەدی دروستی لەسەر نییە، بەڵکو هەموویان سەنەدیان مونقەتیعە.[5]

فاتیمە دەڵێت: کە چووین بۆ لای یەزید، لە بەردەم خۆی داینیشاندین و نەرمی و سۆزی بەرامبەر نواندین و فەرمانی کرد شتمان بۆ هێنرا، دواتر یەزید وتی: ئەی نوعمانی کوڕی بەشیر! چییان پێویستە بۆیان دابین بکەو، کەسێکی پاك و دڵنیاو خواناس بنێرە لەگەڵیان و، دەستەیەکی سوارەش بنێرە لەگەڵیان، تا بیانبەنەوە بۆ مەدینە، لەو ماوەی پێش چوونیان، یەزید هەرکات نانی بخواردایە، بەیانی و ئێوارە عەلی کوڕی حوسەینی بانگ دەکرد بۆ لای خۆی، تا لەگەڵیدا نان بخوات، دواتر کە ویستیان بچن، یەزید،عەلی بانگ کرد و وتی: نەفرەت لە (کوڕی مەرجانە)، سوێند بەخوا، ئەگەر من لای حوسەین بومایە، چی داوا بکردایە قبوولم دەکرد و ڕێگریم دەکرد لە لەناوچوونی، با تەنانەت

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١.

(٢) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٩.

(٣) البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ١٦٥.

(٤) كتب و رسائل و فتاوى ابن تيمية في الفقه، ج٢٧، ص ٤٧٠.

(٥) مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٢٧، ص ٤٧٨.

پێویستی بکردایە لەو پێناوەدا منداڵەکانیشم لەناوبچن، بەڵام ئەوە قەزای خوا بوو و ڕوویدا.[١]

ئەوانە بران بۆ لای یەزید، سەکینە پێی وت: ئەی یەزید! دەتەوێت کچەزاکانی پێغەمبەر بە کەنیزەك بگیرێن؟

ئەویش وتی: برازا! بەخوا من زۆر زیاتر لە تۆ بەم بارە دڵگرانم، سوێند بەخوا، ئەگەر نەکوشتنی حوسەین بەند بوایە بە لەدەستدانی هەندێ لە تەمەنم، پێم خۆش بوو ئەو تەمەنەم لەدەست بدەم، لە بری کوژرانی حوسەین.[٢]

ئینجا سەیری عەلی ئەصغەری کرد و وتی: باوکت دژایەتی دەسەڵاتی کردم، کابرایەك لەولاوە هەستاو وتی: کچەکانیان حەڵاڵن بۆمان، عەلی وتی: درۆ دەکەیت، مەگەر ئەوەی بێباوەڕ بیت ئینجا، یەزید فەرمانی کرد ژنەکان بران بۆ ناو ژن و منداڵەکانی خۆی، ئینجا سێ ڕۆژ پرسە گێڕدرا بۆ حوسەین.[٣]

دواتر یەزید فەرمانی کرد: بارگەو کەلوپەل پێچرایەوە بۆیان و بەرەو مەدینە بەڕێکران،[٤] هەروەها سەری حوسەینی نارد بۆ والی مەدینەو، لە پاڵ فاتیمەی دایکی و حەسەنی برایدا، سەری ئەسپەردە کرا.[٥]

ڕایەکی تر دەڵێت: بەڵکو سەری حوسەین لە دیمەشق ئەسپەردە کراوە.[٦]

ئەوەی من لە گێڕانەوەکانی پەیوەست بە هەڵوێستی یەزیدو، ناردنی سەری حوسەینەوە دەیبینم، لەم چەند خاڵەدا دەیخەمەڕوو:

---

(١) تاريخ الطبري، ج٣، ص ٣٤٠.

(٢) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣.

(٣) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣٠٣- ٣٠٤.

(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١.

(٥) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٣١٥.

(٦) المنتظم لابن الجوزي، ج٥، ص ٣٤٤.

**یەکەم:** یەزید تەنها زمانی بەکاردەهێنا بۆ دڵنەوایی کەسوکاری حوسەین، ئیتر ئایا بۆ ڕازیکردنیان بوویێت، تا هەستی خەڵك زیاتر نەورووژێت، یان پەشیمان بوویێت و بەو جۆرە دەربیرِیبێت، یان بە بینینی دیمەنی جەرگبڕانەی ئەو دەستە ژن و منداڵانە هەستی جووڵابێت و ڕای گۆڕابێت، بەڵام ئەوە تەنها سوودی بریتی بوو لە نەڕشتنی خوێنی ئەو ژن و منداڵانەو، زیاترنەکردنی خوێن ڕێژیی، ئەگەرنا هیچ هەڵوێستێکی جددی نەنواند بۆ ڕاستی پەشیمانی و، حەزنەکردنی بەو کارەی، چونکە نەسزای بکوژانیدا، نە پەندی لەو ڕووداوە وەرگرت، ئەوەبوو دوای ئەوەش کوشتاری تری هاوەڵانی کرد، نە قەرەبووی بەرچاوی بنەماڵەی حوسەینی کرد.

**دووەم:** هەرچەندە یەزید ستەمکار بووەو خراپەی زۆر بووە، بەڵام ئەوەی دەوترێت: سەری حوسەینی بۆ براوەو بە دارێك یاری پێکردووە، ئەمە ڕاست نییە، چونکە هەم ئەو پێویستی نەبووە بەو سەرە، ئەگەریش نێردرابێت، یەزید ژمارەیەکی بەرچاوی هاوەڵانی لە دەوروبەر بوو، دەیزانی حوسەین چەندە خۆشەویستە لای خەڵك، ئەگەر تەنها بۆ ڕاگرتنی هەستی دەوروبەرو کۆمەڵگەکەش بوویێت، خۆی دوورگرتووە لە سووکایەتی کردن بە سەری براوی ڕەیحانەکەی پێغەمبەر، نەك لەبەر چاکی خۆی، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو هەڵوێستە بۆ ئەو، تەنها هەست وورووژاندنی خەڵکی لێدەکەوتەوە، خواش زاناترە، کە دەشگونجێت شتی وا ڕوویدابێت، بەڵام ناڕوونییەك لە گێڕانەوەکاندا هەن.

## تاوانبارانی خوێنی حوسەین کێ بوون؟

**گرنگترین ئەو کەسانەی تاوانبار بوون لە شەهیدبوونی حوسەیندا بریتی بوون لە:**

**یەکەم:** شیمر.

**دووەم:** عبیداللەی کوڕی زیاد، کە باوکی عەرەب و دایکیشی فارس بوو، ناوی مەرجانە بوو و لە کچانی گەورە بەرپرسانی پێشووی فارسەکان بوو.[1]

**سێیەم:** عەمری کوڕی سەعد، کە سەرەتا نیازی شەڕکردنی نەبوو، بەڵام ترساندن و خەڵاتبەخشی ئیبن زیاد، کردیە بەشداری کاری جەنگەکە.

**چوارەم:** هەموو سەربازانی بەشداربووی ناو ئەو جەنگە، بەتایبەت بکوژە ڕەسمییەکانی، کە بریتی بوون لە: (حوصەینی کوڕی تەمیم، زورعەی تەمیمی، سینانی نەخەعی، خەولی ئەصبەحی).

**پێنجەم:** یەزیدی کوڕی موعاویە (خوا لێی ڕازی نەبێت)، کە بێدەنگییەکی گەورەی نواند لە ئاست هاتنی حوسەیندا، دەبوو خۆی بڕۆیشتایە، چونکە ئەوە ڕەیحانەی پێغەمبەر بوو، هەروەها دوای شەهیدبوونیشی، هیچ سزایەکی بکوژانی نەدا.

**شەشەم:** ئەو هەموو ناپاکانەی ناو کوفە، کە نزیکەی هەژدە هەزار کەس دەبوون و بەیعەتیان دابوو بە حوسەین، دواتر پشتیان تێکرد!

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ٥٩٥.

## چەند ڕایەك سەبارەت بە شەهید بوونی حوسەین:

ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێت: ئەگەر من لەناو ئەو سوپایەدا بوومایە، کە حوسەینی کوشت و دواتریش بچوومایەتە بەهەشتەوە، لەوێ شەرمم دەکرد سەیری ناوچاوانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەم.[1]

ئیبنوتەیمییە دەڵێت: وەك چۆن کوژرانی عوسمان بوویە هۆیەکی گەورەی کەوتنەوەی ئاشووب، هەرواش کوژرانی حوسەین، ئاشووبی نێوان خەڵکی لێکەوتەوە.[2]

هەروەها ئیبنوتەیمییەسەبارەت بە یەزید دەڵێت: ئەو نەفەرمانی کرد بە کوژرانی حوسەین و، نەبە کوژرانیشی خۆشحاڵی دەربڕی، هەروەها ئەوەی هاتووە بەدارێك گەمەی بە لێوەکانی کردبێت، ڕاست نییە، هەروەها سەری حوسەینیش نەبرا بۆ شام.[3]

پرسیار لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرا: ئایا یەزیدت خۆش دەوێت؟

ئەویش وتی: جا کەس هەیە بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت و یەزیدی خۆش بوێت؟

وترا: ئەی ئیتر بۆچی نەفرینی لێ ناکەیت؟ ئەویش وتی: - بە کوڕەکەی- مەگەر تا ئێستا دیوتە باوکت نەفرین لە کەس بکات؟[4]

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٨١.

(٢) إقامة الدليل على إبطال التحليل لابن تيمية، ج٤، ص ٢٠١.

(٣) مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٣، ص ٤١١.

(٤) مجموع الفتاوى، ج٢٧، ص ٤٧٨.

ذەهەبی دەڵێت: یەزید یەکێکە لەوانەی، کە نە قسەی پێ دەڵێین و نە خۆشمان دەوێت.[١]

ئیبن کەثیر دەڵێت: پێویستە هەموو موسڵمانێك دڵگران بێت بە کوژرانی حوسەین (ڕەزای خوای لێبێت) چونکە لە گەورانی موسڵمانان و زانایانی ناو هاوەڵان و کچەزیانی پێغەمبەر بووە، خواناس و خاوەن سەخاوەت بووە، بەڵام ئەو خەفەت و خۆئازاردانەی شیعە بۆی دەکەن باش نییە، کە لەوانەیە زۆربەی تەنها خۆنواندن و ڕووپامایی بێت.[٢]

ئەهلی سوننە لەبەر بوونی تاوان، کەسێك کافر ناکەن، واتە: یەزید بە کافر نازانن، لەبەر ئەوەی کوفری ڕوونی لێ نەبینراوە، لەسەر تاوانەکانیشی، کە کردوویەتی ڕقیان لێیەتی.[٣]

سەبارەت بەوانەش کە حوسەینیان کوشت، ئیبنوتەیمییە دەڵێت: لە خراپترین دروستکراوانی خوا بوون.[٤]

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج٤، ص ٣٦.

(٢) البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٢٠٣.

(٣) مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٢٧، ص ٤٧٨.

(٤) مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٣، ص ٤١١.

## مونافیق بوونی
## حارثی کوڕی سوەید

حارثی کوڕی سوەیدی کوڕی صامت، لە پشتیوانانە لە ئەوسییەکان.[١]

حارث لە غەزای بەدردا بەشدار بوو.[٢]

حارثی کوڕی سوەید باوەڕی هێنا و دواتر هەڵگەڕایەوە، دواتر کەسێك خۆی گەیاند بە حارث و ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: (كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ ...) ئەویش وتی: بەخوا ڕاست دەکەیت، خواش ڕاستگۆترینە، بۆیە موسڵمان بوویەوەو گەڕایەوە، دواتر لە غەزای (ئوحود)دا بکوژەکەی باوکی بینی و کوشتی، پێغەمبەر سزای ئیسلامی بەسەردا جێبەجێ کرد و کوشتییەوە، چونکە ئەو کەسە پێش هاتنی ئیسلام، باوکی حارثی کوشتبوو.[٣]

طەبەری دەڵێت: هەندێ دەڵێن: ئەم ئایەتە سەبارەت بە حارثی کوڕی سوەید دابەزیوە:

﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَـٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٦.

(٢) تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٢٨.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٧٦-٥٧٧.

ﭐلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾. ال عمران ٨٦-٨٩)

بۆیە حارث، کە مورتەد بوویەوە، دواتر هەواڵی نارد بۆ هۆزەکەی وتی: بەپێغەمبەر بڵێن: بزانن تەوبەم بۆ هەیە؟ ئەوەبوو ئەو ئایەتە دابەزی، هۆزەکەی بەکەسێکدا ئەو ئایەتەیان بۆ نارد، ئەویش هەمدی موسڵمان بوو.[١]

موجەذەری کوڕی زیاد لە سەردەمی نەفامیدا لە جەنگی (بوعاث)دا، سوەیدی کوڕی صامتی کوشت، دواتر موجژەر موسڵمان بوو، لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد، حارثی کوڕی سوەیدیش لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو، حارث دەمێك بوو بۆ دەرفەت دەگەڕا، تا موجژەری دەست بکەوێت و بیکوژێت، بۆیە کە لەوێ ئەوی دەست کەوت، لە پشتەوە چوو بۆی و کوشتی، ئەوەبوو جبریل (سەلامی خوای لێبێت) هەواڵی دا بە پێغەمبەری خوا، کە حارث، موجەذەری کوشتووەو فەرمانی کرد بکوژرێتەوە.

پێغەمبەر فەرمانی کرد: حارث بکوژرێتەوە، بە فەرمانی پێغەمبەر، عوەیمی کوڕی ساعیدە لەبەردەرگای مزگەوتی( قوباء )دا حارثی کوشت.[٢]

کاتێك جبریل فەرمانی کرد بە کوشتنی حارث، پێغەمبەر سواری وشترەکەی بوو و هات بۆ لای مزگەوتی (قوبا)، حارث هات بۆ لای، پێغەمبەر، کە حارثی بینی، عوەیمی کوڕی ساعیدەی بانگ کرد و فەرمووی بەرامبەر بە کوشتنی مجژەر، بدە لە گەردنی حارث.

حارثیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! سوێند بە خوا، من لەبەر هەڵگەڕانەوەم لە ئیسلام ئەوم نەکوشتووە، بەڵکو لەبەر دەمارگیریی کوشتم، من دەگەڕێمەوە بۆ لای خواو خوێن باییەکەشی دەدەم و ڕۆژوو دەگرم و کۆیلە ئازاد دەکەم، دەستیشی گرتبوو بە سوارەکەی پێغەمبەرەوە، تا هەموو قسەکانی تەواو کرد،

---

(١) تفسير الطبري، ج٣، ص ٣٣٩-٣٤٠.

(٢) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٥٢.

ئینجا پێغەمبەر فەرمووی: ئەی عومیم! بیبە بدە لە گەردنی، ئەویش بردی و لەبەر دەرگای مزگەوتدا، دای لە گەردنی.[١]

**سەبارەت بە حارث دوو ڕای جیاواز هەیە:**

ذهەبی دەڵێت: دەستەیەك لە ئەوسی و خەزرەجییەکان، لەبەر هۆزەکانیان بەڕووکەش موسڵمان بوون، بەڵام دووڕوو بوون، لەوانەش: حارثی کوڕی سوەیدی کوڕی صامت بوو.[٢]

بەڵام (طەبەری) گێڕانەویەکی هێناوە، کە کاتێك حارث تەوبەی کردووە موسڵمان بووەتەوەو، بە چاکیش موسڵمان بووە.[٣]

لێرەدا پرسیارێك دەکرێت: ئایا حارثی کوڕی سوەید مەرجی هاوەڵبوونی تێدایە؟ چونکە جارێك مورتەد بوەتەوەو لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوایش کوژراوە.

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

مەرجی هاوەڵبوون ئەوەیە: کەسێك پێغەمبەری خوای بە واقیعی دیبێت و باوەڕی پێ هێنابێت و لەسەر ئەوەش مردبێت، بۆیە ئەگەریش مورتەد بوویەوەو باوەڕی هێنایەوەو، پێغەمبەری خوای بینییەوەو بە باوەڕداری مرد، ئەوە هیچ خیلافێك نییە لە هاوەڵبوونی.

سەبارەت بەوەی لەسەر فەرمانی پێغەمبەر کوژراوە، ئەمە نابێتە بەڵگەی بێباوەڕبوونی، بەڵکو حەددێکی ئیسلامی بەسەردا جێبەجێ کراوە، کە کوژرانەوەیە لەبری کوشتنی کەسێك، چونکە دەبینین ئافرەت هەبووە، لەسەر زینا ڕەجم کراوە، لەکاتێکدا پێغەمبەر شایەتی داوە بۆ تەوبەکردنی و وەرگیرانی تەوبەکەشی.

---

(١) تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٢٨.

(٢) تاريخ الإسلام، ج٢، ص ٣٨.

(٣) تفسير الطبري، ج٣، ص ٣٤٠.

ئەوەی (ذەهەبی) دەڵێت: لە مونافیقان بووە، ئەومیان پێویستی بە بەڵگە هەیە، ئەگەر بچەسپێت ئەوەکار لە مەرجی هاوەڵبوونی دەکات، چونکە دوو ڕوان لە هاوەڵان نین!

**بەڵام ئەمەش بەڵگەی لەسەر نییە، بەڵکو بەڵگەی هاوەڵبوونی زیاترە:**

**یەکەم:** (ذەهەبی) خۆی هێناویەتی، کە حارث لە غەزای (بەدر)دا بەشداری کردووە، جا ئێمە پێشتر باسمان کردووە، کە بەشداربوانی (بەدر) چ تایبەتمەندییەکیان هەیە؟

**دووەم:** (طەبەری) دەڵێت: کە تەوبەی کردووە، زۆر بە چاکی تەوبەی کردووە.

**سێیەم:** حارث، خۆی لە پێش جێبەجێکردنی حەد بەسەریدا، بە پێغەمبەری خوای وت: (ئەی پێغەمبەری خوا! سوێند بەخوا، من لەبەر هەڵگەڕانەوەم لە ئیسلام ئەوم نەکوشتووە، بەڵکو لەبەر دەمارگیری کوشتم، وە من دەگەڕێمەوە بۆ لای خواو خوێن بابیەکەشی دەدەم و ڕۆژوو دەگرم و کۆیلە ئازاد دەکەم).[١]

---

(١) تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٢٨.

## ئایا حەسسان ترسنۆك بووە؟

(ئیبن حەجەر) دەڵێت: حەسسان لەگەڵ ئەوەی شاعیرێکی وا گەورە بوو، بەڵام ترسنۆك بوو![1]

لەوانەیە بەڵگەی (ئیبن حەجەر) بۆ بە ترسنۆك دانانی حەسسان، ئەم گێڕانەوەیە بێت: ((صەفییەی کچی عەبدولموطەلیب دەڵێت: لە قەڵاکەی حەسساندا بووین، حەسسانیش لەگەڵمان بوو، ئێمەش چەند ژن و منداڵ بووین، ئەمەش لەو کاتەدا بوو، کە خەندەق لێدرابوو.

کابرایەکی جوولەکە دای بە لاماندا و بە دەوری قەڵاکەدا دەگەڕا، منیش بە حەسسانم وت: ئەو جوولەکەیە لە دەوری قەڵاکەیە و من لێی دڵنیا نیم، کێ دەڵێت: بۆ ئابڕوومان ناگەڕێت و نایەوێت ڕێیەك بدۆزێتەوە؟!

خۆ پێغەمبەر و هاوەڵان سەرقاڵن و دەرفەتیان نییە ئاگادارمان بن، دەی تۆ بڕۆ بیکوژە!

ئەویش وتی: خوا لێت خۆش بێ ئەی کچی عەبدولموطەلیب، بەخوا دەزانیت من هی ئەو ئیشە نیم، صەفییەش، کە هیچی بەدی نەکرد، دارێکی داکوتراوی ناو قەڵاکەی هەڵگرت و لە قەڵاکە دابەزی و، کەوتە لێدانی جوولەکەکە، تا کوشتی، ئینجا گەڕایەوە بۆ قەڵاکە.

صەفییە دەڵێت: ئینجا، کە هاتمەوە بە حەسسانم وت: دابەزەو چەك و بەرگە سەربازییەکەی لێ دامالە، خۆم بۆیە لام نەبرد، چونکە پیاو بوو.

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦٣.

حەسسانیش وتی: هیچ پێویستم بەو شتانەی نییە.[١]

ئەم گێڕانەوەیە،سەنەدەکەی زەعیفەو ڕاست نییە.[٢]

هەروەها (ذەهەبی) دەڵێت: ئیبن سەعد لە (واقیدی)یەوە هێناویەتی دەڵێت: حەسسان لەگەڵ پێغەمبەر، بەشداری هیچ غەزایەکی نەکرد، چونکە کەسێکی ترسنۆك بوو.[٣]

بەڵام بەرگری لێدەکات و دەڵێت: بەپێی ئەم بەڵگەیە دەسەلمێت، کە حەسسان بەشداری غەزای کردووە:

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: بە ئیبن عەبباس وترا: وا حەسسانی نەفرەتی هات!

ئەویش وتی: ئەو نەفرەتی نییە، ئەو بە گیان و زمانی لەگەڵ پێغەمبەر جیهادی کردووە.[٤]

ئیبنولکەلبی دەڵێت: حەسسان کەسێکی دلێر و نەبەرد بوو، بەڵام حاڵێکی تووش بوو، ئیتر بەو هۆیەوە ترسێکی تێدا پەیدا بوو.[٥]

هەروەها گەر حەسسان بە ترسنۆك ناسرابا،ئەوا دوژمنانی و ناحەزانی بەم سیفەتە لەکەداریان دەکردو تانەیان لێدەدا،بەتایبەتی ئەوانەی،کەحەسسان بەشیعر هێرشی دەکردەسەر!

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٩٣٣، قال الذهبي عن سنده: عروة لم يدرك صفية.

(٢) (غزوة الاحزاب) د.ابوفارس، (السيرة النبوية - عرض وقائع وتحليل احداث)د. على محمد الصلابى،ج٢،ص٢٨٩.

(٣) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٢.

(٤) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٨.

(٥) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥٢١.

## حەسسان و هەڵەیەکی زەق :

حەسسان یەکێك بوو لەو کەسانەی لە مەسەلەی (ئیفك)دا تێکەوت، مەسەلەی (ئیفك)یش ئەو بوختانە بوو، کە کرا بۆ عائیشەی دایکی باوەڕداران، گوایە: تووشی زینا بووە، ئەوەبوو چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر، بە هەڵە کەوتنە ژێر کاریگەری دوو ڕوان و کەوتنە ئەو هەڵەوە، ئەوانیش بریتی بوون لە: (حەسسانی کوڕی ثابتی شاعیری پێغەمبەر و میسطەح و حەمنە)، خوای گەورە لەو بارەوە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە.

سەبارەت بە تاوانباربوونی ئەو سێ هاوەڵەی بەشداری ئەو بوختانە بوو، لەو مەسەلەدا نابێتە بەڵگەی ئەوەی، کە لە هاوەڵبوون دەربچن، چونکە هەرکام لەوانە لای پێغەمبەر، پایەی تایبەتیان هەبووە، بۆ نموونە: پێغەمبەر بە حەسسانی کوڕی ثابتی فەرمووە: هێرش بکەرە سەر بێباوەڕان - بە شیعر - چونکە جبریل لەگەڵتدایە.[1]

هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) لە مزگەوتی مەدینەدا مینبەرێکی دانابوو بۆ حەسسان،کە حەسسان لەسەری دەوەستا و بە شیعر بەرگری لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکرد، پێغەمبەریش دەیفەرموو: (إن الله يدافع حسان بروح القدس ما ينافح عن رسول الله[2].

واتە: خوای گەورە بە روحولقودوس(جبریل) پاڵپشتی حەسسان دەکات، تا کاتێك بەردەوام بێت لە بەرگری کردن لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)).

---

(١) البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص١٣١.

(٢) سنن الترمذي، الرقم ٢٨٤٧، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٢٥٤٨٤، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٠٦٣، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٨٨٠، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٢٨٤٦، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره، صححه الذهبي في التلخيص.

هەروەها حەسسان لە فەتحی مەککەدا لەلایەن پێغەمبەری خواوە پشتگیری کراوە، تا بە شیعر بەرگری لە ئیسلام بکات و پێغەمبەر نزای خێری بۆ کردوە، ئەوەتا جەنابی کیلابی، کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە و لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە، دەڵێت: بیستم پێغەمبەری خوایش بە کەسێکی رەبعەی دەفەرموو: (جبرەئیل لە ڕاستمەوەیەو میکائلیش لە چەپمەوەیەو فریشتەکانیش سێبەریان کردووە بۆ سەربازگەکەم، دەی شتێ لە وتەی - شیعری - خۆت بڵێ)، کابراش شیعرێکی وتز

منیش وتم: ئەرێ ئەو شاعیرە کێ بوو؟

وترا: حەسسانە، بینیم پێغەمبەری خوا نزای بۆ دەکردو فەرمایشتی خێری دەفەرموو.[١]

## کۆچ نەکردنی حەمنەنی کوڕی عەوف :

حەمنەنی کوڕی عەوفی کوڕی عەبدعەوفی قوڕەیشی،[٢] هەرچەندە موسڵمان بووبوو، بەڵام کۆچی نەکرد بۆ مەدینەو، نەچووە مەدینەو هەر لە مەککە مایەوە، تەمەنێکی دوورودرێژی هەبوو، نزیکەی سەد و بیست ساڵ ژیا، نیوەی تەمەنی لە سەردەمی نەفامیدا بەسەر برد و، نیوەکەی تریشی لە موسڵمانێتیدا بەسەربرد،[٣] حەمنەن هەر لە مەککە مایەوەو جێی نەهێشت، تا کۆچی دوایی کرد.[٤]

دیارە ئەمە نابێتە ڕەخنە بۆ حەمنەن، کە بۆچی کۆچی بەرەو مەدینە نەکردووە؟ چونکە حەمنەن تەمەنێکی زۆری کردبوو، ئەوەتا تەنها لە سەردەمی

---

(١) أسد الغابة، ج١، ص ٤٣٥.

(٢) أسد الغابة، ج٢، ص ٧٦.

(٣) أسد الغابة، ج٢، ص ٧٦.

(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ١٢٦.

نەفامیدا، نزیکەی شەست ساڵ ژیاوە، ئەمەش واتە: کاتێك کۆچی هاوەڵان بەرەو مەدینە دەستی پێکرد، حەمنەن لە تەمەنی پیریدا بوو، خوای گەورەش باسی ئەو موسڵمانانە دەکات، کە لە مەککە مابوونەوەو لاواز و بێتوانا بوون:

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾ النساء: ٧٥

واتە: ئەوە چیتانە (بەچ بیانوویەك) جەنگ ناکەن لە پێناوی خوادا و لە پێناوی چەوساوەکان لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان ئەوانەی کە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ڕزگارمان کەی لەم شارە، کە خەڵکەکەی ستەمکارن و، لەلایەن خۆتەوە دڵسۆزێکمان بۆ بەدی بهێنە و، لەلایەن خۆتەوە یارمەتی دەرێك بەدی بهێنە بۆمان).

ئیبن کەثیر دەڵێت: ئەوە بیانوو هێنانەوەیەکە، کە خوا دایناوە بۆ ئەوانەی کۆچیان نەکرد، چونکە نەیاندەتوانی لە دەست بێباوەڕان رزگاریان بێت.[1]

سەبارەت بەوەی بۆچی دواتر کۆچی نەکردووە بۆ مەدینە؟ دەی لەو بارەوە هەم بەڵگەی نەقڵی ڕوون هەیە، کە پێغەمبەری خوا بە هەموانی گەیاند، دوای فەتحی مەککە کۆچکردن لە مەککەوە بەرەو مەدینە نەما، هەروەها جگە لەوەش، کە واجب نەبوو، هاوکات تەمەنی (حەمنەن) ڕوو لە زیادبوون دەچوو و زیاتر پیر دەبوو، جگە لەوەی هۆکارێکیش نەمابوو بۆ جێهێشتنی مەککە، چونکە ئیتر مەککەش بەشێك بوو لە دەوڵەتی ئیسلامی.

سەبارەت بەوەی، ئایا (حەمنەن) وەك سەردانیش چووەتە مەدینە، یان نا؟ هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە، واتە: ئەوەی دەڵێت: مەککەی جێنەهێشت، تا لەوێ مرد، مەبەست ئەوەیە، کە حاڵ و ماڵی خۆی لە مەککە هێشتەوەو لەوێ ژیا، تا ڕۆژی مەرگی.

---

(١) تفسير ابن كثير، ج١، ص ٥٤٣.

## دنیاویستی هاوەڵان
## لە نموونەی ئمروئولەقیسدا

ئمروئولقەیسی کوڕی عابسی کیندی، وەك وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر و موسڵمان بووەو، بەردەوامیش لەسەر موسڵمان بوونەکەی ماوەتەوە، پاش ئەوەی بەشێکی بەرچاوی هۆزەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە،[١] لە کوفە نیشتەجێ بوو،[٢] شاعیرێکی دیار بووەو شیعری دەوت،[٣] سەبارەت بە هەڵگەڕانەوەی خەڵکی لە ئیسلام، شیعری نووسیوە.[٤]

جارێك ئەم هاوەڵە لەسەر زەوی و زار، لەگەڵ کەسێکی حەچرەمیدا کێشەی هەبوو، هەردوولا ڕێککەوتن کێشەکە ببەنەوە بۆ لای پێغەمبەر، کاتێ چوونە خزمەتی پێغەمبەر بە کەسە حەچرەمیەکەی فەرموو: بەڵگەت پێیە، یان دەبێت ئەو سوێند بخوات؟

کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر ئەو ئامادە بێت سوێند بخوات، من واز لە زەوییەکە دێنم بۆی،[٥] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، کە کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو گوێی لێ نییە سوێند بخوات.[٦]

---

(١) أسد الغابة، ج١، ص ١٧٥.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١١٢.

(٣) أسد الغابة، ج١، ص ١٧٥.

(٤) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٦.

(٥) الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١١٢.

(٦) صحيح مسلم، الرقم ٢٢٥.

ئەم گێڕانەوەشیان دروستترە، چونکە لە کتێبەکانی فەرموودەدا زیاتر بەم جۆرە هاتووە، پێغەمبەریش فەرمووی: بەس ئەتوانیت ئەوەی پێ بکەیت، پاشان چوون، تا سوێندەکە بخوات، ئینجا پێغەمبەر فەرمووی: ( من اقتطع أرضا ظالما ، لقي الله وهو عليه غضبان[1]. واتە: هەر کەس بەستەم زەویەك دابڕ بکات بۆ خۆی، ئەوە کە دەگاتەوە بە خوا، خوای گەورە زۆر لێی توورەیە).

ئمروئولقەیس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ئەگەر ئەوەی بزانێت مافی خۆیەتی، بەڵام دەستبەرداری ببێت، چی بۆ هەیە؟

پێغەمبەر فەرمووی :(الجنة) واتە: بەهەشتی بۆ هەیە.

ئمروئولقەیس وتی: دەی ئەی پێغەمبەری خوا! من تۆ بە شایەت دەگرم، کە وا دەستبەرداری بووم![2]

ئەو هاوەڵەش، کە ئەو کێشەی هەبوو لەگەڵ ئمرئولقەیسدا: ڕەبیعەی کوڕی عەیدان بوو.[3]

## چەند گومانێك :

ئەم هاوەڵە ویستوویەتی بەشێك لە زەوی هاوەڵێکی تر داگیر بکات، بۆیە ئەمە جۆرێك لە ستەم بووە لای ئەم هاوەڵەو، هەوڵیداوە لەپێناو دنیادا فێڵ بەکاربهێنێت، هەروەك دەبینین: هاوەڵەکەی تری دەڵێت: ئەم کەسە گوێی لێ نییە سوێندی بە ناهەق بخوات!

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٢٢٦، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٤٨٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٧٨٨٦، الإيمان لابن مندة، الرقم ٥٨٦.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١١٢.

(٣) أسد الغابة، ج١، ص١٧٥، صحيح مسلم، الرقم ٢٢٦.

کاتێ ئمروئولقەیس زانی، ئەگەر ئەو سوێندە بخوات، تووڕەیی خوای بەردەکەوێت، ئینجا ئامادە نەبوو سوێند بخوات و پاشەکشەی کرد.

هاوەڵان لە پێناو دنیادا بەرامبەر بە یەکدی وەستاون، وەك چۆن لەم نموونەدا دیارە.

## شرۆڤەی گومانەکان :

خوای گەورە ئەوەی لە موسڵمان حەرام نەکردووە، هەوڵ بدات بۆ ژیانی دنیا، بەڵکو خوای گەورە فەرمانی کردووە بە موسڵمان، پشکی دنیای لەبیر نەکات، بۆیە حەزو ویستی دنیایی لای موسڵمان شتێکی عەیبەو حەرام نییە.

حەرامیی و عەیبیەکەی کاتێك دەست پێدەکات، ئەو کەسە دنیای لێ ببێتە شوێنی مانەوەی هەمیشەییو، لە پێناو دنیادا هەنگاونان بۆ دەستکەوتی ڕۆژی دوایی لەبیر بکات، یان سست بێت تیایدا، هەروەها یان ئەوەی هەوڵ بدات بە ڕێگەی ناڕەوا بەدەستی بهێنێت، وەك ئەوەی بە زۆر و ستەم، یان بە فێڵ مافێکی کەسێکی تر داگیر بکات.

لە ئەزموونی هاوەڵاندا ئەمە بەدی ناکەین، چونکە دەبینین زۆر بە ئاسانی لە ماوەیەکی کەمدا، لەیەکدی گەیشتون و کێشە مادیەکانی نێوانیان چارەسەر کردون، هەیانبووە بۆ فەوتانی نوێژێکی، باخێکی کردووە بە خێر، کەسی وەك ئیمامی ئەبوبەکر، کە لەسەر دارخورمایەك، کێشەی لەگەڵ هاوەڵێك دەبێت، زۆر بە خێرایی کێشەکەیان لای پێغەمبەر چارەسەر دەکەن، بێئەوەی کاتژمێرێك بخایەنێت،.

هەروا ئەم هاوەڵەش، وەك دەبینین هێندە دڵنیایە، کە مافی خۆیەتی ئامادەیە کێشەکە ببەنەوە بۆ لای پێغەمبەر، ئەمەش فەرمانی خوایە، کاتێك کێشەیەك هەبوو بیبەینەوە بۆ لای فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی.

خۆ ئەوان هەردووکیان دەیانزانی پێغەمبەر لەلایەن خوای گەورەوە ڕێنموونیی و زانیاریی بۆ دێت، وەك چۆن خوای گەورە هەندێ کێشەی نهێنی هەڵماڵی بۆ پێغەمبەرەکەیو، ڕووی ڕاستی ڕووداوەکانی بۆ خستەڕوو.

ئەم دوو هاوەڵە دەیانزانی، دەکرێ خوای گەورە ڕاستی ئەم مەسەلەی ئەمان بخاتە ڕوو، بۆیە هەرکامیان نییەتی خراپی هەبوایە، ئامادەی نەبوو کێشەکە بباتە خزمەت پێغەمبەر، بەڵکو دوو ڕای جیاوازیان هەبووەو، هەرکام خۆیان بە خاوەن ماف زانیوەو،هەردووکیش ڕازی بون بە بڕیاری پێغەمبەری خوا، بۆیە ئەمە بەڕاست زانینی ڕای هەردووکیان نییە لەمەدا، بەڵکو ئەو مافە، هی یەکێکیان بووەو یەکێکیان هەڵە بووە، بەڵام هەردووکیان لە نییەتدا خۆیان بەڕاست داناوە، نەك ویستی داگیرکردنیان بێت، بە بەڵگەی ئەوەی خێرا کێشەکەیان بردەوە خزمەت پێغەمبەری خوا و، بە بڕیاری ئەویش ڕازی بوون.

هەروەها دەبینین ئەم دوو هاوەڵە، کە کێشەکەیان هەیە، پێکەوە دەچن بۆ لای پێغەمبەر، بێئەوەی کەسێك بیانبات، یان خەڵکێك بکەونە نێوانیانەوە، واتە: هێندە مەسەلەکەیان لا ئاسان بووە، هەرچەندە دەمەقاڵە لەنێوانیاندا هەبوبێت، بەڵام نەگەیشتۆتە ئاستێك، لێدانی بەرامبەری تێدا بێت، بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا دەچنە خزمەت پێغەمبەری خوا و کێشەکەیان چارەسەر دەکەن.

دەبینین: ئمروئولقەیس بە ڕاشکاوانە بە پێغەمبەری خوا دەڵێت: ئەو لەسەر هەقە، بەڵام ئەگەر واز بێنێت لەو هەقەی لە بەرامبەردا چی پاداشتێکی دەست دەکەوێت؟

کاتێك پێغەمبەر دەفەرموێت: بەهەشت، خێرا بێ بیرلێکردنەوە، واز دێنێت لەو زەوییەی، کە ماوەیەك بوو کاری تێدا دەکرد، هەروەها ئەو هەرچەندە دڵنیا بوو، ئەوە مافی خۆیەتی، بەڵام بە پێویستی نەدەزانی بۆ مەسەلەی زەوییەك، کاری بگەیەنێتە سوێندخواردن، ئەگەرچی پاش ئەوەی پێغەمبەر داوای کرد سوێند بخوات، ئامادەیی هەبوو، بەڵام خێرا بیری کردەوە لە بەرامبەر وازهێنان لەوە، بۆ قیامەتی چی دەست دەکەوێت.

دەبینین: هاوەڵان کێشەیان هەبووە، ئەوەش جیاوازییەکە لەنێوان مەسەلەی عەدالەتی هاوەڵان و مەعصووم بوونیاندا، هەڵەو کەموکورتی کەم لەناو عەدالەتدا جێی دەبێتەوە، چونکە عەدالەت ئەوەیە: کەسەکە لەسەر مەردایەتیی و خواناسیی و کاری چاکە ڕاهاتبێت و، ژیانی لەسەر ئەوە بباتەسەر، لەوەشدا هەر کەموکورتی و هەڵە و نەپێکان دەبێت، بەڵام ئامانجی سەرەکیی، ڕەزامەندی خوایەو ئەو کەموکورتی و هەڵە، یان نەپێکانە جۆربەجۆرانەش، نابنە هۆی لادانی ئەو هاوەڵە لە ڕێی ڕاستیی، بەڵام لە مەعصومیەتدا تاکە هەڵەیەک قبووڵ نییە، ئەمەش دوورە لە مەنهەجی ئەهلی سوننەوە.

## ڕووداوی ثەعلەبەی کوڕی حاطب

دەوترێت: ثەعلەبەی کوڕی حاطب یەکێك بووە لەوانەی مزگەوتی (ضرار) یان دروست کردووە،[1] فەرموودەیەکی لاوازی لەبارەوە هاتووە، ئەویش ئەوەیە، کە لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە هاتووەو دەڵێت: ثەعلەبەی کوڕی حاطبی ئەنصاری هات بۆ لای پێغەمبەر و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! لای خوا نزام بۆ بکە سامانێکم پێ ببەخشێت!

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (هاوار بۆت ثەعلەبە! کەمێکت پێ ببەخشرێ و لەسەری سوپاسگوزار بیت باشترە لە زۆرێك، کە بەرگەی نەگریت و دەرەقەتی نەیەیت).

بەڵام ثەعلەبە جارێکی تر لێی دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش پێی فەرموو: (ئایا ڕازی نیت بەوەی وەك پێغەمبەری خوا بیت؟ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر بمەوێت شاخەکان وەك زێڕ و زیو لەگەڵم ڕێ بکەن، ئەوا دەکرێت).

ثەعلەبە وتی: سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردووە، ئەگەر نزام بۆ بکەیت و خوا سامانم پێ ببەخشێت -دەوڵەمەندم بکات - هەرچی مافێك هەیە دەیدەم.

پێغەمبەریش نزای بۆ کرد و فەرمووی: (خوایە! سامان بە ثەعلەبە ببەخشە).

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٠.

ئەوەبوو ئەعلەبە برێ مەڕو ماڵاتی گرتەبەر و بەرەبەرە زیادیان کرد، ئیتر وای لێهات لە مەدینەدا سەخت بوو ڕایانگرێت، بۆیە دەچووە دەرەوەی مەدینەو چوو لە دۆڵێك لە دەرەوەی مەدینە دانیشت، ئیتر وای لێهات، تەنها نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەجەماعەت دەکرد و فریای ئەوانی تر نەدەکەوت، دواتر مەڕەکانی زیادیان کرد، تا وای لێهات، جگە لە نوێژی هەینی، وازی لە نوێژەکان هێنا!

بەردەوام مەڕەکانیشی زیادیان دەکرد، وای لێهات هەینیان کاروانییەکانی دەبینی و لەوان هەواڵی وەردەگرت.

پێغەمبەر فەرمووی: (ئەرێ ئەعلەبە چی کرد؟).

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! برێ مەڕو ماڵاتی زۆری هەبوو، لە مەدینە جێی نەدەبوویەوە، ئیتر بۆیان باس کرد چی کردووەو چی بەسەرهاتووە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی هاوار بۆ ئەعلەبە)، سێ جار ئەوەی فەرموو!

ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند:(خڎ من أموالهم صدقه...)، بەوە فەڕزی زەکات دابەزی، پێغەمبەریش دوو کەسی دانا بۆ کۆکردنەوەی زەکات، کەسێك لە (جوهەینە)و کەسێکیش لە (بەنی سولەیم)، بۆیشی نووسین، کە چۆن زەکات لە موسڵمانان کۆبکەنەوە .

بەو دوانەی فەرموو: (بڕۆن بۆ لای ئەعلەبەو فڵانە کەس لە بەنی سولەیم و، زەکاتیان لێ وەربگرن).

ئەو دوانەش چوون بۆ لای ئەعلەبەو داوایان لێکرد زەکات بدات، ئینجا نامەکەی پێغەمبەری خوایان بۆی خوێندەوە .

ئەویش وتی: ئەوە سەرانەیە، ئەمە خوشکی سەرانەیە، نازانم ئەمە چییە؟ بڕۆن تا تەواو دەبن لە ئیشەکەتان، ئینجا بگەڕێنەوە بۆ لای من!

ئەوانیش چون بۆ لای کابرای (سولەمی) و پاش ئەوەی زەکاتەکەیان لێ وەرگرت، گەڕانەوە بۆ لای ثەعلەبە.

ئەویش وتی: ئادەی نامەکەم بدەنێ، با سەیری بکەم، کە سەیری کرد وتی: ئەمە بێت و خوشکی سەرانەیە، بڕۆن بزانم چۆن دەبێت!

ئەو دوانەش گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر، کاتێك پێغەمبەر ئەو دوانەی بینی، پێش ئەوەی بیاندوێنێ فەرمووی: (هاوار بۆ ثەعلەبە)، نزای بەرەکەتیشی بۆ کابرای سولەمی کرد، دوو هاوەڵەکە هەواڵیان پێدا، کە ثەعلەبە چی کردووە و کابرای سولەمیش چۆن چاکی ناو سامانەکەی داناوە بۆ زەکات، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ( ومنهم من عاهد الله لئن آتانا من فضله لنصدقن و لنكونن من الصالحين....بما كانوا يكذبون).

یەکێك لە کەسە نزیکەکانی (ثەعلەبە) لای پێغەمبەری خوا بوو، کە ئەوەی بیست، چوو بۆ لای( ثەعلەبە) و وتی: قوڕت بەسەر (ثەعلەبە)، خوای گەورە ئایەتی وای لەسەر دابەزاندویت.

خێرا (ثەعلەبە)ش چوو بۆ لای پێغەمبەر و، داوای لێکرد زەکاتەکەی لێ وەربگرێت،بەڵام پێغەمبەر فەرمووی: (خوا ڕێی نەداوم صەدەقەکەت لێ وەربگرم).

(ثەعلەبە) خۆڵی دەکرد بەسەریدا و، پێغەمبەریش پێی دەفەرموو: (ئەوە کاری خۆت بوو، من فەرمانم پێ کردیت و تۆیش گوێڕایەڵیت نەکردم).

ئیتر بە ناچاریی گەڕایەوە ماڵەوە، دواتریش کە پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد، ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە ئامادە نەبوو زەکاتی لێ وەربگرێت، کە ئەبوبەکر مرد، عومەریش زەکاتی لێ وەرنەگرت، دواتریش کە عوسمانی کوڕی عەففان بوو بە خەلیفە، زەکاتی لێ وەرنەگرت.[1]

---

(١) شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٤١٧٣، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٣١٠، ضعفه ابن حجر العسقلاني و الحافظ العراقي، كما أشار به الألباني و ضعفه في سلسلة الأحاديث

ئەم فەرموودەیە لای هەریەك لە (ئیبن حەجەر) و زانای فەرمووودەناسی عێراقی و، ئەلبانیش بە زۆر لاواز (ضعیف جدًا) هاتووە، ئەم جۆرە فەرمودەیە بەهیچ شێوەیەك كاری پێ ناكرێ لەبەرئەوەی ڕاست نییە، بۆیە بە چەند خاڵێك ئەگەری ناڕاستی ئەم گێڕانەوەیە دەخەینەڕوو:

**یەكەم:** زەكات كە لە ئیسلامدا فەرز كراو لە كەس قبووڵ نەدەكرا زەكات نەدات، ئیتر چۆن ئەمە بەرامبەر بەم هاوەڵە كرا؟ خەلیفە ئەبوبەكر دژ بەوانە جەنگا، كە زەكاتیان نەدەدا و جیهادی دژیان ڕاگەیاند، جا ئێستا كەسێك خۆی هاتبێت تكای كردبێت لە پێغەمبەر و خەلیفەش، تا زەكات بدات ئەوان قبووڵی نەكەن و سزایشی نەدەن؟!!

زەكات نەدان لە ئیسلامدا تاوانێكی شەخصی وا نییە، كە تەنها لەنێوان بەندەو خودا بێت و سزاكەی بەس لای خوا بێت، بەڵكو سزای دنیاییشی لەسەرە، وەك چۆن خەلیفەی یەكەمی موسڵمانان ئەبوبەكری صدیق، لە یەك تاكە كەسی قبووڵ نەكرد، جیاوازی بكات لەنێوان نوێژ و زەكات و، هەركام لەوانەی بە پایەی ئیسلام دانا و سزایشی بۆ زەكات نەدان دانا.

**دووەم:** بۆ ئەو هاوەڵانەی لە ساتی سەختیدا لەگەڵ پێغەمبەر نەچوون، واتە: لە جەنگی (حونەین) خوای گەورە لێخۆشبوونی خۆی نیشاندا، هەروەها لەو بێباوەڕانە خۆش بوو، كە دەستیان چووبووە خوێنی موسڵمانان و دواتر موسڵمان بوون، ئێستا چۆن بە ئەنجامدانی تاوانێك و، بەدوایدا تەوبەكردن تەوبەی بەندەیەك وەرناگیرێت؟

خوای گەورە دەفەرموێت: (إن الله يغفر الذنوب جميعا)، ئەی چۆن لێخۆشبوون نەبێت بۆ كەسێك، كە ساتێكیش ئامادە نەبووە بێباكی خۆی لە ئیسلام نیشان بدات؟!

---

الضعيفة، الرقم ٤٠٨١.

## ئایا کورد چووەتە خزمەت پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ؟

بەڵێ، کورد چووەتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە لە فەرموودەی صەحیحیشدا ئەوە تۆمار کراوە.

جابان هاوەڵێکی پێغەمبەر بوو و کورد بوو، هەروەك ئیبن ئەثیر لە باسی مەیموونی کوڕیدا هێناویەتی (مەیموونی کوردی لە باوکیەوە - فەرموودەی گێڕاوەتەوە - کە دەوترێت: ناوی باوکی جابان بووە).

ئەبوخالید دەڵێت: لە مەیموونی کوڕی جابانی صەردیم بیست لە باوکییەوە دەیگێڕایەوە، زیاد لە جارێك و دوو جار، تا دەگەیشتە دە جار لە پێغەمبەری خوای بیستووە، دەیفەرموو: (من تزوج امرأة و هو ينوي ألا يعطيها الصداق لقي الله و هو زان[1]. واتە: هەرکەس ئافرەتێك مارە بکات و نیازی ئەوەی هەبێت مارەییەکەی پێ نەدات، ئەوە کە دەگاتەوە بە خوا، وەك زیناکار دەگاتەوە بەخوا).

لە گێڕانەوەکەی طەبەرانیشدا هاتووە:

لە مەیموونی کوردی لە باوکییەوە دەڵێت: نە جارێك و نەدوو جار و نەسێ جارو زیاتر لەوەش، بەڵکو دەگاتە دە جار لە پێغەمبەری خوام بیستووە دەیفەرموو: (أيما رجل تزوج امرأة بما قل من المهر أو كثر ليس في نفسه أن يؤدي إليها حقها، خدعها، فمات ولم يؤد إليها حقها، لقي الله يوم القيامة وهو زان[2].

---

(١) أسد الغابة، ج١، ص ٣٧٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٢٩.

(٢) المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ١٨٧٥، صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ١٩٢١.

واتە: هەر پیاوێك ئافرەتێك مارە بكات بە مارەیی كەم بێت، یان زۆر و لە نییەتیدا بە تەما نەبێت مافەكەی ئەو ژنە بدات، هەڵیبخەڵەتێنێت، جا ئەو پیاوە، كە مرد و مافی ئەو ژنەی نەدابوو، ئەوە كە ڕۆژی دوایی دەگاتەوە بە خوا، وەك زیناكار دەگاتەوە بە خوا).

ئەم فەرموودەیە، كە لە جابانەوە گێڕدراوەتەوە، ئاماژەیە بەوەی كوردیش گەیشتوەتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، سەبارەت بەوەی، ئایا وەك تاكەكەس چووە، یان وەك وەفد چووە؟ ئەوەیان ڕوون نییە، دەتوانین چەند ئەگەرێك باس بكەین:

**یەكەم:** ئەگەر جابان وەك وەفد بچوایە، ئەوا موسڵمانبوونی بە لێشاوی كورد لە سەردەمی پێغەمبەر بەدی دەكرا و، كوردانێكی تر دەچوونە خزمەت پێغەمبەری خوا و فەرموودەیان لێوە دەگێڕایەوە، وەك چۆن لە هۆزەكانی تردا بەدی دەكرا.

**دووەم:** ناوچەی حیجاز بۆ كوردەكان، ناوچەیەكی دوور نەبووەو بەهۆی بوونی ڕێی بازرگانییەوە، گونجاوە ئەو هاوەڵە كوردە ڕێی كەوتبێتە ئەوێ و، لەو كاتەشدا سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بوبێت.

**سێیەم:** دەبینین: جابان پەیامی خوای گەیاندووە بە مەیموونی كوڕی، كە ئەمەش ئاماژەیە بەوەی، جابان هەوڵیداوە پەیامی ئیسلام بڵاو بكاتەوە، جا چ لەسەر ئاستی خێزانەكەی خۆی بووبێت و، ترسی هەبووبێت لەوەی خەڵكی دەوروبەری پەیامەكەی وەرنەگرن و، خێرا بیكوژن وەك چۆن نموونەی وا لەناو هۆزە عەرەبەكاندا ڕوویدا، یان لەوانەشە پەیامەكەی گەیاندبێت بە خەڵكی تریش.

بەهەرحاڵ ئەوەی دڵنیایەو ئەگەر نییە، ئەوەیە: جابان پەیامی ئیسلامی گەیاندووە بە مەیموونی كوڕی و، فەرموودەیەكیشی بۆ گێڕاوەتەوە، كە لە پێغەمبەری خوای بیستووە.

هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، جابان ماوەیەكی زۆر لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووە، چونكە دەڵێت: دەجار ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەر بیستووە،

بەدڵنیاییشەوە پێغەمبەر لەیەك کاتدا،دەجار ئەو فەرموودەی دووبارە نەکردوەتەوە، بەڵکو ئەگەر لە یەك کاتدا زۆریش دووبارەی کردبێتەوە، سێ جار بووە وەك ئەوەی پێغەمبەر هەندێ فەرمایشتی سێ جار دووبارە کردۆتەوە، ئیتر ئایا جابان ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە، بۆ نموونە مانگێك لەوێ بووبێت و پێغەمبەر لەو ماوەدا ئەوەندە دووبارەی کردبێتەوە، یان جابان چەند جارێك سەردانی پێغەمبەری خوای کردبێت و، هەر جارەو ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا بیستبێت.

سەبارەت بە حوکمی فەرموودەکەش، سەبارەت بە مەسەلەی مارەیی، ئەوا دەبێتە ئەرکی سەرشانی پیاو هەر مارەییەکی دانا بۆ ئەو ئافرەتەی، کە مارەی دەکات، ئەو مارەییەی بدات، چونکە ئەگەر نیازی هەبێت ئەو مارەییە نەدات و، تەنها بۆ بەرێکردنی هاوسەرگیرییەکە، بەڵێ بکات، ئەوە بنەڕەتی ئەو هاوسەرگیرییە دانەمەزراوەو، وەك فەرموودەکە ئاماژەی پێداوە، حوکمی زینای دەبێت بۆی، ئەوە جیایە کە هاوسەرەکەی گەردنی ئازاد بکات نەیەوێت، ئەمە جیاوازە لەوەی پیاوەکە نیازی پێنەدانی مارەییەکەی هەبێت، جا ئەگەر بەس نیازەکە ئەو حوکمەی هەبێت، دەبێت حوکمی ئەوە چی بێت، کە مارەییەکەی لەدەستدایەو، ئەمەش دەزانێت و مارەییەکەش نادات.

زۆر جار بووك وادەکات، زاوا تووشی ئەو تاوانە بکات، ئەویش بەوەی مارەییەکی لێ داوا دەکات، کە بە دڵنیاییەوە زاوا ناتوانێت ئەو مارەییە بدات، بەڵام بۆ سەرگرتنی ئیشەکە، بەڵێ دەکات، جا با هەردوولا وریای داواکانی شەیتان و سنوورەکانی خوا بن.

هەروەها جابان فەرموودەیەکی تری لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)گێڕاوەتەوە، کە ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی:

ئەبی خەلدە دەڵێت: مەیموونی کوردی، لای مالیکی کوڕی دینار بوو، مالیك پێی وت: ئەوە چییە مامۆستای فەرموودە، لە باوکیەوە فەرموودەمان بۆ ناگێڕیتەوە؟ خۆ باوکی تۆ گەیشتووەتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و فەرموودەی لە بارەوە گێڕاوەتەوە.

مەیمونیش وتی: باوکم فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) بۆ نەدەگێڕاینەوە، لە ترسی ئەوەی نەبادا کەم و زیادی تێدا بکات.

باوکم دەیوت: بیستوومە لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دەیفەرموو: (من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار[1]. واتە: هەرکەس بە ئەنقەست درۆیەکم بە دەمەوە بکات، با شوێنی خۆی لە دۆزەخ دیاری بکات).

لێرەوە دەردەکەوێت: چوونی جابان بۆ خزمەتی پێغەمبەر، هێندە دیار بووە، کە لە مەدینەدا دەنگی داوەتەوەو موسڵمانانێکی زۆریش ئاگادار بون بەوە.

مەسەلەیەکی تر، کە پێویستە بیخەینە ڕوو و، ئاماژەیەکی ترە بەپەیوەندی کورد و پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)، فەرموودەیەکە، کە لە سونەنی ئەبوداوودا هاتووە:

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە جلێکی ڕەشەوە (خمیصە) نوێژی دەکرد، کە بڕێك گوڵنگە و شتی ڕازاندنەوەی پێوە بوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەم گوڵنك و ڕازاندنەوانەی ئەم جلەم، لە نوێژەکەم سەرقاڵم دەکەن، ئەمە ببەن بۆ ئەبو جەهم و، ئینبیجانییەتەکەی ئەوم بۆ بهێنن.. ئەوەبوو جلێکی کوردی ئەبو جەهمی کردەبەری.[2]

وشەی ئینبیجانییەت وا پێناسەی هاتووە، کە جلێکی لە خوری دروست کراوو زۆر زبرە.[3]

بەو پێیە بێت، دەبێت ئەو جلەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)شتێکی وەك شاڵ بوو بێت.

---

(١) المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ٦٣٢٢، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٤٧٦.

(٢) سنن أبي داود، الرقم ٧٩٣، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٩١٥.

(٣) النهاية في غريب الحديث و الأثر، ج١، ص ٧٣.

## كوشتاری بەنی جەذیمە

لە مانگی شەووال[1] و پاش فەتحی مەككە، واتە: دوای ڕەمەزان، پێغەمبەر (صلی اللەعلیەوسلم) خالیدی كوڕی وەلیدی نارد بۆ لای (بەنی جەذیمە)، تا بانگەوازیان بكات بۆ ئیسلام، نەك بۆ ئەوەی لەگەڵیان بجەنگێت، هاودەم بەوەش سێ سەد و پەنجا هاوەڵی لە كۆچەران و پشتیوانان و بەنی سولەیم نارد لەگەڵیدا، بەڵام خالید لەوێ لەگەڵیان بەریەككەوت و كوشتارێكی لێیان كرد.

ئەمە بووە بە گومانێك سەبارەت بە ژیانی خالید، كە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەری خوای كردووە.

**هۆكاری ڕووداوەكە بە دوو گێڕانەوە هاتووە كە بریتین لە:**

**یەكەم:** خالید، كە چووە ئەوێ، وتی: ئێوە كێن؟

وتیان: موسڵمان بووین و نوێژ دەكەین و زەكات دەدەین بە موحەممەد و، مزگەوتمان دروست كردووە و بانگی تێدا دەدەین.

خالید وتی: ئەی ئەو چەكانە چیە پێتان؟

وتیان: لەگەڵ هۆزێكی عەرەبی دوژمنایەتیمان هەیە، ترساین ئێوە ئەوان بن.

خالید وتی: دەی چەكەكانتان دابنێن!

ئەوانیش چەكیان دانا.

---

(١) الطبقات الكبری لابن سعد، ج٢، ص ١٤٧-١٤٨.

خالید وتی: بەدیلیان بگرن، ئەوەبوو بەدیل گیران، بۆ بەری بەیان خالید وتی: کێ دیلی لایە، با بە شمشێر تێی بکەوێت، ئەوەبوو بەنی سولەیم چی دیلیان لابوو کوشتیان، بەڵام کۆچەری و پشتیوانەکان دیلەکانیان ئازاد کردن، کە ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر فەرمووی: (اللهم انی أبرأ اليك مما صنع خالد. واتە: خوایە! من لەبەردەم تۆدا خۆ دوور دەگرم لەو کارەی خالید کردی) ئینجا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی نارد، تا خوێن باییان بدات.[1]

**دووەم:** کاتێك خالید چووە ئەوێ و بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوان بە باشی نەیاندەزانی بڵێن: (أسلمنا) موسڵمان بووین، بەڵکو دەیانوت: (صبأنا، صبأنا)، واتە: لە دین هەڵگەڕاینەوە، لە دین هەڵگەڕاینەوە!

خالیدیش وایزانی بێباوەڕی خۆیان ڕادەگەیەنن، بۆیە کەوتە کوشتن و گرتنیان، دیلەکان لەناو هاوەڵاندا دابەش بوون، تا بۆ بەیانی خالید فەرمانی کرد هەرکەسەو دیلەکەی بکوژێت، ئەوەبوو هەندێ لە هاوەڵان دیلەکانی خۆیان نەکوشتن،تا چوونە لای پێغەمبەر و مەسەلەکەیان بۆ باسکرد، پێغەمبەریش دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: (اللهم إني أبرأ إليك مما صنع خالد)،، دوو جار ئەوەی فەرموو.[2]

ئەگەر بە دیدێکی زانستیی تەماشا بکەین، بۆمان دەردەکەوێت: گێڕانەوەی دووەم دروستە، لەبەرئەوەی:

**یەکەم:** دەبینین گێڕانەوەی یەکەم لە کتێبەکانی فەرموودەدا نەهاتووە، بەڵام گێڕانەوەی دووەم لە چەندین کتێبی فەرموودەدا هاتووە، بە تایبەت لە صەحیحی بوخاریدا.

**دووەم:** خوێن بایی، کە دەدرێت بۆ کوشتنی هەڵەیە، ئەگینا کوشتنی ئەنقەست بە خوێن بایی چارەسەر ناکرێت.

---

(١) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١٤٧- ١٤٨.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٩٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٨٢٢، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٧٧٩، مسند احمد بن حنبل، الرقم ٦١٨٣.

**سێیەم:** ئەگەر کوشتنی ناحەق و ئەنقەست بوایە، ئەوە پێغەمبەرتۆڵەی لێدەسەندەوە، بۆیە ئەوە تۆمەتێکە بۆ پێغەمبەر، کە ئامادە نەبووە نزیکانی خۆی بخاتە بەر دادگای شەریعەت، ئەوەش دوورە لە شکۆی پێغەمبەری خواوە.

**چوارەم:** ئەوە ئیجتیهادێکی هەڵەی خالید بووە، کە وای زانیوە بەو چەمکە لە ئیسلام دەستبەردار دەبن، بەوەش گوڕ و تین گرتوویەتی و کەوتووەتە کوشتنیان و، دانەنیشتووە وردەکارییان لێبکات‌ەبڵێت: مەبەستتان لەو قسەیە چییە؟

## هەڵوێستی پێغەمبەر بەرامبەر بە خالید و کارەکەی

**یەکەم:** پێغەمبەر ناڕەوایی ئەو کارەی خالیدی ڕاگەیاند و، لای خوا دوورگرتنی خۆی لەو کارە نیشاندا.

**دووەم:** پێغەمبەر نەك خالیدی لەسەر ئەو کارەی نەکوشت، تەنانەت لە پۆستەکەشی لاینەبرد، دوای ئەوە چەند بەرپرسیارێتی تری پێ ڕاسپارد، چونکە ئەوەی خالید ئەنقەست نەبوو، ئیجتیهادێکی هەڵە بوو، ناشکرێت لەبەر هەڵەیەك، ئەزموون و توانایەکی بەهێز پەك بخرێت، بەڵکو لەلایەکەوە دەبێت هەڵەکەی چارەسەر بکرێت، لەلایەکی ترەوە ئاگادار بکرێتەوە لەو هەڵەی و، هەر هەڵەیەکی تری چاوەڕوانکراو.

**سێیەم:** پێغەمبەر عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی بانگ کرد و رایسپارد، تا خوێن بایی تەواوی ئەو هۆزە بدات و، هەموو بارێکی سەردەمی نەفامی بخاتە ژێر پێی.

عەلی چوو بۆ ئەوێ و هەرچی خوێن باییەك هەبوو پێی دانەوە، دواتر چی زیانی دارایی هەبوو، هەمووی بۆ قەرەبوو کردنەوە، تەنانەت، ئەگەر قاپی بەردەم سەگەکەشیان شکابوایە، ئەوەشی بۆ قەرەبوو کردنەوە، دواتر کە تەواو بوو، بڕێك سامان مایەوە.

عەلی وتی: ئەو زیادەش بۆ ئێوە، با ئەگەر شتێك ئێمە نەیزانین و ئێوە بیزانن بەوە قەرەبوو بێتەوە، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرو هەواڵی پێدا، کە چی کردووە، پێغەمبەریش فەرمووی: (چاکت کردو پێکات).[1]

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٥، ص ٩٦.

## ئایا سەلمان یەكەم موسڵمانی فارسە؟

سەبارەت بەوەی ئایا سەلمان یەكەم موسڵمانی فارسە، یان نا، ئەمە پێویستی بە وردەكاریی هەیەو، هیچ بەڵگەیەكی تەواو بەردەست نییە، چونكە ئێستا چەند نموونەیەك دەخەینە ڕوو، كە هاوەڵانێكی تری فارس هەبون لە مەدینە بون، ئیتر ئایا كامیان زووتر موسڵمان بووە، ئەوەیان بەڵگەی یەكلاكەرەوەی دەوێت:

سەلمان دەڵێت: كە چوومە مەدینە و، كرام بە كۆیلە، كەس لە قسەم تێنەدەگەیشت، تا ئەوەی پیرەژنێكی فارس هات و داوای ئاوی كرد، منیش قسەم لەگەڵ كرد، وتم: ئەو پێغەمبەرەی دەركەوتووە لە كوێیە؟

ئەویش وتی: سبەینێ دەدات بەلاتدا.

منیش بڕێك خورمام كۆكردەوەو چوومە خزمەتی و خورماكەم خستە بەردەستی، فەرمووی ئەوە صەدەقەیە، یان دیارییە؟[1]

لەگێڕانەوەیەكی تردا هاتووە: پیرەژنەكە بەسەلمانی وت: نوێژی بەیانی بكات - واتە: پێغەمبەر - ئەوكات دێت بەلاتدا تێپەڕ دەبێت.[2]

ئەبونوعەیم لە (تاریخ اصبهان) دا ناوی ئەو ژنەی بە (ئەمەتولڵا) هێناوەو دەڵێت: پێش سەلمان موسڵمان بووەو،ئەو ئافرەتە خەڵكی ئەصفەهان بووە.[3]

---

(١) سیر أعلام النبلاء، ج١، ص ٥١٥.

(٢) تاریخ أصبهان لأبي نعیم الأصبهاني، ج١، ص ١٠٦.

(٣) تاریخ أصبهان لأبي نعیم الأصبهاني، ج١، ص ١٠٥.

هەر لەوێدا گێڕانەوەیەکی تری هێناوە، کە سەلمان دەڵێت: چوومە مەککە، لەوێ ئافرەتێکی ناوچەکەی خۆمم بینی، پرسیارم لێکرد و قسەم لەگەڵ کرد، دەبینم مەولاکەی و ژن و منداڵی مەولاکەشی، هەموویان موسڵمان بون، ئینجا هەواڵی پێغەمبەری خوام لێ پرسی، ئەویش پێی وتم.[١]

ئەگەر ئەم ئافرەتە لەو کاتەدا موسڵمان بوویێت، ئەوە دیارە سەلمان، یەکەم موسڵمان بوونی فارسەکان نییە.

ئەنەس دەڵێت: دراوسێیەکی پێغەمبەر فارس بوو، شلەی - گۆشتاوی - زۆر بەتامی دروست دەکرد، جارێك ئەوەی ئامادە کرد بۆ پێغەمبەرو، هات بانگهێشتی پێغەمبەری خوای کرد.

پێغەمبەریش فەرمووی: (ئەمەش بێت)؟ مەبەستی عائیشە بوو، کە لەگەڵیدا بوو.

کابرا وتی: نا تەنها خۆت، پێغەمبەر فەرمووی: دەی نایەم!

کابرا هەمدی هاتەوەو پێغەمبەری خوای بانگهێشتکردەوە، هەمان شت ڕوویدایەوە، لە جاری سێیەمدا کابرا وتی: باشە با ئەویش بێت، ئینجا پێغەمبەر و خاتوعائیشە بە شانەخڕێ و گەمەکردنەوە چوون، تا گەیشتنە ماڵی کابرای فارس.[٢]

جا دیار نییە ئەم دراوسێ فارسەی پێغەمبەر، کێ بووەو موسڵمان بووە، یان نا و کەی موسڵمان بووە؟

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی: (پێشکەوتوان چوارن، من پێشکەوتووی عەرەبم، سەلمان پێشکەوتووی فارسە، بیلال پێشکەوتووی حەبەشەیە، صوهەیب پێشکەوتووی ڕۆمە).[٣] بەڵام ئەم فەرموودەیە لاوازە،

---

(١) تاريخ أصبهان لأبي نعيم الأصبهاني، ج١، ص١٠٦.

(٢) صحيح مسلم، الرم ٣٨٩١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٠١.

(٣) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٢٠٨، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٧١١٦، حذفه الذهبي من التلخيص لضعفه.

هەرچەندە ذەهەبی سەبارەت بەوەی سەلمان پێشکەوتووی فارسە دەڵێت: ئەو گێڕانەوەیە مورسەلە بەڵام واتاکەی ڕاستە.[1]

## تەمەنی سەلمانی فارسی :

**سەبارەت بە تەمەنی سەلمان شتی دەگمەن دەوترێت:**

عەبباسی کوڕی یەزیدی بحرانی دەڵێت: زانایان گومانیان لەوە نییە، سەلمان دووسەدو پەنجا ساڵ ژیاوە، هەندێکی تریش دەڵێن: بەڵکو سێسەد و پەنجاساڵ ژیاوە، هەندێ زانای ئەم دواییەش، ڕایان وایە: تەمەنی سەد ساڵی تێنەپەڕاندووە.[2]

لەبەرئەوەی هیچ دەقێکی سەلماو و صەحیحی لەسەر نییە، دەتوانین بڵێین: ئەو تەمەنەی وتراوە، زۆرەو شتێکی ناواقعی دێتەبەرچاو، ئەمەش لەبەر چەند ئەگەرێك:

**یەکەم:** ئەو تەمەنە زۆرە لەو سەردەمەدا باو نەبووە!

**دووەم:** کەسێکی بەتەمەنی وا، کە بەو پێیە بێت لە کاتی هاتنی پێغەمبەر، تەمەنی نزیکەی دووسەد و پانزە ساڵێك بووە، چۆن توانیویەتی بچێتە سەر دارخورما و ئیش بکات و کۆیلە بێت؟ هەروەها بەو پێیە بێت لە کاتی خەندەقدا، تەمەنی دووسەد و بیست ساڵان بووە، چۆن توانیویەتی خەندەق هەڵبکەنێت؟ چونکە وەك ذەهەبی هێناویەتی: لەو کاتەدا سەلمان کەسێکی زۆر بەهێز بووە،[3] یان لە فەتحی (طائیف)دا مەنجەنیق بەکاربهێنێت، هەروەها لە سەردەمی

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٣٩.

(٢) البدايتو النهاية لابن كثر، ج٥، ص ٣١٧.

(٣) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٤٠.

خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا، کە ئیتر تەمەنی لە دووسەد و سی ساڵ بەرەو سەر دەبێت، چۆن سەرکردایەتی فتووحات دەکات و، لەسەنگەردا جەنگی دەستەویەخەی شمشێر لەگەڵ دوژمندا دەکات!

بۆیە دەشێت لەبەر نەبوونی هیچ دەقێکی صەحیح لەو بارەوە، ڕای ئەوانە ڕاست بێت، کە دەڵێن: تەمەنی سەد ساڵی تێنەپەڕاندووە.

ذەهەبی دەڵێت: هەموو حاڵی ژیانی و غەزا و ورەو هەڵسوکەوت و شتەکانی تری ئەوە دەڵێن، کە سەلمان تەمەنی زۆر نەبووە، کە وڵاتی خۆی جێهێشتووە، تازە پێگەیشتوو بووە، کە هاتووەتە حیجاز، تەمەنی چل ساڵ، یان کەمتر بووە، هێندەی نەبردووە هەواڵی هاتنی پێغەمبەری خوای بیستووە، بۆیە لەوانەیە حەفتاو ئەوەندە ساڵ ژیابێت، پێشم وانییە گەیشتبێتە سەد ساڵ،... من لە کتێبە مێژووییە گەورەکەمدا باسم کردووە، کە تەمەنی دووسەد و پەنجاساڵ بووە، ئێستا لەو قسەم ڕازی نیم و بە ڕاستی نازانم.[1]

(ئیبن حەجەر) دەڵێت: ئەگەر ئەوەی- ئەو خەڵکە سەبارەت بە تەمەنی سەلمان - گێڕاویانەتەوە بسەلمێت و چەسپاو بێت، ئەوە شتێکی نائاسایی و دەگمەن دەبێت، چ بەربەستێکیش هەیە لە شتی وا؟[2]

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٥٥-٥٥٦.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ١٤١.

## ئایا سەمورەی کوڕی جوندوب دۆزەخییە؟

مشتومڕێکی زۆر هەیە سەبارەت بەوەی، ئایا سەمورە دۆزەخییە، یان نا، ئەمەش لەبەر چەند گێڕانەوەیەك، کە سەبارەت بە سەمورە هاتون، لەوانە:

ئەبوهورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بە دە کەس لە هاوەڵانی خۆی فەرموو: (کۆتا کەستان، کە دەمرێت لە دۆزەخدایە)، لەناویشیاندا سەمورەی کوڕی جوندوب هەبوو![1]

ئەوسی کوڕی خالید دەڵێت: هەرکات دەچووم بۆ لای ئەبو مەحذورە، هەواڵی سەمورەی دەپرسی، هەرکاتیش دەچووم بۆ لای سەمورە، هەواڵی ئەبو مەحذورەی دەپرسی.

ڕۆژێك بە ئەبو مەحذورەم وت: بۆچی دەچم بۆ لای سەمورە هەواڵی تۆ دەپرسێت و، دێم بۆ لای تۆیش هەواڵی ئەو دەپرسیت؟

ئەویش وتی: جارێك من و سەمورە و ئەبوهورەیرە پێکەوە بووین، پێغەمبەری خوا هاتەژوورەوە بۆ لامان و، فەرمووی: ئەوەتان، کە کۆتا کەس دەمرێت لە دۆزەخدایە، ئەوسی کوڕی خالید دەڵێت: یەکەمجار ئەبوهورەیرە مرد، دواتر ئەبو مەحذورە مرد، دواتر ئەویش مرد.[2]

---

(١) مشكل الآثار للطحاوي، الرقم ٥٠٤٨.

(٢) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٥٩١، مسند ابن أبي شيبة، الرقم ٨٣١، البداية والنهاية لابن كثر، ج٦، ص٢٦، تأريخ السلام للذهبي، ج٤، ص٢٣٣، سير أعلام النبلاء، ج٣، ص١٨٥.

ئەم فەرموودەیە قسەو باسی زۆری لەسەرە، هەندێك لەسەر ئەوە قسە دەکەن، ئایا ئەم فەرموودە صەحیحە، یان لاوازە، یان هەڵبەستراوە؟ هەندێکیش کاری پێدەکەن.

لەو ماوەی (زیاد)لە کوفە والی بوو، کە دەچوو بۆ بەصرە، سەمورەی دەکرد بە والی کوفە، کاتێکیش لە بەصرەوە دەچوو بۆ کوفە، سەمورەی دەکرد بە والی بەصرە.[١]

سەمورە بەرامبەر بە خەواریجەکان زۆر توند بوو،کوشتارێکی زۆری لەوان کرد،کە یەکێك لە خەواریجەکانی دەکوشت، دەیوت: پیسترین کەسی ژێر ئاسمانن، موسڵمانان بە کافر دەزانن و خوێنیان دەرێژن، بۆیە حەروریە خەواریجەکان، زۆر هێرشیان دەکردە سەر سەمورەو تانەیان لێدەدا.[٢]

## ڕای زانایان سەبارەت بە سەمورە:

هەریەك لە حەسەنی بەصری و ئیبن سیرین، زۆر بە چاکەو ئیسلام دۆستی باسی سەمورە دەکەن[٣] وەك ئەوەی هیچ بەهایەکیان دانەنابێت، بۆ ئەوەی بەڵگەیەك بۆ چوونە دۆزەخی سەمورە هەبوویێت، جا یان لەبەرئەوەی، ئەوەیان بە هەڵبەستراوی خەواریج دانابیت، یان پێیان وابوویێت: مەبەست بە ئاگرەکە، ئاگری دنیا بووە و بەو ئاگرە سووتا و مرد.

ئیبن سیرین دەڵێت: هێندەی من بزانم، سەمورە زۆر سپاردەکار و تەواو ڕاستگۆ بوو و ئیسلام و موسڵمانانی خۆشدەویست.[٤]

---

(١) أسد الغابة، ج٢، ص ٥٢٨.

(٢) أسد الغابة، ج٢، ص ٥٢٨.

(٣) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٦٥٣-٦٥٤.

(٤) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٦٥٤.

ذەهەبی دەڵێت: سەمورە لە زانایانی ناو هاوەڵان بوو، کە چوو لە بەصرە نیشتەجێ بوو.[1]

**جا ڕای ئەهلی سوننە خۆی لە دوو خاڵدا دەبینێتەوە:**

**یەکەم:** ئەو ئاگرەی لە فەرموودەکەدا بەرامبەر بە سەمورە باسکراوە، ئەو ئاگرەی دنیا بووە، کە بەهۆیەوە مرد.

**دووەم:** خەواریج زۆر ڕقیان لێی بووەو تانەیان لێداوە.

سەمورە پێش ساڵی شەستی کۆچی وەفاتی کرد،[2] مردنەکەشی بە سووتان بوو، کەوتە ناو مەنجەڵێکی گەورەی ئاوی زۆر گەرمەوەو بەو هۆیەوە مرد، شوێنی مردنەکەشی لە بەصرە بوو.[3]

هۆکارەکەشی ئەوەبوو، کە سەمورە نەخۆشییەکی گرتبوو، بە هیچ شتێ گەرمی نەدەبوویەوە، بۆیە بە ئاگر کردنەوە لە دەوری و، بە ئاوی گەرم لە ژێریدا گەرمیان دەکردەوە![4]

---

(١) سير أعلام النبلاء، ج٣، ص ١٨٣.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ١٧٨.

(٣) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٦٥٤.

(٤) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ٣٤.

# پێرستە وشە

ئـ



ب

## پ



## ت



## ج



## ح



## خ



## د

س



ش



ڕ



ص



ع

## نـاوەڕۆک

# وەڵامێک

# بۆ گومانی سەرهاوەڵان

مەسەلەی گومان وروژاندن سەبارەت بە هاوەڵان، شتێکی نوێ نییە، وەڵامدانەوەی گومانەکانیش، بابەتێک نییە ئەمڕۆ دەستی پێکرابێت، بەڵام کاتێک دەبینین تاو نا تاوێ، تۆمەتگەلێ گەرم دەکرێنەوەو دەهێنرێنەوە مەیدان، پێویست دەکات ئێمەش، وەڵامەکانی دوێنێ و زێدەکاریەکانی ئەمڕۆ بخەینە بەردەست.

مەرجیش نییە هەرچیەك بە دیمەنێکی سلبی هاتە بەرچاو، خێرا ناوی تۆمەتی لێ بنێین، دەکرێت لە بنەڕەتدا وابێت و حاشای لێ نەکرێت، چونکە وەك دواتر باسی دەکەین، هاوەڵان مرۆڤ بوون و قابیلی هەڵە و کەموکورتین، وەك چۆن مەرج نییە، هەرچیەك ئەمڕۆ بە سلبیات و کەموکورتی تەماشا دەکرێت، لە بنەڕەتدا وا بێت، دەکرێت ڕۆژگارێك بێت، ئەوەی ئەمڕۆ بە نەقص تەماشا دەکرێت، ئەوکات نیشانەی بەهێزیی و دروستی بێت.





نووسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com